زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
کتێبی سەردەم ژمارە (210)

سەرپەرشتیاری گشتی
ئازاد بەرزنجی

# چـــــاوەکــــانی

نووسینی: بوزورگ عەلەوی
وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی
بابەت: ڕۆمان
دەرهێنانی هونەری: شیروان تۆفیق
مۆنتاژی کۆمپیوتەری : سەیران عەبدولڕەحمان
تیراژ: 500 دانە
ژمارەی سپاردن : 551 ی 2002
www.sardam.net

## بوزورگ و ( چاوەکانی )

بوزورگی عەلەوی یەکێکە لە پێشڕەوانی هونەری چیرۆك لە ئێران و کاتێك باس لە چیرۆکی ئێرانی دەکرێ بوزورگ دەبێتە ڕوویەك لە ڕووە گەشەکانی ئەو هونەرە لە ئێراندا.

بوزورگ ساڵی 1904ز هاتۆتە دنیاوە، کاتێ گەورە دەبێت حاجی سەید ئەبولحەسەنی باوکی بۆ ئاڵمانی دەنێرێت و لەوێ خوێندن تەواو دەکات و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ئێران و خەریکی مامۆستایی و کاری نووسین دەبێت.

ساڵی 1928 لەگەڵ صادق هیدایەتدا دەبنە ئاشنا و پاشانیش شیراز زادە پەرتو دەناسن و پێکەوە خەریکی پرۆژەیەکی ئەدەبی دەبن کە تیایدا بەرگری لە پاراستنی ڕەسەنایەتیی کەلتووری ئێرانی دەکەن. دواتر د. ئارانی دەناسێت؛ کە یەکێك دەبێت لە ڕۆشنبیرانی ناسراوی ئەو دەمە و لە ساڵی "1925-1927"دا دکتۆرا لە فەلسەفە و کیمیادا وەردەگرێت لە زانکۆی بەرلین و ئینجا دەبێتەوە بە مامۆستای "منطق" لە هەمان زانکۆدا و چەندەها کتێبی زانستی و ئەدەبی دەنووسێت. پاشان بە ڕابەرایەتیی د. ئارانی "گروهی پەنجاوسێکەس" پێکدێت کە ئامانجیان پەرەدان بە باری ڕۆشنبیری و خەباتکردن لە پێناوی ئازادیدا دەبێت، تا لە ساڵی 1937 دا هەر پەنجا و سێیان دەگیرێن و زیندانی دەکرێن.

عەلەوی لە ماوەی زیندانی کردنیشیدا هەر سەرگەرمی نووسین دەبێت و خۆی بە دەست نائومێدییەوە نادات.

ساڵی 1941؛ کاتێك ڕژێمی دیکتاتۆری دووچاری پاشاگەردانی دەبێت، ئەندامەکانی ئەو گروهە ئازاد دەکرێن.

ساڵی 1946 بەشداری لە پێکهێانی یەکەم کۆنگرەی نووسەرانی ئێراندا دەکات، پاشان ساڵانی دواتری لە ئەوروپا بەسەر دەبات و هەندێ کاری ئەدەبی و ڕۆشنبیریی ئێران بۆ ئاڵمانی وەردەگێڕێت و ماوەیەکیش لە زانکۆ وانە دەڵێتەوە.

شایانی باسە بوزورگ لە سەرەتاکانی نووسیندا دەکەوێتە ژێر کاریگەریی هێرمان هێسە و چیخۆڤ و شیللەر و دۆستۆیڤسکییەوە، هەر بۆیە هەندێ لە کارەکانی ئەو نووسەرانەش بۆ فارسی وەردەگێڕێت، لەوانە "خاتوونەکەی ئۆرلیان"ی شیللەر و "باخی گێلاس"ی چیخۆف.

زۆربەی ڕەخنەنووسان ڕۆمانی "چاوەکانی" بە سەرکەوتووترین کاری عەلەوی لە قەڵەم دەدەن، بوزورگ لە میانی تابلۆیەکەوە کە بریتییە لە دەموچاوی ئافرەتێك، بەڵام تەنها چاوەکانی بە ڕوونی دەبینرێن و بەشەکانی تری ئەو دەموچاوە لە تاریکیدا ونن، ئەو چاوانەی کە دەبنە خاڵی دەرچوونی ڕووداوەکان، ئەو چاوانەی کە لە نهێنییاندا لە زەردەخەنەکەی "مۆنالیزا"ی داڤنشی دەچن، لە میانی ئەو تابلۆیەوە و گەڕان بە دوا نهێنییەکانی ئەو چاوانەدا، واقیعی تاڵی ئێران و خەڵکانی ئێرانمان لە ڕۆژگاری حوکمڕانیی "ڕەزاشا"دا بۆ دەخاتە ڕوو، بەڵام لە بەرگی کەشێکی شاعیرانە و زمانێکی شیعرئامێزی ڕەوانەوە، نووسەر دێت و لەسەر بنچینەی دوو هێڵی ململانێی سەرەکی، بازنەیەك لە پەیوەندیی بەیەکداچوو لە نێوان کاراکتەرەکاندا دەخولقێنێت، هێڵی یەکەم: خەبات و تێکۆشانی هونەرمەندی نیگارکێش "ماکان"ە بەرامبەر ڕژێمی "شاهەنشاهی"ی ستەمکار، هێڵی دووەمیش: خۆشەویستیی "فەرەنگیس"ە بۆ ماکان. لە یەکانگیربوونی ئەم دوو هێڵەشدا کۆمەڵێك لقە ململانێ و کاراکتەری دی دێنە گۆڕەپانی ڕووداوەکانەوە.

هەندێ لە ڕەخنەنووسان وتوویانە کە ڕۆماننووس لە وێنەکێشانی هەندێ لە کاراکتەرەکانی ئەم ڕۆمانەدا سوودی لە چەند کەسێتییەکی ناودار بینیوە کە لە واقیعدا هەبوون، بە تایبەتیش کاراکتەری "ماکان" کە دەڵێن لە وێنەکێشانی ئەو کاراکتەرەدا سوودی لە کەسێتیی نیگارکێشی ئێرانیی مەزن "کەمال ئەلمولْك" و سیاسەتمەداری تێکۆشەر "د. ئارانی" بینیوە.

عەلەوی لەم ڕۆمانەدا توانیویەتی بە خەیاڵی داهێنەرانەی دونیایەکی دەوڵەمەند بە حاڵەتی ئینسانی و کێشمەکێشی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی بەرجەستە بکات.

لێرەدا نامانەوێ باس لە ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانە بکەین، تا لە چێژی خوێندنەوەکەی کەم ناکاتەوە، بەڵام بۆچوونێکی عەلەوی خۆی سەبارەت بە کارەکانی خۆی و "چاوەکانی" بۆ خوێنەری ئازیز دەخەینە ڕوو کە دەڵێت:

"من هیچ یەکێك لە کارەکانی خۆم پەسەند ناکەم، هەریەك لەم کارانەم لە کەموکووڕی خاڵی نین و خولقێنەرەکەیان لە کەسانی دی باشتر دەرك بەو کەموکووڕییانە دەکات، دڵنیام ئەگەر پاڵەوانەکانی چیرۆکەکانم زمانیان هەبووایە ڕەخنەی گەورەیان لێ دەگرتم، هەقیشیانە و گەر نووسینەکانم بڵاونەبوونایەتەوە، ئەمڕۆ بێبەزەییانە بە قەڵەمی سوور دەکەوتمە وێزەیان و سەر و دەستیانم دەشکاند، بەڵام تازە درەنگە. نووسینەکانم تۆڵە لە نووسەرەکەیان دەکەنەوە، تازە بوون بە مۆر بە ناوچاوانمەوە و من نووسەریانم.

بە شێوەیەکی گشتی؛ "چاوەکانی" لە کارەکانی ترم لا پەسەندترە، وێڕای هەندێ کەموکووڕی کە لە سەروسیمای فەرەنگیس و ماکاندا بەدی دەکرێن؛ من ئێستاش عاشقی جوانییەکانی ئەو ئافرەتەم و ڕێز لە سەرسەختی و خۆڕاگرتنەکەی مامۆستا دەگرم، بە ڕای من دارەڕاو پلۆتی چیرۆکەکە پتەوە.

ئەم ڕۆمانە چ لە ئێران و چ لە ئەورووپا؛ چەند جار لە سەری نووسراوە و، زۆربەی ڕەخنەنووسان بە چاوپۆشییەوە تێیانڕوانیوە و کەمتر ڕەخنەیان لە لایەنە

سەرەکییەکانی ڕۆمانەکە گرتووە، پێشوازیکردنی خوێنەرانیش لەم ڕۆمانە ئەو بۆچوونەی من دەسەلمێنێت.

ئەم ڕۆمانە لە ماوەی دە ساڵدا چوار جار لە ئێراندا چاپ کراوەتەوە و لە ئەورووپاش تا ساڵی "1960" تیراژی گەیشتە سەد هەزار دانە.

من ویستوومە لە "چاوەکانی"دا خاسیەتێکی نەژادی خۆمان بخەمە ڕوو کە دەرئەنجامی باری جوگرافیایی و ڕامیاری و ئابووریی ئێرانە، هەروەها ویستوومە تەقەلای بێوچانی خەڵکانی وڵاتەکەمان لە پێناوی بەرکەماڵی و جوانی و تێکۆشان دژ بە ستەمدا پیشان بدەم، من ئەوەم ویستووە"*.

ئەم ڕۆمانە ساڵی "1959" لە لایەن "هیربرت ملزیگ"ەوە کراوە بە ئاڵمانی.

شایانی باسە چیرۆکنووسی گەورە "عەلەوی" لە "6ی شوباتی 1997"دا دڵی لە لێدان کەوت و ماڵئاوایی یەکجاریی کرد.

**لە بەرهەمەکانی تری نووسەر:**

* جانتا- ساڵی 1934.
* پارچە کاغەزەکانی بەندیخانە- 1941.
* پەنجا و سێ کەس - 1942.
* نامەکان- 1951.
* میرزا- 1953.
* پیاوە گەورەکان- 1978.
* ڕۆمانی چاوەکانی لە ساڵی "1952ز"دا نووسراوە.

-وەرگێڕ-

*"نقد آثار بزرگ علوی، نوشته: عبدالعلی دستغیب- چاپ اول- تهران- 1358.

ئەڵێن ( سەعدی ) هێندە لەمەڕ عیشقی مەدوێ
ئەدوێم و پاش منیش بۆ ڕۆژگارانی ئەڵێنـەوە

–سەعدی–

شاری تاران تاسابوو، کەس هەناسەی دەرنەئەهات، هەموو لە یەکتر دەترسان، خێزانەکان لە کەسەکانیان، منالاّن لە مامۆستایان، مامۆستاکان لە فەڕاشەکان و، فەڕاشەکان لە سەرتاش و ناترەکان، هەموو لە خۆیان دەترسان، سلّیان لە سێبەری خۆیان دەکردەوە. لە هەموو شوێنێك، لە مالّەوە، لە دائیرە، لە مزگەوت، لە پشتی تەرازووەکانەوە، لە قوتابخانە و زانکۆ و، لە گەرماوەکاندا، وایاندەزانی پیاوانی ئاسایش بە دوایانەوەن. لە سینەمادا، وەختێ سروودی شاهەنشاهی لێ دەدرا، هەموو سەیری دەوروپشتی خۆیان دەکرد، نەبادا شێتێك یان گیانفیدایەك هەلّنەسێتە سەرپێ و ببێتە مایەی دەردەسەری بۆیان. بێدەنگییەکی مەرگئاسا سەرتاسەری ولاّتی تەنیبۆوە. هەموو خۆیان وا پیشان دەدا بەو بارە قایلن. ڕۆژنامەکان جگە لە ستایشی دیکتاتۆر شتێکی تریان نەبوو بینووسن! خەلّکی تینووی هەوالّ بوون و بە دزییەوە درۆی شاخداریان بلاّودەکردەوە. کێ دەیوێرا بە ئاشکرا بلّێت فلاّنە شت خراپە، ئەقلّ دەیبڕێ لە ولاّتی شاهەنشاهیدا شتێکی خراپ هەبێت؟!

خەم و بێزاری و بەدگومانی و نائومێدی لە بازاڕ و شەقامەکاندا بە ئاشکرا بە ڕووی خەلّکییەوە دەبینرا، خەلّکی سلّیان دەکردەوە لە شەقامەکاندا تەماشای ئەملاو ئەولای خۆیان بکەن، نەبادا ببنە جێی گومان.

هەتاوێکی سووتێنەری وا لە شەقامەکانی شاری تارانی دەدا، کە مرۆڤ بەرگەی نەدەگرت.

کەس نازانێت کێ بە شارەوانیی وتبوو کە شەقامەکانی فەرەنگ بێ درەختن، بۆیە بە تەور و مشارەوە کەوتنە برینەوەی درەختە کۆنەکان، کۆڵانە تەنگەبەرەکانیان تێکدەدا، خانووبەرە و کۆڵانەکانیان دەڕماند و نەخشەکانیان دەگۆڕی، خەڵکیان سەرگەردان دەکرد و ساڵانێکی زۆری دەخایاند تا لەو دەشتە کاکیبەکاکییەدا خانوویەکی دی بینا دەکرایەوە. ئەوەی بیناش دەکرایەوە بێ ئەرزش بوو، لە سەرتاسەری وڵاتدا بەندیخانەیان دروست دەکرد و هێشتا بەشی زیندانیانی نەدەکرد. لە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا، لە باکوور و باشووردا، پیرەمێرد و منداڵی دە ساڵان، مەلا و عەوام، بەقاڵ و توونچیی حەمام و ئاوگێریان فڕێ دەدایە بەندیخانەوە، بەو تاوانەی کە خەویان بینیوە و لە خەویاندا هیوایان بە ڕووخانی ڕژێمی دیکتاتۆری خواستووە. هەم قوتابیان دەگرت و هەم وەزیر و نوێنەر، یەکێك بەو تاوانەی کە لە سەرتاشخانەیەکدا باسی کاریکاتێرێکی کردووە کە لە ڕۆژنامەیەکی فەرەنساییدا دەربارەی شا بڵاوبۆتەوە و، یەکێکی تر بەو تاوانەی گوایە کاتێك هاتوچۆی فەرەنگستانی کردووە سەروکاری لەگەڵ نوێنەرانی دەوڵەتێکی بیانیدا هەبووە. یەکێکی تریش بەو تاوانەی گوایە بەشێك لەو نەوتەی باشووری بە دزیی دەوڵەتەوە بە سەرمایەدارانی ئینگلیز فرۆشتۆتەوە.

لە بارودۆخێکی واداو، لە ساڵی 1938دا، مامۆستا ماکان کۆچی دوایی کرد. مامۆستا لەو سەد ساڵەی دواییدا گەورەترین نیگارکێشی ئێران بوو، پاش چەند سەدە بێدەنگی، سەرلەنوێ کارەکانی ئەم نیگارکێشە ئێرانییە لە ئەوروپادا کڕیاری خۆی پەیدا کردبووەوە و گۆڤارە هونەرییەکانی ئەوروپا و ئەمریکا تابلۆکانیان چاپ دەکردەوە.

ژمارەیەکی کەم لەو کەسانەی کە ڕۆژانێك بوو بە هەلهەلەوە لە قوتابخانە و کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا پێشوازییان لێ دەکرد، دەیانوێرا خۆشەویستیی خۆیان بۆ

مامۆستا دەربڕن. کەسانێکیش هەبوون کە دەیانزانی مامۆستا ماکان یەکێك بوو لەو ئینسانە کەمانەی کە ئازایەتیی نیشان داو لە ئاست ڕژێمی دیکتاتۆریدا کۆڵی نەدا. ئەمانە بە دزییەوە چەندان شتی سەیریان دەربارەی ئەو دەگێڕایەوە.

دەیانوت: "لە نەداری نەترسا، حەزی بە هیچ نەدەکرد، جگە لە نیگارکێشان بە هیچ شتێکی ترەوە پابەند نەبوو، گوشاری دەزگای پۆلیسی دیکتاتۆری پشتی پێ نەچەماندەوە. هەرەشە لە ئاستیدا کاریگەر نەبوو، کاتێ مووچەکەشیان بڕی، هیچ دەربەست نەبوو، لە تاران دووریان خستەوە و لەسەر هەڵوێستی خۆی سوور بوو و، لە غوربەتدا، دوور لە کەس و هاوڕێکانی سەری نایەوە".

خەڵکە سادەکە دەیانوت خۆشەویستیی ئافرەتێك بەو چارەنووسەی گەیاند. ڕووناکبیرانیش باوەڕیان وابوو کە عیشقی ژیان ئەوی دایە دەست مەرگ.

ئەو ڕۆژەی هەواڵی مردنەکەی لە تاراندا بڵاوبۆوە، دۆست و کەسە نزیکەکانی بە چرپە لەگەڵ یەکدا دەدوان و دەیانوت: "وا یەکێکی تریش بە سەکتە قەلبی سەری نایەوە" چونکە ئەو قوربانییانەی میری کە لە بەندیخانە و تاراوگەکاندا گیانیان دەسپارد، ڕۆژنامەکان وایان لە قەڵەم دەدا کە بەو دەردە مردوون.

دەشێ بە هۆی یەکێك لە دۆستەکانیەوە بووبێت کە لەناو ڕژێمدا پلەوپایەیەکی هەبووە، یان ڕەنگە هەر کاری دەوڵەت خۆی بووبێت کە لە پایەی مامۆستا لە نێوان ڕۆشنبیراندا ئاگادار بوو، بە مەبەستی داپۆشینی ئەو تاوانەی کە ڕوویداوە، ڕێزیان لەو ناو، وتوویانە وا یەکێك لە دوژمنە سەرسەختەکانی ستەمکاری تیاچوو، باشتر وایە تا دەکرێ سوودێکی باشیش لە مردنەکەی ببینرێ، بە تایبەتیش پاش بڵاوبوونەوەی دەنگ و باسی هەڵاتنی سەرۆکی ئاسایش لە جیهاندا، با وا نەزانرێ کە مامۆستایان لە ئێراندا کوشتووە. هەرچۆنێك بوو لە مزگەوتی سوپا سالاردا پرسەیەکیان بۆ گرت، تەرمەکەشیان بە ڕێوڕەسمێکی شایستەوە بۆ تاران هێنا و لە "حەزرەتی عەبدولعەزیم" بە خاکیان سپارد. پاشان لە ئامادەیی ئەمیر کەبیر کۆڕێکی وتارخوێندنەوەیان ساز کرد و لە

هۆڵی پەیمانگای مامۆستایاندا پێشانگەیەکیان بۆ کارە هونەرییەکانی کردەوە و لەم ڕێگەیەوە دەوڵەت ویستی وا لە خەڵکی بگەیەنێت کە بایەخ بە هونەر دەدات.

بەڵام خەڵکی فریویان نەدەخوارد، ئەوان ساختومانە شکۆدارەکەی زانکۆشیان بە زیانی سەربەخۆیی وڵات و سوودی ئینگلیزەکـان لـە قەڵـەم ئـەدا، چونکـە بـە فەرمانی دیکتاتۆر هاتبووە ئاراوە، جا هەیدێ مەرگی مامۆستای نیگارکێش و لە غەریبایەتیشـدا. دروسـتکردنی بۆنـەی ماتەمینەکەشـی بـەو خـۆ تـەیارکردن و ڕێزلێنانە درۆزنانەوە، چۆن بە شتێکی ئاسایی وەربگرن.

ئەوەی لە تارانی تاسێنراوی ئەو ڕۆژەدا دەسەڵاتدار و کوێخا بوون، هەر لـە نـایب و وەزیـر و سـەرتیپ و سەرلەشـکرەوە تـا جارچییـەکان، ڕۆژی کردنـەوەی پێشانگەکە هاتن و تابلۆکانیـان بینـی و پیایاندا هەڵیاندا و ڕۆیشـتن. قـەرار بـوو پێشـانگەکە مـانگێك بـەردەوام بێـت، ڕۆژانـی سـەرەتا تەنـها قوتـابی و هـاوڕێ و هەوادارانی بۆ پێشانگەکە دەچوون و ماوەیەك بەرامبەر تابلۆکان و، بە تایبـەتیش لـە بـەردەم دوا تـابلۆیدا کـە لـە "کەڵات"ەوە بـۆ تارانیـان هێنـابوو، دەوەسـتان و لـە ئاست بەرزیی هونەری و، توانای بەرجەستەکردنی و هێزی خستنەڕووی هەست و سۆزە ئینسانییەکاندا لە ڕێی ڕەنگ و هێڵەوە، سەری ڕێزیان دادەنەواند.

وەزارەتـی ڕۆشـنبیری لـە پێنـاوی پاراسـتنی ئـابڕوو و پایـەی دەسـەڵاتداراندا، پاشنیوەڕوان دەسـتە دەسـتە قوتابیـانی قوتابخانـەکانی بـۆ پێشـانگەکە دەنـارد. بەڵام لە هەفتەی دووەمەوە بینینی کارەکانی مامۆستا لایـەنێکی گشـتی و میلليـی بەخۆوە گـرت. پـێڕ پـێڕ خـەڵکی دەڕۆیشـتن تـا تەماشـای خۆیـان بکـەن، لـە تـابلۆ جوانەکانی ئەودا وێنەی خۆیان دەبینییەوە و بە تایبەتیش بەرامبـەر تابلۆیـەك کـە مامۆستا بـە خـەتی خـۆی لـە ژێریدا نووسیبووی "چاوەکانی" دەوەسـتان و لێـی ورد دەبوونـەوە. لەگـەڵ یـەکدا دەکەوتنـە گفتوگـۆ و هـەوڵیان دەدا پـەی بـە نـهێنیی ئەو چاوانە بەرن کە هەموو شتێکیان دەوت و لە هەمان کاتدا ئارامانە دەیانڕوانی، کاتـێ خـەڵکی لـە خۆیـان دەپرسـی کـە ئـەم چاوانـە چ نهێنییـەکیان لـەنێو خۆیـاندا حەشار داوە و تەعبیر لە چی دەکەن؟، ئیدی هەریەکە چیی لێ هـەڵدەکڕان دەیـوت،

بەلاّم تێڕوانینـەكان جیاواز بوون و لەبەرئەوە مشـتومڕ و گفتوگـۆ هـەر بـەردەوام دەبوو.

لە كۆتاییەكانى هەفتەى دووەمدا حەشاماتى بینەران بە جۆرێك  وروژێنـەر بـوو كە دەوڵەت و دەزگاى ئاسایش تەماشاكردنى تابلۆكانیان بە جۆرە "تەعبیركردنێك لە نارەزایى خەڵك بەرامبەر بە میرى" لە قەڵەم دا و لە ڕۆژانى یەكەمى هەفتەى سێیەمدا پێشانگەكەیان داخست.

تابلۆى "چاوەكانى" بریتى بوو لە دەموچاوى سادەى ئافرەتێك، دەموچاوێكى درێژى ئافرەتێك كە زوڵفەكانى وەكو قیرى تـواوە بەسـەر شـانەكانیدا هاتبوونـە خوار. هەموو شتەكانى ئەم  دەموچاوە نائاشكرا بوون. لووت و دەم و ڕوومەت و نێوچەوانى بە ڕەنگێكى تاریك كێشرابوون، لەوە دەچوو نیگاركێشەكە  ویستبێتى بڵێت كە خاوەنى ئەم دەموچاوە لە دونیاى دەرەوەدا نەماوە و تەنها چاوەكانى ئاسەواریان لە یادى ئەمدا  جێهێشتووە. چاوەكانى بە دڵڕفێنییەكى سەیرەوە لە مرۆڤ ورد دەبوونەوە. سەرساميیان پێوە نەدەبینرا. بەلاّم  ئەو پەردانەى دەدڕاند كە لە نێوان خاوەنى چاوەكانى و بینەردا هەبوون و، وەكو تیرێك دڵى مرۆڤیـان دەپێكـا. ئایـا دەبـێ پـاش سـاتێكى دى ئەشـك لـەم چاوانـەوە بـڕژێ؟ یـان زەردەخەنەیەكى تاڵ لەخۆ بگرن؟ بەلاّم  بە لێوەكانەوە هەست بە خەندە نەدەكرا! ئایا  چاوەكان بۆیە  باریك و درێژن تا بخەنن و ژیان لاى بینەر شیرین بكەن، یان كسپە لە دڵێكى شەكەت هەڵبسێنن؟ ئایا  ئەمە چاوانى ئافرەتێكى لە خواترس و دەست لـە دنیـا هـەڵگرتووە، یـان ئـافرەتێكى بـەدوا لـەزەتدا وێـڵ؟ یـان هـەموو شتێكیان لەنێو خۆیاندا حەشارداوە؟ ئایا دەیانەوێت نێچیرێك  بخەنە داوەوە؟ یان دەپاڕانەوە؟ ئایـا ڕاسـتگۆ بـوون یـان ئازاربـەخش و بێئـابڕوو؟ بێگـەرد بـوون یـا نەگریس؟ ئایا بێ باكییان  پێوە دەبینرا؟ یان هانا بردن؟ گەر هانا دەبەن چییان دەوێت؟ ئەم نیگایە، ئەم چاوە نیوە خومار و نیوە مەستانە چییان نەدەوت!!

هەموو شتەکانی ئەم دەموچاوە ئاسایی بوون: ناوچەوانێکی بڵند، لووتێکی درێژی قەڵەمی، چەناگەیەکی باریك، دوو گۆنـای بـەرز، زوڵفـی ئاوریشـمی، دوو لێوی باریك و تەنك ئەمانە تێکڕا شتێکی ئەوتۆیان لای بینەر جێ نەدەهێشت.

دەموچاوەکە هی ئافرەتێکی گەلێ جوان بوو، بەلاّم ئەو شتەی بینـەری سەرسام دەکرد، جوانیی دەموچاوەکە نـەبوو، بـەڵکو نهێنییـەکانی نێـو چاوەکـان خۆیـان بوون. چاوەکان نەرم و کەمێك لار بوون، هەندێ جار کە لێیـان ورد دەبوویتـەوە، فرمێسك لـە چاوت دەهاتـە خـوار، هـەندێ جاری تریش بە پێچەوانـەوە، خـەیاڵی بینـەر ئافرەتێکی دەهێنایـە بەرچاو کە دەیەوێت بەو نیگایە نیگارکێشـەکە ئـازار بدات، ئەو دەمـە مرۆڤ ڕقی هەڵدەستا، ئەمـە لـە کاتێکدا هاوڕێیـان و دۆسـتانی مامۆسـتا لـەو بـاوەڕەدا بـوون کـە هیـچ کـاتێك ئـافرەت لـە ژیـانی مامۆسـتادا کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبووە.

پێدەچێت ئافرەتێك ماوەیەك وەکو مۆدێل لای دانیشتبێت، بەلاّم نە وێنەیـەکی ئەو ئافرەتە چنگ دەکەوێت و نە لە کارەکانی مامۆستاشدا بەڵگەیـەکی سـەلمێنەر بۆ ئەوە بەرچاودەکەوێ.

وەختێ ئەویان لە تاران دوورخستەوە، ژنی نەهێنابوو، کەسیش شك نابات کە ئافرەتێك لە ژیانیدا هەبووبێت و ئاسەواری جێهێشتبێت. سـێ سالْ و شتێکی لـە "کەلاّت"دا بەسەر برد و لەوێش گیانی سپارد، لە دوو ڕۆژی سەرەتادا ڕۆژنامەکان هیچ بایەخێکیان بەم مەسەلەیە نەدا، تەنها ڕۆژنامەی ڕەسمیی دەوڵەت نەبێ کە بە دوو دێڕ ئاماژەی بۆ مەرگی مامۆستا کرد. بەلاّم ناکاو هەموو دەستیان بـە ڕشـتنی فرمێسـکی تیمسـاحی کـرد و، دەربـارەی ئـاوابوونی ئەسـتێرەیەکی پرشـنگدار لـە ئاسـۆی هونـەری ئێراندا دوان. ئەوانـەی مامۆسـتایان دەناسـی، دەیـانوت: گریمـان ڕووداوێکـی گرنـگ لـە ژیـانیدا ڕوویـداوە و بووەتـە هـۆی دوورخسـتنەوە و پاشـان مەرگی لە "کەلاّت". بەلاّم مامۆستا، ئەم پیـاوە بێدەنگـە کـە قسـەکانی لـە دوو سـێ وشـە تـێ نەدەپـەڕی و تـا پرسیاریان لێ نەکردایـە، وەلاّمـی نەدەدایـەوە و، ئـەویش

یان بە "بەڵێ" یان "نەخێر"؛ کابرایەك نەبوو نهێنییەکانی دەروونی لای کەس بدرکێنێت، هەیدیٚ لای ئافرەتێکی لاو کە خاوەنی ئەم چاوانە بووبێت؟

شتێك هەبوو بەڵگەنەویست بوو، مامۆستا سرِ قایم و نهێنی پۆش بوو، کەیفی بە رژێمی دیکتاتۆری نەدەهات، چونکە لە کاتێکدا شاعیرانی رۆژگار هەر رۆژە و قەسیدەیەکیان لەستایشی شادا دەوت و کاسەیان دەلێسایەوە، کەس شك نابات مامۆستا وێنەیەکی شای کێشابێت.

ئەوانەی مامۆستایان خۆشدەویست لە خۆیان دەپرسی: "بۆچی ئەم تابلۆیەی ناوناوە "چاوەکانی"؟ دەکرا ناوی بنێت "چاوەکان" بەڵام "چاوەکانی" واتە چاوەکانی ئافرەتێك کە مامۆستا بیری لیٚ کردووەتەوە، کەواتە ئەوەی مەبەست بووە خاوەنی چاوەکانی بووە نەك چاوەکان خۆیان". لەژێر تابلۆکەدا، لەسەر چوارچێوەی وێنەکە، مامۆستا بە خەتی خۆی نووسیبووی: "چاوەکانی"، واتە چاوەکانی ئافرەتێك کە ئەوی بەختەوەر کردووە یان بە رۆژی رەشی گەیاندووە. چاوانی ئافرەتێك کە هەرچۆنێك بێت کاریگەرییەکی دیاری لەسەر ژیانی مامۆستا هەبووە و ئەم نیگارکێشەی وا بزواندووە، کە تەنانەت لە غوربەتیشدا، لە کاتێکدا کە بەرگەی ستەمی ستەمکارانی نامەردی گرتووە، بیر لەو ئافرەتە بکاتەوە کە خاوەنی چاوەکانە و، وێنەیەکی گەرچی خەیاڵیش بێت بکێشێت. گومان لەوەدا نییە کە ئەم وێنەیە خەیاڵییە، چونکە کەس شك نابات مامۆستا لە ژیانی ئاساییدا پەیوەندیی لەگەڵ ئافرەتێکدا هەبووبێت کە دەموچاوی لە دەموچاوی تابلۆکە بچێت. رەنگە بشگوتریٚ کە ئەگەر ئەم ئافرەتە رۆڵێکی ئەوتۆی لە ژیانی تایبەتیی مامۆستادا نەبووبێت، بە لایەنی کەمەوە لە ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەودا، کە بە دوور خستنەوەی بۆ "کەلات" و پاشانیش بە مردنی کۆتایی هات، رۆڵێکی کاریگەری هەبووە.

سووسەکەران گەلیٚ گەڕان تا خاوەنی ئەم دەموچاوە بدۆزنەوە، چاویان بە هەموو ئەوانەدا گێڕا کە کاتی خۆی لە دەوروپشتی مامۆستا بوون، بەڵام هیچ لێکچوونێکیان لە نێوان وێنەکە و لە نێوان ئافرەتە هاوریٚ و قوتابییەکانیدا

نەدۆزییەوە. کچی چەند ماڵە دەوڵەمەندێکی تاران هەبوون کە دەیانویست لای ماکان فێری نیگارکێشان بن. مامۆستا بۆ ماڵیان دەچوو، بەڵام ئەم کچانە هەموو منالْ بوون و هیچیشیان نەدەچوونەوە سەر وێنەکە، جگە لەوە هیچ یەکێك لەمانە لەو ئاستەدا نەبوو کە بتوانێت ڕەوتی ژیانی ئاسایی پیاوێکی بە ئیرادەی وەکو مامۆستا تێکبدات و تا ئەو ڕادەیەی کە لە کەلات و لەژێر چاودێریی پۆلیسدا و، سەرباری هەموو کەموکوڕییەکانی لە ئامرازەکانی کاری هونەریدا، بیر لە کێشانی وێنەی ئەو بکاتەوە. بەڵام ئەو ئافرەتەی کە وەکو مۆدێل لای دانیشتووە، تەواو نەناسە، کەس ئەوی نەبینیوە، لە هیچ کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا لەگەڵ مامۆستادا نەبینراوە. تاقە کەسێك کە لە بوونی ئەم ئافرەتە تەواو ئاگادارە، ئاغا ڕەجەب، نۆکەری نیگارکێشەکەیە و ئەویش لەم بارەیەوە هیچی لەیاد نییە و، خۆ ئەگەر شتێکیش بزانێت ئەوا هیچ ناڵێت و یان نایەوێت بیڵێت. جگە لەوە، ئاغا ڕەجەب دەڵێت کە هیچ جۆرە لێکچوونێك لە نێوان چاوەکانی وێنەکە و دەموچاوی ئەو ئافرەتە نەناسەدا نابینێتەوە.

دەبێ مەبەستی لە وێنەکێشانی ئەم دەموچاوە چی بووبێت؟ ئایا مەبەستی ئەوە بووە کە لە غوربەتدا و پاش مەرگی، دیارییەك بۆ خۆشەویستەکەی بنێرێت و، لەم ڕێیەوە وەفاداری و خۆشەویستی خۆی بسەلمێنێت؟ یان ویستوویەتی بەو ئافرەتە کە بە چاوەکانی ئەوی گرفتار کردبوو، بڵێت کە من تۆم بە جۆرێك ناسیوە، کە خۆشت نەتتوانیوە ئاوەها خۆت بناسیت و، من دەزانم تۆ بوویتە هۆی ئەوەی من ئەمڕۆ ئازار بچێژم. ڕەنگە بشیەوێت بڵێت: "ئەی چاوەکان، گەر ئێستا خاوەنەکەتان لەگەڵمدا دەبوو، تینێکی تر دەهاتەوە گیانم و کامەران دەبووم".

بەڵام ئایا مامۆستا چی تێگەیشتبوو؟. چۆن ئەم ئافرەتەی ناسیبوو؟ لەم نیگایە، لەم سەروسیما بێحاڵە چی هەڵدەهێنجرا؟

ئەمانە هەمووی خەیاڵاتن، ئینسان تا تێنەگات کە لەم نیگا و حاڵەتە تایبەتییەی ئەو چاوانە چی هەڵدەهێنجرێ، چۆن دەتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە؟

پـتر لـە دە سـاڵ بەسـەر مـەرگی مامۆسـتادا تێدەپـەڕێت. ڕژێمـی دیکتـاتۆری سەرنگووم بووە، ئەوانەی دژ بە ستەم بوون ئیمڕۆ جێی ڕێزی خەڵکن! هێشـتا چیرۆکی چاوەکانی ئەم تابلۆیە لەیاد نەچووەتەوە! ئەمڕۆ ئافرەتێك نییە لە چینـی خانەدانەکان، بە تایبەتیش ئەوانەی کە بە جۆرێك لە جـۆران لەگـەڵ یـەکێك لـە هاوڕێیان و دۆستان و قوتابیانی مامۆستادا پەیوەندییەکی بچووکیان هەبووە، کە خۆی بە خاوەنی ئەو چاوانە لە قەڵەم نەدات. هەموو خۆیان بە دڵبەری مامۆستا لە قەڵەم ئەدەن و هەر کەسە و بەپێی ئاکار و ڕەوشتی کۆمەڵایەتیی خۆی، وا باس دەکات کە لەگەڵ ئەودا سەروکاری هەبووە.

خـانم شـکۆهـ ئەلسـەڵتەنە کـە ئـەمڕۆ هاوسـەری یەکێکـە لـە سـەرتیپەکانی ژاندارمیری و بەو دواییە هەواڵی تەڵاقەکەی بە پێنج مناڵەوە دەنگی دایەوە، لە ساڵانی بەر لە دوورخستنەوەی مامۆستادا تەمەنی لە 17 یان 18 ساڵ تێنەپەڕیوە. لە یەکێك لە تابلۆکاندا دەموچاوی ئافرەتێك دەبینرێ کە تا ڕادەیەك دەشوبهێتە سـەر دەموچـاوی خـانم شـکۆهـ لـە تەمـەنی 17 یـان 18 سـاڵانیدا، مامۆسـتا ئـەم چوارینەیەی خەییامی لە تابلۆکەدا وێنە کێشاوە:

"ئەم گەردوونە بۆ لەنـاوبردنی من و تۆ
مەبەستێکی هەیە بە گیانی پاکی من و تۆ
لەسەر ئەم چیمەنە دانیشە ساقیا، زووکە
تا چیمەن بڕوێ.. لە خاکـی من و تـۆ!"

مامۆستا چیمەنەکە و لق و پۆپی درەختەکان و بەرد و چیلکە و چەواڵەکانی لە شێوەی دەموچاوی مرۆڤدا پیشاندابوو، یەکێك لەم دەموچاوانەش تا ڕادەیەکی کەم دەشوبهایە سەر وێنەیەکی خانم شکۆهـ ئەلسەڵتەنە کە لـە تەمـەنی 17 و 18 سـاڵیدا گرتوویـەتی. خـانم شـکۆهـ ئەمـەی کردبـووە نیشـانەی خۆشەویسـتیی مامۆستا بۆی و بەڵگەی زیاتریشی ئەوە بوو گوایە وەختێك ئەڵقەی دەزگیرانێتیی لە پەنجەدا بینیوە لە داخـاندا تونـد دەسـتی گوشـیوە، بـە ڕادەیـەك کـە ئـازاری پێگەیشتووە.

خـانم شـکۆه ئەلسـەڵتەنە ژیـانێکی پـڕ واتـەواتی هـەبووە و ڕۆژنامـە ئابڕووبەرەکان کە دەمێك لـە لایـەنگرانی مێردەکـەی بوون و دەمێکـی تریـش دژی، بێشەرمانە ئەم چیرۆکـەیان خستۆتە ڕوو. بەڵام وێـڕای ئەمـەش ژیانی مامۆستا و هەڵسوکەوتی لەگەڵ توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵدا بە جۆرێك بووە کە تەنانەت خانم شکۆه ئەلسەڵتەنەیش نەیتوانیوە شتێکی زیاتر دەربارەی مامۆستا بڵێت.

ساڵانی دوای خەرمانانی 1941 بڵاوکردنەوەی سەرگوزەشتەی خۆشەویستی لە ژیانی مامۆستادا لە ڕۆژنامـەکاندا شتێکی بەبرەو بوو. ڕۆژنامەنووسان ڕووداوی سەیروسـەمەرەیان لـە هەگبـەی پـڕ درۆی خۆیـاندا دەردەهێنـا، بـە تایبـەتی بەسەرهاتی هەڵاتنەکەی سەرتیپ ئارامی سەرۆکی ئاسایش. ڕۆژنامە نووسـەکان بە زێدەگۆییـەوە بایـەخیان بـە ژیـان و دوورخسـتنەوە و مردنـی مامۆسـتا دەدا و چیرۆکی سەیریان لێ دەخوڵقاند.

خۆشبەختانە کە ئێستا ئـەم چیرۆکانـە بەسـەرچوون و وا وردەوردە خەریکـە دەرفەت هەڵدەکەوێت کە کەسێك بە قووڵییەوە کونجـەکانی ژیـانی مامۆسـتا لـە ڕۆژگاری دیکتاتۆریدا بپشکنێت و نهێنیی ژیانی ئاشکرا بکات.

من لەگەڵ زۆر لەو ئافرەتانەدا کە مامۆستایان ناسیوە و یان هیچ نەبێ چەند جـارێك دیویانـە، قسـەم کـردووە، ئەگـەر لـەو لایـەنی حـەز بـە خۆدەرخسـتنە چاوبپۆشین کە لە قسەکانیاندا بەدی دەکرێ؛ هیچی وا نامێنێتەوە.

دەربـارەی مامۆسـتا لـە هـەر کەسـێك شـتم پرسـیوە؛ باسـی خـۆی کـردووە. تەنانەت ئافرەتە نەناسەکەش پتر باسی خۆی کردووە نەك ژیانی مامۆستا. تەنها شـتێك بمێنێتـەوە ئەوەیـە کـە پـەیوەندیی مامۆسـتا لەگـەڵ هـەموو ئەمانـەدا، چ ئەوانەی کە قوتابی بوون و چ ئەوانەش کە لەبەر هەر هۆیەك لە هۆکان لـە کـۆڕ و کۆبوونەوە تایبەتییەکان و میواندارییەکاندا لەگەڵیدا بوونەتە دۆست و ئاشـنا و لەگـەڵیدا هەڵسان و دانیشتوون، پەیوەندییـەکی پاك و بێگـەرد بـووە، تەنـها ئـەو ئافرەتە نەناسەی لێ دەربچێت. گەر کەسێك هەبێت شتێك بزانێت.. تەنها ئـەوە. بـەڵام مامۆسـتا مرۆڤێکـی کـەمدوو و نـهێنی پـۆش بـووە و بـە دەگمـەن خـۆی

ناساندووە. ڕەنگە ئەوەی ئافرەتە نەناسەکەش دەربارەی ئەو دەیگێڕێتەوە بە تەنها خەیاڵاتی خۆی بێت.

بە شێوەیەکی گشتی، ئەوەی لەمانەوە بە چنگم هێنا ئەوەیە کە مامۆستا ماکان مرۆڤێکی پڕ نهێنی بووە، زۆربەی کات ڕووگرژ بووە، کەمتر گاڵتە و گەپی کردووە، لەگەڵ ئاشناکانیدا و بە تایبەتیش لەگەڵ ئافرەتان و قوتابییەکانیدا ڕێکوڕاست دواوە و گوێی نەداوەتە ئەوەی کەسانی دی قسەکانیان پێ خۆش دەبێت یان نا، هەرگیزیش قسەی کەسێکی لای کەسانی تر نەگوتۆتەوە، جا ئیدیئەو قسەیە باش بووبێت یان خراپ. قایلیش نەبووە لە بەردەمیدا باسی کەسێکی دی بکرێ. کەمدوو بووە و گەر قسەکانیشی لە چەند ڕستەیەك تێپەڕیبێت ئەوا زیاتر دەربارەی کارەکانی خۆی بووە نەك دەربارەی کاروبارە ڕۆتینییەکانی ژیانی ڕۆژانە. کەس ناتوانێ بڵێت کە هاوڕێی گیانیبەگیانیی مامۆستا بووە. مامۆستا هامشۆی کەسی نەکردووە و کەمتریش چووە بە میوانی و دەرگایماڵەکەشی لەسەر پشت بووە.

هەرگیز بۆ نانی نیوەڕوان و ئێواران کەسی دەعوەت نەکردووە، بەڵام ئەوەندەی لە توانایدا بووبێ خزمەتی میوانەکانی کردووە. گەورەترین نیگارکێشی ئێران لەو سەد ساڵەی دواییدا، لە 44 ساڵیدا گیانی سپارد و، بیست ساڵی تەواو خەڵکانێك کە لەو ڕۆژگارەدا پایەیەکیان هەبووە ناسیویانە و ڕێزیان لێگرتووە. لەو ڕۆژگارەدا گەلێ لە پیاوماقووڵ و خانەدانانی تاران شانازییان بەوەوە کردووە کە تابلۆیەکی ئەویان بە دیواری ماڵەکەیاندا هەڵواسیوە،یان هیچ نەبێت تابلۆی یەکێك لە قوتابیەکانی کە تیایدا ویستوویەتی کارێکی مامۆستا نەقڵ بکات. لەگەڵ ئەوەشدا کەس ئەوی بە تەواوی نەناسیوە، کەس نەچووەتە نێو ژیانی تایبەتیی مامۆستاوە، ئەم مرۆڤێکی ئارام و هێور بووە و ڕێی بە کەس نەداوە پەی بە گەنجینەی دڵی بەرێت. کونج و کەلەبەرەکانی ڕۆحی مەکۆی دەرد و کەسەر بوون و هەرگیز حەزی نەکردووە خەڵکی بزانن چ ئازارێك گینگڵی پێ دەدات. هەمیشە ویستوویەتی خۆشحاڵ و کامەران خۆی پیشان بدات و کەس نەیدەزانی

لە قووڵایی ناخی ئەم پیاوە شیک و خۆهەڵنەکێشەدا چ ئاشووبێك لە جۆش و خرۆشدایە.

ڕۆژێکیان بە یەکێك لە قوتابییەکانی خۆی وتووە کە ویستوویەتی خۆی لێ بەرێتە پێشەوە: "ئەو مەملەکەتە بەدبەختە کە من مامۆستایم، لە شاری کوێراندا یەکچاو پاشایە".

لەگەڵ ئەمانەشدا هەموو ئەوانەی کە پلەوپایەیەکیان هەبووە بۆ تێرکردنی هەستی خۆپەرستی لە ناخیاندا، هەوڵیانداوە لەگەڵیدا ببنە ئاشنا.

تەنانەت شای پێشووش نەیتوانی بە چاوێکی کەمەوە سەیری بکات و لە سەرەتای فەرمانڕەواییدا کە هێشتا دڵراکێشانی خەڵکی بەلای خۆیدا بە شتێکی زیاد نەدەزانی، ڕۆژێکیان چوو بۆ بینا نوێیەکەی قوتابخانەکەی مامۆستا و لەوێ چاوی پێکەوت، وەختێ ویستی سواری ماشێنەکەی بێت، بە قامچییەکەی دەستی دوو سێ جار کێشای بە چەکمەکەی ڕاستی خۆیدا و وتی: "لە کوێ خوێندوویەتی؟".

–قوربان لە فەڕەنسا بووە، پاشان ماوەیەکیشی لە ئیتالیا بەسەر بردووە.

شا گەڕایەوە تا خۆی لەگەڵ مامۆستادا قسە بکات و کە سەرنجی دا، سەیری کرد مامۆستا لەو سەری هۆڵەکە وەستاوە و دەیەوێت جگەرەیەك دابگیرسێنێت. بەمە دڵی برینـدار بوو و، ڕووی وەرگێڕا و بە... ئەلسەڵتەنەی وت: "دیارە لە فەڕەنسا بووە؛ ئەگینا ئەوەندە بێ ئەدەب نەدەبوو".

ڕیش سپیان سەرزەنشتی مامۆستایان کرد و دنیادیدەکان زۆریان لێکرد کە بچێت و لە بەردەم ماشێنەکەی شادا خۆی بەسەر پێیدا بدات و داوای لێبوردنی لێ بکات. مامۆستا سەرەتا زۆر شێتگیر بوو، توند جگەرەکەی فڕێ دا، چەند پلەیەك لە پێپلیکانەکان هاتە خوارەوە، بەڵام زۆر لەسەرخۆ. شا سواری ماشێنەکەی بوو و ڕۆیشت. ئەم ڕووداوە بووە هۆی ئەوەی کە وەزارەتی ڕۆشنبیری و، وەزارەتی پیشەسازی و، وەزارەتی بازرگانی و، کاروبار و، هونەر و، وەزارەتی ئابووریی میللی و، بەڕێوەبەرێتیی گشتیی هونەرە جوانەکان، هیچ بایەخێك بەو مەڵبەندە

هونەرییە نەدەن و لای لێ نەکەنەوە، تا ئەودەمەی مامۆستایان بۆ کەلات دوور خستەوە و لەوێ گیانی سپارد.

تەواوی پیاوە گەورەکان دەیانویست مامۆستا وێنەیان بکێشێت، دەهاتن، تکایان لێ دەکرد، لێی دەپاڕانەوە. بەڵام ئەو تەنانەت لە ڕۆژانێکدا کە پێویستیی بە پارەتیش هەبوو نەچووە ژێر ئەو بارەوە، لە کاتێکدا کە چەندان جار وێنەی ڕەجەبی نۆکەری کێشاوە. ئەو تابلۆیانەی کە وێنەی ئاغا ڕەجەبی نۆکەری سادە و بە ئەمەکی تیایاندا کێشاوە کە کەسێکی زۆر نزیك بووە لێوەی، ئەوە دەردەخەن کە توانیویەتی چەند بە وردی بچێتە قووڵایی ڕۆحی ئەم مرۆڤە ساکارەوە و گوزارشت لە حاڵەتە جیاجیاکانی بکات. ڕەنگە تاقە هۆی گرنگی دۆستی و پەیوەندیی مامۆستا بەم دێهاتییە هەمەدانییەوە ئەوە بووبێت کە مامۆستا سەیری کردووە هەندێ لە سیفاتەکانی خۆی لە خزمەتکارەکەی هاوڕێیدا ڕەنگی داوەتەوە، ئاغا ڕەجەبیش نهێنیپۆش بوو و خۆی نەیویستایە شتێك بدرکێنێت، هیچی لێ دەرنەدەهێنرا. مامۆستا ئاغا ڕەجەبی لە یەکێك لە لادێکانی دەوروپشتی هەمەداندا کە ناوی "وەرزەك" بووە ناسیوە.

مامۆستای نیگارکێش مانگەشەوێك کە لە سەربان ڕاکشاوە و گریانی منالی یەکێك لە دراوسێکان نەیهێشتووە خەو بچێتە چاوی، بەربەیان بێ سێ و دوو دەچێت بۆ لای منالەکە. دەبینێت کە منالێکی دوو سالانە و تووشی ڕەوانی بووەو، دەرشێتەوە و خەریکە گیان دەدات. ئاغا ڕەجەب و دایکی منالەکە لە کەنار بێشکە پیسەکەی منالەکەوە بە کزی دانیشتوون و چاوەڕێی مەرگی منالەکەن. مامۆستا بە ئاوی گەرم منالەکە دەشوات. بە کراسێکی خۆی دەیپێچێتەوە. چەند حەبێکی دەداتێ و ڕۆژی دوایی کە منالەکە دێتەوە سەرخۆی بە ڕەنگی ئاوی وێنەیەکی دەکێشێت و پێشکەشی باوکی دەکات.

پاش دوو سالێ، دووەم منالی ئاغا ڕەجەب تووشی هەمان دەرد دەبێت؛ ئەمیش بە خۆی و مالێ و منالەوە دەچێت بۆ مالی مامۆستا. دوای ئەوەی هەرچۆنێك بێت ناونیشانەکەی چنگ دەکەوێت، دەچێت تا مامۆستا ئەو منالەی

تریشی بۆ چاك بكاتەوە؛ چونكە لە دێهاتەكانی هەمەداندا كەس ئەو موعجیزانەی نەزانیوە. ئیدی لەو دەمەوە ئاغا ڕەجەب و ژنەكەی و منالەكەی لە ماڵی مامۆستا ماكاندا گیرسانەوە.

ئەوەندەی من ئاگادار بم مامۆستا نزیكەی بیست و شتێك سكێچی ئەم خزمەتكارەی هاوڕێی لە باری جیاجیای وەكو تووڕەیی و، پەشۆكان و، ترس و دەسەپاچەیی و، بێزاریدا كێشاوە. لە یەكێك لە هێڵكارییەكاندا ئاغا ڕەجەب خەوتووە و بە چەند هێڵێك باری لەش و بازوو و قاچە درێژەكانی پیشانداوە. سەروسیمای ئاغا ڕەجەب ئارام دێتە پێشچاو. مامۆستا هەوڵی داوە كە ناوەوەی ئەو پیشان بدات، بەلام بینەر ناتوانێ شتێكی ئەوتۆی دەسگیر بێت. تاقە شتی ئاشكرا لە وێنەكەدا ئاسەواری پڕ ئازاری ڕابوردوویەكی پڕ مەینەتییە.

دوو سێ تابلۆی ئاوی و زەیتیی ئاغا ڕەجەب كە مامۆستا كردوونی لە مۆزەخانەی قوتابخانەی نیگاركێشانەكەدایە. ئاغا ڕەجەب خۆیشی هێشتا هەر لەم قوتابخانەیەدایە كە تا ئێستا چەند جار ناوی گۆڕاوە و گەرچی بە ڕواڵەت فەڕاشە و مووچەی فەڕاشی وەردەگرێت، بەلام لە ڕاستیدا گەورەترە و هەمەكارەیە، بە جۆرێك كە من پرکێشی ناكەم بە بێ ئیجازەی ئەو دەسكاریی تابلۆكان بكەم.

ئاغا ڕەجەب هیچ قسەیەك ناكات، هیچ شتێكی لە ڕابردووی مامۆستا بیر نەماوە، تەنانەت ئەو ڕووداوە گرنگانەی كە هەمووان دەیزانن، دەبێ بە زۆر بهێنرێنەوە یادی.

ئاغا ڕەجەب دەڵێت: "مامۆستا تاقە جارێك قایل بوو كە وێنەی یەكێك لە – گەورەپیاوەكان– بكێشێت و ئەو پیاوەش –خەیلتاش– بوو كە لە سەیر و سەفای فەرەنگستانەوە هاتبووەوە بۆ ئێران. لەو ڕۆژگارەدا زۆربەی خەڵكی پتر لەم سڵیان دەكردەوە وەك لە شاو لە ڕاستیدا ئەمیان بە دیكتاتۆری ئێران دەزانی".

ڕۆژێكیان، وەختێ كە خەیلتاش هێشتا لە پاریس بوو لە "ئیلوستراسیون" وێنەیەكی كرابوو، تیایدا خەیلتاش بە پلەكانی كۆشكی ئەلیزێدا دێتە خوارێ،

دەڵێن کاتێك مامۆستا ئەم وێنەیەی بینیوە کەیفی هاتووە و وتوویەتی: "لە ئاغاکانی خۆی گەورەتر دیارە، بریا دەیتوانی ئابڕووی ئێران بپارێزێت".

من ئەو وێنەیەم لە "ئیلوستراسیون" دیوە، خەیلتاش بە سنگێکی پان و سەری بڵندەوە، کە زۆر لەخۆکردنی پێوە دیار نییە، بە قورس و سەنگینییەکەوە، وەکو ئەوەی سەرکەوتنێکی گەورەی بە چنگ هێنابێت، بە پلەکاندا دێتە خوارێ.

وەختێ خەیلتاش بۆ ئێران هاتەوە، مامۆستا لای هاوڕێکانی ئامادەیی خۆی دەربڕی تا وێنەی ئەو وەزیرە بکێشێت. چەند ڕۆژێك دوای ئەوە جەنابی وەزیر خۆی چوو بۆ ماڵی مامۆستا، نزیکەی نیو سەعاتێك بە تەماشای کارەکانییەوە خەریك بوو، پاشان وتی: "بیستوومە ئێوە قوتابیی ستیڤانۆی ئیتالی بوون. لە دوا سەفەرمدا بۆ پاریس چاوم بە Oever "1"ەکانی ئەو کەوت و بە یەکتریش ئاشنا بووین. پێی وتم کە قوتابیی ئەو بوویت. بەڵام من هیچ جۆرە لێکچوونێك یان هیچ نەبێ کارتێکردنی Ecole"2"ی ئەو لە کارەکانی ئێوەدا نابینمەوە".

مامۆستا وتی: "چۆن دەتانەوێ کارە بچووکەکانی من بە شاکارەکانی سیتڤانۆ بەراورد بکەن؟ من قوتابییەکی ئەو بووم، ئاساییە کە کارتێکردنی ئەو لەسەر کارەکانی من نەبینرێ. لەگەڵ ئەوەشدا من هەوڵ دەدەم پەیڕەوی لە ڕێبازە هونەرییەکەی ئەو بکەم".

خەیلتاش زەردەخەنەیەك هاتە سەر لێوی و وتی: "ئێوە ئەوەندەش Modeste"3" مەبن".

لەو ڕۆژە بەدواوە، خەیلتاش هەر ئەوەندە بواری هەبوایە، هەفتەی دوو سێ سەعات و بە تایبەتیش نیوەڕوان دەهات و کتێبێکی دەگرت بە دەستەوە و دەیخوێندەوە و مامۆستاش وێنەی دەکێشا. پاش دوو سێ هەفتە، لەوانەیە جاری پێنجەم و شەشەم بووبێت، خەیلتاش وەختێ لەسەر کورسییەکە دانیشتبوو و کتێبەکەی دەخوێندەوە و مامۆستاش سەرگەرمی وێنەکێشانەکەی بوو، سەری لەسەر کتێبەکە هەڵبڕی و وتی: "جەنابی شا کارەکانی ئێوەی زۆر لا پەسەندە".

مامۆستا چاوی لەسەر پالێتەکەی دەستی هەڵبڕی و بێباکانە وتی: "سوپاس".

خەیلتاش ماوەیەك. دەشێ دەقیقەیەکی تەواو بووبێت لە دەموچاوی مامۆستا ڕاما. هەڵبەتە دەیزانی کە قسەکەی پێ خۆش بووە، بەلاّم وەختێ سەیرکرد مامۆستا زۆر بێباکانە قسەکەی وەرگرتووە و دەشێ هەر بیری لەوەش نەکردبێتەوە کە بڵێت "سوپاس" ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و خوێن پەڕییە چاوی. دیارە خەیلتاش لە لایەن مامۆستاوە، چاوەڕێی مەرایی و ڕیا نەبوو، بەلاّم چاوەڕێی ئەو ساردی و بێباکییەش نەبوو.

خەیلتاش چاوەڕێ بوو تا نیگارکێشەکە تەماشای بکات، مامۆستا کاتێك فڵچەکەی بە بۆیەی سەر پالێتەکە بۆیاوی کرد و ویستی بیبات بۆ تابلۆکە، چاوی بە دەموچاوی وەزیر کەوت و لە تووڕەییەکەی سەری سوڕما، لە هەمان کاتدا خەیلتاش لێی پرسی: "حەزناکەن وێنەیەکی شا بکێشن؟".

ڕەنگ لە ڕووی مامۆستا پەڕی.

لێوەکانی وەك گەچ سپی هەڵگەڕان، زەردەخەنەیەکی درۆی خستە سەر لێوی، فڵچەکەی لەسەر مێزەکە دانا، پالێتەکەی لە پەنجە گەورەکەی کردەوە، لە پشتی تابلۆکەوە هاتە ئەملاترەوە و وتی: "نەخێر قوربان! من وێنەی کەسانێك دەکێشم کە کەیفم پێیان بێت، تەماشای ئەم وێنانەی دەوروپشتتان بکەن. من ئەمانەم خۆشدەوێ..".

خوێن زایە چاوەکانی جەنابی وەزیرەوە. تەماشایەکی تابلۆکانی دەوروپشتی کرد و دەمی کراوەی مارگرێك کە دەیەوێت گاز لەسەری مارێك بگرێت وروژاندی.

مامۆستا بێتاقەت بووبوو، بەلاّم خەیلتاش کە خۆڕاگرتر بوو لەسەر کورسییەکەی هەڵسا، دەستێکی خستە سەرشانی ئەو و وتی:

"من ڕێزم هەیە بۆتان. لێتان تێ دەگەم".

–ڕێزێکی..

خـەیلتاش نەیهێشـت قسـەکەی تـەواو بکـات و وتــی: "بــە قـورس مــەیگرن! سوپاسی هەستتان دەکەم".

مامۆستا تاوێك لە ژوورەکەدا بە تەنیا مایەوە. نیو سەعات دوای ئەوە وەختێ خزمەتکارەکەی خۆی کرد بە ژووردا، سەیری کرد لە نزیك پەنجەرەکەوە لەسەر ستوڵێك دانیشتووە، سەری خستۆتە نێوان دەستەکانییەوەو، ئانیشکی خستۆتە سـەر تاقەکـە و، لـە ئاسمـان ڕادەمێنێـت. وەختـێ ئاغـا ڕەجـەبی بینــی، هاتــەوە سـەرخۆی. لەسـەر سـتوڵەکە هەڵسـا، بـەو چەقۆیـەی کـە بۆیـە زەیتییەکـەی پــێ لێدەکردەوە تابلۆکەی خەیلتاشی پارچە پارچە کرد و چوارچێوەکەی لە کەتانەکە کردەوە و پاڵتۆکەی لەبەرکرد و لەماڵ چووە دەرێ.

ئاغـا ڕەجـەب لـە یـادێتی کـە مامۆسـتا ڕۆژێـك نامەیـەکی پیـادا نـاردووە بـۆ وەزارەت و داوێتــی بــە خزمەتکارەکــەی جــەنابی وەزیــر و ئیــدی لــەو جــارەوە خەیلتاش سەری بە ماڵی مامۆستادا نەکردۆتەوە. پاش چەند ڕۆژێك، هەمان ئەو خزمەتکارەی وەزیر نامەیەکی هێناوە و داوێتییە دەست ئاغا ڕەجەب و ئەمیش داوێتـی بـە مامۆسـتا، ئـەم نامەیـەی خەیلتاشـم لـەنێو کاغـەزەکانی مامۆسـتادا دۆزییەوە. ئەمەش دەقی نامەکەیە:

"مامۆســتای هێــژا، پێــم ناخۆشــە کــە وێنەکــەی منتــان تــەواو نــەکردووە. ئومێدەوارم هەرکاتێك هەلتان بۆ ڕەخسا هیمەتێك بکەن و تەواوی بکەن..

هاوڕێتان، خەیلتاش"

وێـڕای ئەمــەش؛ خـەیلتاش هەمیشـە لـە کۆڕەکـاندا و لـەنێو خـەڵکیدا ڕێــزی مامۆستای دەگرت، هـەر لـەو ڕۆژانـەدا زانایـەك بـە نـاوی ولاّتـی هینـدەوە بـۆ ئێران هـاتبوو. لـە هۆڵـی وەزارەتــی ڕۆشـنبیریدا کـە جێـی دووسـەد تـا دووسـەدوپەنجا کەسێکی تێدا دەبووەوە، کۆڕێکی ڕێزلێنانیان بۆ ساز کرد.. دوو ڕیزی یەکەم بۆ پیاوە خاوەن پایەکان تەرخان کرابوو، گشت وەزیران و بریکاران و مەراییکەرەکان ئامادە بوون، مامۆستا لە ڕیزی پێنجەمدا دانیشتبوو.. سێ دەقیقە بەر لە هاتنە

ژوورەوەی زانا هیندییەکە خەیلتاش هات، یەکسەر ئەوانەی کە لە دوو سێ ڕیزی پێشەوەدا دانیشتبوون هەڵسانە سەرپێ. خەیلتاش بێ ئەوەی گوێ بداتە کەس ڕۆیشت و لە شوێنەکەی خۆی دانیشت، هەر کە هەڵسا تا بۆ لای سەرۆك وەزیران بچێت، چاوی بە مامۆستا کەوت و وتی:

"سەلامتان لێ بێت".

مامۆستا ئاگای لێ نەبوو، دوو سێ کەس بە دەنگێکی بەرز وتیان:

"مامۆستا جەنابی وەزیر سەلامتان لێ دەکات".

مامۆستا سووکە بەرزبوونەوەیەك بەرز بووەوەو، سەرێکی ڕاوەشاند، بە بێئەوەی نیشانەی خۆشحاڵی یان گرژی بە سەروسیمایەوە دیاربیدات.

خەیلتاش وتی: "تکاتان لێ دەکەم! تکاتان لێ دەکەم!"

وەختێ ئەڵقە ئەڵقە ڕووداوەکانی ژیانی مامۆستا پێکەوە دەبەستینەوە، دەبینین کە نهێنییەکی شاراوە لە ژیانیدا هەیە، ئەم ڕووداوانە بە یەکەوە پەیوەست نین، لەگەڵ ئەوەشدا ئاشکرایە کە داوێکی نهێنی ئامێز بەنێو هەموو ئەو ڕووداوانەدا تێدەپەڕێت و تا ئەم داوە نەدۆزرێتەوە ناتوانرێ ئەڵقەکان پێکەوە گرێ بدرێن.

کەسێك کە لە شای پێشوو سڵی نەکردبێتەوە و لەگەڵ خەیلتاشدا بەو جۆرە ڕەفتاری نواندبێت و بێ ترس و سڵەمینەوە.. ئەوە بوو ئەم نەترسییەی هەر لەگەڵدا بوو تا دووریش خرایەوە و لە دوورخراوگە گیانی سپارد، یان ڕەنگە کوژرابێتیش، مرۆڤێکی ئاوەها.. دەشێ ئەسیری جوانیی ئافرەتێك بووبێت؟

من هەر لە یەکەم ڕۆژەوە کە بیرم لە نووسینی مێژووی ژیانی نیگارکێشی گەورەی ئێران کردەوە، دڵنیا بووم لەوەی تا ئەو ئافرەتە نەناسە.. خاوەنی چاوەکانی تابلۆکە نەدۆزرێتەوە، ئەوەی کە دەینووسم هەر ئەوە دەبێت کە لە ڕۆژنامەکاندا نووسراوە. من تەماشای ئەوراقەکانی دائیرەی ئاسایشم کردووە. بەڵام لەوێش هیچم وەگیر نەکەوت. تەنانەت دوورخستنەوەکەشی بە فەرمانێکی

زاری نەك نووسراوی سەرتیپ ئارام بووە، ئەویش ئێستاکێ لە ئێراندا نییە و، دەڵێن گوایە لەئەمەریکای باشووردا ژیانێکی ئاسوودەی بۆ خۆی پێکەوە ناوە.

من کە بە وردی دەربارەی پەیوەندییەکەی نێوان مامۆستا و خەیلتاش قسەم کرد، مەبەستم بوو ئەوە بخەمە ڕوو کە تەنانەت خەیلتاشیش کە بە دەسەڵاتترین پیاوی ئێران بوو لەو ڕۆژگارەدا، یان بە لایەنی کەمەوە دوای ڕەزا شا ئەو گەورەترین پلەوپایەدار بوو، ناچار بوو ڕێز لە مامۆستا بگرێت. ناشبێ وابزانرێ کە پیاوە خاوەن دەسەڵاتەکانی سەردەمی دیکتاتۆری هونەرپەروەر بوون و خەیلتاش مەبەستی بووە ڕێز لە خاوەن بەهرەکان بگرێت. من مەبەستم ئەو ڕێز و پایە تایبەتییەی مامۆستایە کە لەناو خەڵکانێکی تێگەیشتوودا هەیبوو. خەیلتاش کە لە کۆڕ و کۆبوونەوە ڕەسمییەکاندا سڵاوی لە مامۆستا دەکرد، بەمە دەیویست سەرنجی خەڵکی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت. ئەو ڕۆژانە هێشتا دەسەڵاتی دیکتاتۆری بە تەواوەتی ڕەگی خۆی دانەکوتابوو. هێشتا لە دەزگای دەسەڵاتداریشدا کەسانێکی وەکو خەیلتاش خۆشی مابوون کە بەرگەی ئەوەیان نەدەگرت بە سووکییەوە سەیر بکرێن. هێشتا لە هەندێ ناوچەکانی وڵاتدا کەسانێکی یاخیی ئومێدەوار مابوون، کەسانێك یان ناوبەناو گرووپێك پەیدا دەبوو کە دەستی لە بەرەنگاری نەدەکێشایەوە. هێشتا کەسانێکی وەکو مامۆستا مابوون کە بەرامبەر ستەم و پێشێلکردنی مافی خەڵکی ئامادەی گیانبازی بوون، خەیلتاش دەیویست لەم ڕێیەوە پاکانە بۆ خۆی بکات.

سەرباری ئەمانە، بوونی مامۆستا هۆیەك بوو بۆ گەیاندنی داهێنانە نوێیەکانی ئەو دەمە. هەر کەسێك کە لە وڵاتانی دەرەوە بۆ ئێران دەهات، بۆ بینینی کارەکانی مامۆستایان دەبرد. ئەوە بوو بازرگانێکی ئاسەواری کۆنینە فرۆشی ئەمەریکایی کە خۆی بە هونەرناس و پرۆفیسۆری هونەرە جوانەکان دەزانی، بە کرینی کۆمەڵێك لەو تابلۆیانەی کە مامۆستا بۆ چوارینەکانی خەییامی کێشابوو، سەروەتێکی باشی پێکەوە ناو لە هەمان کاتدا، چەندان چیرۆکی دەربارەی هونەر پەروەری لای ڕژێمی ئێران لە ئەوروپا و ئەمەریکادا بڵاوکردەوە، ئەوە بوو

وێنەیەکی مامۆستایان لە گۆڤارە ئەمریکاییەکاندا بڵاوکردەوە کە لەسەر کورسییەك دانیشتووە و لەگەڵ منداڵەکانی ئاغا ڕەجەبدا گاڵتە دەکات.

جگە لە هونەری نیگارکێشان، بڕندەترین سەرەنێزەیەك کە لە دەستی مامۆستادا بوو، بێباکیی بوو لە ئاست کۆت و پێوەند و دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکاندا. خێزانەکەی خۆی جێهێشتبوو کە لە بنەڕەتدا مازندەرانی بوو. ماڵەکەی لە خانوویەکی تا ڕادەیەك گەورەدا بوو، لە پشت مزگەوتی "سپهسالار"ەوە. خانووەکەی خراپ نەدەهاتە پێشچاو. دار هەنار و چنار و شمشادەکان هاوینان سێبەرێکی فێنکیان بە دەوری حەوزەکەدا دروست دەکرد، سەرەتای بەهارانیش بۆنی ئەو گوڵەباخانەی کە مامۆستا لە پەرداخی گەورەدا دایدەنان تەڕ و تازەیی تەنانەت بە هەوای کارگا هونەرییە تاریکەکەشی دەبەخشی. مامۆستا لە ڕێی فرۆشتنی تابلۆکانییەوە بە دەوڵەمەندەکان پارەیەکی باشی چنگ دەکەوت، بەڵام ئەوەی هەیبوو و نەیبوو بۆ ئاغا ڕەجەبی خەرج دەکرد. گەرچی خۆی کەمتر بایەخی بە ئاڵا و واڵای ژیان دەدا، بەڵام هەوڵی دەدا ژیانی ئاغا ڕەجەب و منداڵەکانی؛ کە یەکێکیان بەر لە دوورخستنەوەی مامۆستا پێی نابووە دوانزە ساڵانەوە؛ خۆشگوزەرانتر بکات. دوو منداڵەکەی ئاغا ڕەجەبی بە منداڵی خۆی دەزانی. چی خۆشەویستیی هەیە بەوانی دەدا. لە پێناویاندا چیی لەدەست بهاتایە درێخی نەدەکرد. ئەو یارییە منداڵانەی بۆ فەیروزی کوڕی ئاغا ڕەجەبی کڕیبوو، لەو یارییانە کەمتر نەبوون کە دەخرانە بەردەستی منداڵی خێزانێکی دەرامەت مام ناوەندی. فەیروزی بۆ قوتابخانە ناردبوو و ڕەفتاری لەگەڵ هاوپۆلەکانیدا لە ڕەفتاری کوڕی ئاغا ڕەجەب نەدەچوو. لەگەڵ ئەمەشدا مامۆستا ژیانی لە سێ ژووردا دەگوزەراند. یەکێکیان بریتی بوو لە کارگەکەی، کە پڕبوو لە تابلۆی جۆراوجۆر و کۆمەڵێك کتێب بە زمانی فەرەنسایی و ئیتالی و چوارچێوە و ڕەنگ و مقەبا و ستوڵ و پێویستییەکانی تری کارگەیەکی نیگارکێشان. بە زۆریش هەر لەو ژوورەدا نانی دەخوارد، هەندێ جاریش هەر لەوێ لەسەر قەرەوێڵەیەکی دار لێی دەنووست. لە ژوورێکی تریاندا پێشوازیی لە

میوانەکانی دەکرد، ژووری سێیەمیش کە ناونرابوو ژووری نووستن، بە کتێب و تابلۆ سیخناخ بوو، ئەو کارانەی کە حەزی نەدەکرد پیشانی کەسیان بدات، لەم ژوورەدا دەیشاردنەوە. ئاغا ڕەجەب دەڵێت هەندێ جار لە شەوانی هاویندا، وەختێ ئاسمان ساماڵ و ئەستێرە باران دەبوو، دەچووە سەربان و شەو درەنگانێ، کاتێك ئەم و هاوسەرەکەی لە شیرینی خەودا دەبوون، زۆر بە هێمنی دەهاتە خوارێ و قەرەوێڵە سەفەرییەکەی لە کارگەی نیگارکێشانەکەی هەڵدەگرت و دەیبردە سەربان و بۆ خۆی لەوێ لێی درێژ دەبوو.

زۆربەی ئەمجارانە تا سەحەر بێدار دەبوو و، کاتێ خۆر هەڵدەهات دەستی دەدایە قەرەوێڵەکەی و دەهاتە خوارەوە و لە کارگەکەیدا کە هاوینان گەرم دەبوو؛ دەنووست.

بیرەوەرییەکانی ئاغا ڕەجەب، ئەو بیرەوەرییە پەرش و لێکترازاوانەی کە لەسەر زمانی کابرایەکی نهێنی قایم دەگوترێن، تاقە شتێکن دەربارەی ژیانی ئەو کابرا سەیرە، کە ئەکرێ پشتیان پێ ببەسترێ. بەدبەختانە کە ئاغا ڕەجەب کابرایەکی نەخوێندەوار و بێسەوادە. بۆ نموونە ئەو مێژووی کێشانی تابلۆکان نازانێت و، ئەو تاقە کلیلەی کە بۆ دەرگاکردنەوە لەسەر نهێنیی ژیانی مامۆستا شکی دەبەین بێسوود دێتەبەرچاو. خۆ ئەگەر شتێکیش بزانێت ئەوا بیرەوەرییەکی پەرشوبڵاو و بێسەروبەرە. بۆ نموونە دەڵێت: "وا بزانم هەر ئەو ساڵەی کە ئاغا باڵابەرزەکە "مەبەستی لە خەیلتاشە" سەری لە ئاغام دەدا تابلۆی "دێوەرەکان"ی کێشاوە.. یان ئەودەمە نا کە مستەرە ئەمریکاییەکە تابلۆکانی لە مامۆستا کڕی، بەڵکو ساڵێك دوای ئەوە، ئافرەتە نەناسەکە وەکو مۆدێل بۆ مامۆستا دادەنیشت. یان دەڵێت کە وەختێك کوڕی دووەمی چووەتە قوتابخانە، مامۆستا هێڵکارییەکەی ئەمی کردووە کە لەژێر درەختەکەدا ڕاکشاوە و خەوتووە. وێڕای ئەمانەش، ئاغا ڕەجەب زیرەکتر لەوە دێتە پێشچاو کە خۆی پیشان دەدات: هەرچەند سەر دەهێنم و سەر دەبەم باوەڕ ناکەم مامۆستا توانیبێتی دە ساڵ و بگرە زیاتری لەگەڵ کابرایەکی وا گێلدا بەسەر بردبێت. هەر بۆیە لەو باوەڕەدام گەر نهێنییەکیش لە

کاری مامۆستادا هەبێت، ئەم دێهاتییە هەمەدانییە لێی بێخەبەر نییە.. بە کورتی من لە خۆم دەپرسم: "باشە ئەم کابرایە بۆچی هیچ بە کەس نالێت؟".

چەند کۆشام زانیارییەك هەرچەندە کەمیش بێت دەربارەی ئەو ئافرەتە نەناسە؛ کە بە بڕوای من چاوە پڕ نهێنییەکان هی ئەون، لەم ئاغا ڕەجەبە بەدەست بهێنم، بەڵام بێهودە بوو.. نازانێت، لە یادی چووە، بیری نایە ئایا مامۆستا ئەو تابلۆیەی کێشاوە یان نا، نازانێت کە ئەو ئافرەتە تەمەنی چەند بووە، یادی نییە کە جوان بووە یان نا، بیری نییە کە چەند هاتوچۆی مامۆستای کردووە، ئەوەندە دەزانێت کە مامۆستا وەختێ لە کار دەبووەوە، ئەو ئافرەتەی دەگەیاندە ماڵەوە.

-تۆ قەت بۆ ماڵی ئەو ئافرەتە نەچوویت؟

-نەخێر، بیرم نایە.

-بیر بکەرەوە، بەڵکو ماڵیانت بێتەوە یاد.

-نایەتەوە یادم.

-ئەی تابلۆی ئەو ئافرەتەت دێتەوە یاد کە مامۆستا کێشاویەتی؟

-نەخێر.. ئاغا.

-ئافرەتەکە ڕووت نەبووە؟

-نەخێر، ئاغام باوەڕی پتەو بوو.

-دەزانم. بەڵام وێنەی ئافرەتی ڕووتیشی کێشاوە.

-بەڵێ، ئاغا ئەوانەی لە فەرەنگستان کێشاوە، لێرە وێنەی وەهای نەکێشاوە، من نەمبینیوە.

-تۆ دەڵێیت چی ئاغا ڕەجەب؟ دەموچاوی هەندێ لەو ئافرەتە ڕووتانە لە ئێرانی دەچێت.

چۆن قەناعەت بە ئاغا ڕەجەب دەکرا؟ بڕوای نەدەکرد.ئەو ئاغاکەی بە پەیکەرێکی ڕاهیب و بێگەرد دەزانی و لەو باوەڕەدا بوو هەرچییەك کە ئەم بە شتێکی دژ بە ئاین و باوەڕی دەزانی لە مامۆستای نەوەشاوەتەوە.

ئاغا ڕەجەب ئاغایەکی تایبەتیی بۆ خۆی خولْقاندووە ئەستەمە لە ڕێی ئەمەوە پەی بە ژیانی ڕاستەقینەی مامۆستا ببرێ.

سەرلەنوێ هەولْم دا تابلۆی "چاوەکانی" و گرنگیی ئەم تابلۆیە بۆ ئاغا ڕەجەب ڕوون بکەمەوە، هەولْم دا پێی بلْێم دەبێ چ نهێنییەك لەم تابلۆیەدا خۆی حەشار دابێت.مەسەلەکەش بە تەنها کارامەیی مامۆستا نییە لە کێشانی ئەم چاوە نهێنییانە و، بەخشینی چەندان حالْەتی جۆراوجۆر و مانای جیاجیا پێیان.. دەمویست ئەوەی تێ بگەیەنم کە دۆزینەوەی ئەو نهێنییەی وا لە پشت تابلۆی "چاوەکانی"یەوە دەمانگەیەنێتە خالْێکی سەرەکی کە لە ژیانی مامۆستادا پەنهانە و پەی پێبردنی بە نیسبەت خەلْکانێکەوە لە ئێستادا شتێکی پێویست و سوودمەندە. ئەوەتانێ نازانرێ بۆچی مامۆستا لە تاران دوورخرایەوە. بۆچی بۆ "کەلات"یان نارد؟ چیی کردبوو؟ سەرۆکی ئاسایش کە هەلْهات گوتبووی کە فەرمانی کوشتنی ئەویان پێ دابوو.. لەبەر چی؟ دەمویست ئەوە لە ئاغا ڕەجەب بگەیەنم کە ئەگەر ئێمە بزانین ئەو ئافرەتە نەناسە کێ بووە کە لە دواڕۆژی مانەوەی مامۆستادا لە تاران هامشۆی کردووە و ماوەیەکیش بە مۆدێل بۆی دانیشتووە، لەوانەیە بزانین کە بۆچی مامۆستایان دوورخستووەتەوە. یان ئەوەمان بۆ دەربکەوێت کە ئایا لە کەلات کوشتوویانە؟ بەهەرحالْ ڕوونکردنەوەی ئەم شتانە بۆ خەلْکی پێویستە. زانینی ئەم خالاْنە بۆ وەچەی ئەمڕۆ پێویستە.

ئەم ئاغا ڕەجەبە کابرایەکی چەند قیرسیچمەیە. هەرچەند دەکەم ناتوانم باوەڕ بەخۆم بهێنم کە کابرایەك نزیکەی دوانزدە سالْ و بگرە پتر لە یەك خانوودا لەگەلْ مامۆستادا ژیابێت و هەمەکارەی بووبێت، نەزانێت مامۆستایان لەسەر چی گرت.

بە چەندەها سەعات لە نوسینگەی ئەو قوتابخانەی نیگارکێشانەی کە ئەمڕۆ بە ناوی مامۆستاوە نراوە، من لەگەلْ ئەم ئاغا ڕەجەبەدا قسەم کردووە و ئەو باش دەیزانی کە من چەند مەبەستمە ئەو ئافرەتە نەناسە بناسم.

ئاغا ڕەجەب بە سیمایەکی ئارامەوە گوێم بۆ شل دەکات، چاولێکنانێت، نیشانەی شادی و سەرسوڕمان و خەم و نەزانین لە دەموچاویدا دیاری نادات،

هەندیٚ جار ئینسان هەقێتی لە خۆی بپرسێت: ئایا ئەم پیاوە هێمن و سەلارە؟ یان کابرایەکی دەبەنگ و خەڵەفاوە؟ ئایا زەینی کوێرە و شتی بیر ناکەوێتەوە؟ یان خۆی دەمی خۆی دووریوەتەوە؟ هەرچییەکت لیٚ دەپرسی بەوپەڕی هێمنییەوە وەڵامی دەدایەوە "بەڵیٚ"، "نەخێر"، بەڵام هەندیٚ جار چاوەکانی دەدرەوشانەوەو، دەتگوت پیٚ بە جەرگی خۆیدا دەنێت و کەسی پرسیارکەر بە غەریب دەزانێت. دەتوت ئەگەر نهێنییەکانی مامۆستا ئاشکرا بکات کوفر و گوناهی کردووە. لە ئارامییەکەشیدا هەست بە جۆرە پەشۆکانێك دەکرا کە لە ناوەوە دەیخرۆشێنێت، ئاغا ڕەجەب لەوە دەچوو بیەوێت بەسەر ئەو پەشۆکانەیدا زاڵ بێت و نەهێڵێت ئەو دەمامکە بکەوێت کە لەسەر دەموچاوی دایناوە. جاری وا بوو بە تەواوەتی بێتاقەت دەبووم و بە خۆمم دەگوت کە ئەم کابرایە بە ئەنقەست خۆی گێل دەکات و زۆر وریاترە لە وەی کە خۆی وا پیشان دەدات.

ئەمانە هەمووی بە لایەك. ئەوەتان لەیاد نەچێت کە من ئێستا لە خەرمانان بەدواوە لەم قوتابخانەی نیگارکێشانەدا سەرپەرشتیارم و، ئاغا ڕەجەبی ناموبارەکیش فەڕاشی قوتابخانەکەیە و لەژێر چاودێریی مندایە، چەند ڕۆژێك لەمەوبەر لێم پرسی:

"ئاغا ڕەجەب، دەموچاوی ئەو ئافرەتەت نەهاتەوە یاد کە بە مۆدێل بۆ ئاغات دادەنیشت؟".

-بۆ نا.. ئاغا.

-زۆر چاکە، دەتوانیت پێم بڵێیت شێوەی چۆن بووە؟

-بەڵیٚ!

واقم وڕما و لێم پرسی: "چۆنە وا کتوپڕ دەموچاویت بیرکەوتەوە؟"

لە وەڵامدا وتی: "چونکە چەند ڕۆژێك لەمەوبەر هات بۆ ئێرە".

-ئەوە تۆ دەڵێیت چی، ئاغا ڕەجەب؟ ئیشی چی بوو؟

-هاتبوو بۆ تەماشای تابلۆکان.

-کەی هات؟

-دوانیوەڕۆی ڕۆژی پێنج شەممە.

-ئەی باشە بۆ بە منت نەوت؟!

-نا.. ئاغا؟ دەتەوێ چی بکەیت؟ بە جوانی نازانم، هەر لە خۆمەوە بێم و لە هاتنی ئافرەتێك ئاگادارتان بکەمەوە کە ویستوویەتی تابلۆکانی مامۆستا ببینێت.

هەفتەکانی دوایی کە تەواوی ڕۆژەکان مۆزەخانەی قوتابخانەکەمان بۆ بینەران کرابووەوە، لە هۆڵەکە دادەنیشتم و بە ئاغا ڕەجەبم گوتبوو هەر ئەوەندە ئافرەتە نەناسەکە هات ئاگادارم بکاتەوە. بەڵام نەهات. ئەو ڕۆژە سەیری تەواوی کارتی هاتنە ژوورەوەی بینەرەکانم کرد. پانزدە ئافرەت هاتبوون. پێنجیان بە تەنیا هاتبوون و ناوی هیچیان لە ناوی ئەو خانمە نەدەچوو کە ئاشنای مامۆستا بووە؟

لەو ڕۆژە بەدواوە دەفتەرێکم ڕێکخست و ناوی هامشۆکەرانی مۆزەخانەکەم تۆمار کرد و هەروەها ناوی ئەو پێنج ئافرەتەم لەبەر کرد کە بە تەنیا هاتبوون.. تەنها یەکێکیان هەر ناوی خۆی نووسیوە و ناوی خانەوادەکەیانی نەنووسیوە. ناوی ئەو ئافرەتەش "فەرەنگیس"ە.

لە پڕێکدا برووسکەیەك دای لە مێشکم. ئافرەتە نەناسەکە ڕۆژی پێنج شەممە 7ی بەفرانبار هاتووە، 7ی بەفرانباریساڵی 1938یش ڕۆژی مەرگی مامۆستایە.

ئاخرییەکەی ئافرەتە نەناسەکەم دۆزییەوە و، پێی ئاشنا بووم.

سالانێکی زۆر بەسەر مەرگی مامۆستادا تێدەپەڕێت، کۆمەڵێك نیگارکێشی لاو لــە فەرەنگــەوە هاتوونەتــەوە و قوتابخانــەیان تــەواو کــردووە. تــا ڕادەیــەکیش نیگارکێشی بووەتە یەکێك لە هۆیەکانی نان پەیداکردن. هــەن خــەریکی وێنــەی پڕوپاگەندەی بازرگــانین، یــان دیکــۆری شــانۆ دەکێشــن، وێنــە و نەخشــی کتێــب دەکەن،وێنەی خەڵکی دەکــەن و کاریکــاتێر بــۆ ڕۆژنامــەکان دەنــێرن. هــەندێ لــە قوتابییەکانی پێشووی مامۆستا و زۆربەی زۆری لە فــەرەنگ گــەڕاوەکان خۆیــان لافی مامۆستایی لێ دەدەن و پیشانگا دەکەنەوە، لە زانکۆش کۆلیژێکی هونەری کراوەتــەوە و دەتوانــرێ بگوتــرێ وا خەریکــە وردەوردە مامۆســتا لــەبیر دەکــرێ. ئێستاکێ من دەتوانم بیرەوەرییەکانی خۆم دەربارەی ئەو نیگارکێشە هونەرمەند و ئینسانە گەورەیە بڵاوبکەمەوە کە گیانی خۆی کردە قوربانی هونەر و ئــابڕووی خۆی و هاونیشتمانەکانی. لە سالانی پاش خەرمانانندا، نووسین دەربارەی ژیانی مامۆستا بووە بە جۆرە نانپەیداکردنێك، هەرکەسێك چی بە قەڵەمەکەیدا دەهات دەینووسی.

شــتی ســەیر ســەیریان دەربــارەی ژیــانی دەگێڕایــەوە. تەنانــەت یــەکێك لــەو نووسەرانە بێشەرمیی گەیشتە ڕادەیەك کە نووسیبووی گوایە ماوەی سێ ساڵی

ڕێك لەگەڵ مامۆستادا کە لە تاراوگە بووە نامەیان بۆ یەکتر نووسیوە و، هەرچی نهێنییەکانی ژیانی هەیە لای ئەم درکاندوویەتی.

ئەو شتانەی بڵاودەکرانەوە جگە لە شتی پڕوپووچ چی دی نەبوون، ئێستا ئەو چیرۆکە بێسەروبەرانە برەویان نەماوە و خەریکە ڕووداوە گرنگەکانی ژیانی ئەو و بەسەرهاتەکانی و ئەو هەوڵانەی کە بۆ وریاکردنەوەی خەڵکی دەیدا و قۆناغەکانی گیانبازیی بە گوێی خەڵك دەگات.

من ڕێ بە خۆم نادەم بڵێم ئاگاداری ورد و درشتی نەبەردەکەی مامۆستام لەگەڵ هێزە ئەهریمەنییە چەوسێنەرەکاندا، بەڵام هیچ نەبێت هەوڵ دەدەم پەی بە ڕۆح و کونجە پەنهانەکانی دڵی بەرم کە سەرچاوەی گەورەیی و بێگەردی و لە هەمان کاتدا لاوازیی ئەوە. هیچ نەبێت دەتوانم بڵێم کە مامۆستا ماکان نیگارکێشێکی گەورە بووە، تەنها لەبەرئەوەی کە باوەڕی بە کارەکەی خۆی هەبووە و دڵنیاش بووە لەوەی کە دەتوانرێ لە ڕێی هونەری نیگارکێشانەوە دژ بە ستەم و ئازادیکوژی خەبات بکرێ. ئەو بە تەنها هونەرمەند نەبوو، بەڵکو هونەرمەندێکی گەورە بوو، چونکە ئینسان بوو و مەینەتیی کەسانی تریش دەبووە مایەی کەسەر بۆی.

من ئێستا لە کونجێکی قوتابخانەکەی مامۆستادا دانیشتووم و چەند ناوی دەهێنرێ، لای من ئەوەندە گەورەتر دەبێت. بەلای منەوە ئەم قوتابخانەیە وەکو پەرستگایەکی لێهاتووە و لەو ڕۆژەوە ی ئاغا ڕەجەب کۆچی دوایی کردووە؛ من خۆم بە سەرپەرشتیاری ئەم حەرەمە دەزانم.

ئێستاکە خەریکی ڕێکخستنی بیرەورییەکانم؛ وێنەیەکی مامۆستام لەبەردەمدایە کە یەکێك لە قوتابییەکانی پاش مردنی کردوویەتی.

دەموچاوێکی درێژ، تەوێڵێکی بڵند. دوو ڕوومەتی بەرز، لووتێکی شکستە، چاوەکان درشت و تیژ، برۆکانی کەوانی، چەناگەیەکی پان و لە خوارەوە قوت، چاویلکەیەکی چوارچێوە ڕەش لە چاودا و، نیگاکەی وا پیشان دەدات کە ئەگەر لە شتێك ورد ببێتەوە؛ دەڵێی دەیەوێت بە مقاشێك دەمارەکان لەنێو گۆشت و

پێست و ئێسقانەکاندا دەربهێنێت. لە نیگایدا ناسکترین ژێیەکانی ڕۆحی ئینسانی دەکەونە لەرزە. تەماشای دەکرد و شتی دەبینی. ئەوەی بەسەر هەمووواندا تێدەپەڕی، ئەو دەیبینی. لە کارەکانیدا ئەمە دیارە. ئەوەی لە سروشتی خەڵکی ئێراندا پەنهانە، ئەو بە ڕووتی پیشانی دەدا. ئەو وێنەیەی کە نیگارکێشەکە کێشاویێتی بە وێنەیەکی ئەسڵیی خۆی بەراورد دەکەم، لە وێنەکەدا زەردەخەنەیەك بە دەوری لێوەکانیدا باڵەفڕێیەتی، زەردەخەنەیەکی دروستکراو نییە، بەڵکو زەردەخەنەیەکە ڕاستگۆ، نیشانەی تاڵیی ژەهرێکە کە ژیانی ئەو و خەڵکانی دەوروبەری ژاراوی دەکرد. ئەم زەردەخەنەیە هەمیشە لە دەوری لێو و چاویدا لانەی خۆی کردووە. نیگارکێشەکەش هەوڵی داوە ئەم زەردەخەنەیەی پیشان بدات، بەبێ ئەوەی لە هێڵەکانی دەموچاویدا نیشانەی زەردەخەنە دەربکەوێت. بەڵام چەند جیاوازە لەو زەردەخەنە سروشتییەی کە لە وێنە ئەسڵییەکەیدا بەدی دەکرێ. ئەم زەردەخەنەیە زادەی شادی نییە. ئەم زەردەخەنەیە ئەوە ناگەیەنێت کە مامۆستا لە ژیانیدا بەرخوردار بووە، ئەم زەردەخەنەیە لەوپەڕی دڵگرانییەوەیە، وەك ئەوەی مامۆستا ویستبێتی بڵێت، ئەم ژیانە چەند شیرینە، دەتوانرێ چەند شیرینتریش بکرێ، ئەفسووس کە ئێمە تاڵییەکەی دەچێژین. لەگەڵ ئەوەشدا، نیگارکێشە لاوەکە ویستوویەتی بە پێی بۆچوونی خۆی مامۆستا پیشان بدات. ویستوویەتی مرۆڤێکی پڕ نهێنی و ئارام پیشان بدات، تەنها ئەو لایەنەی مامۆستای خستووەتە ڕوو کە هەموو دەیزانن، بەڵام ئای چەند جیاوازی لە نێوان ئەم مامۆستایە و ئەو مامۆستایەدا هەیە کە ئافرەتە نەناسەکە بە منی ناساند. قوتابییەکەی مامۆستا لەم وێنەیەدا کە ئێستا لەبەر دەممدایە شتێکی ئەوتۆی نەگوتووە زیاتر لەوەی کە من گوتوومە. کابرایەکی بە ئیرادە بووە، خوێنی دڵی خۆی خواردۆتەوە، ئارام و نهێنی پۆش، هاوڕێیەتی کەسی نەدەکرد، گۆشەگیر بوو، لە پیاوە گەورەکان و تەڵەکە بازەکانی سەردەم و لەوانە کە نانیان بە نرخی ڕۆژ دەخوارد، لەوانەش کە جگە لە تێرکردنی ورگ و لەشیان هیچ ئامانجێکی دیکەیان لە ژیاندا نەبوو، بێزار بوو. بەرگەی

بینینـی سـەروپۆتەڵاكی ئەوانـەی نـەدەگرت. لەهـەر كـۆڕ و كۆبوونەوەیـەكدا كـە ئەوانـەی تێدا بووایـە؛ لـە پڕێكدا هەڵدەسـتا و بـەبێ ئـەوەی داوای لێبوردنیـان لێ بكات، دەڕۆیشت.بـەڵام لـە هـەمان كاتدا هاوڕێ و دۆستی هـەمووان بـوو. وەختـێ هەسـتی بـە بێگـەردی و ڕاسـتگۆیی بەرامبەرەكـەی بكردایـە، لـە نـاخی دڵـەوە دەگەشایەوە، هاوبەشی مەینـەتییان بـوو، دەیتوانـی خـۆی بخاتـە ئاسـتیانەوە و ببێتـە دۆستی میهرەبانیان، كۆمـەكی دەكـردن و خـەمیانی دەخـوارد. هـەر كەسـێ بچووبایەتـە ماڵی، ڕێزی لێ دەنا، چەندان كاژێری كاتی گرانبـەهای خـۆی لەگـەڵ خەڵكانێكی سادەدا بەسەر دەبرد. بە جۆرێك هەموو خۆیـان بـە هاوڕێی هاوگیـانی ئەو دەزانی. لە شوێنی خۆشیدا قورس بـوو. گـەر هـەزار جار كەسێك بچووبایەتە دیدەنیی، تا خۆشینەویستبایە بۆ دیدەنیی نەدەچووەوە.

بـەبێ هەست بەخۆگـەورە زانین و شانازیكردن ئیرادەی بەسـەر هـەمووان‌دا زاڵ دەبوو. نـەدەچووە ژێـر باری كەسـەوە. تـا بـە نـاخی شتێكی نەبینایـە دڵـی خـۆی نەدەدایـەو لێـی سـارد نـەدەبووەوە. هەمیشـە بایـەخی بــە شـیكی و ڕێكوپێكـی ئـەندامی دەدا، كارگـا هونەرییەكـەی مـەكۆی جـەنجاڵی بـوو، هـەموو بـەمجۆرە دەیانناسی و نیگاركێشەكەش هەر بەمجۆرە كێشاویەتی. بەڵام ئافرەتـە نەناسـەكە سەبارەت بە توانای بەرەنگاری و هێمنیی ئەو بەسەرهاتی زۆر پێیە.. دەبێ ئـەو ئافرەتە دەربارەی ئەم لایەنەی ژیانی ئەو بدوێت.

من ئەم ئافرەتە بە نەناس لە قەڵەم دەدەم چونكـە خۆشی دەڵێت كە تا ئێستا كەس ئەوی نەناسیوە. با ئەم هەقەی بدەینێ. ئاشناییم لەگەڵ ئەم ئافرەتەدا سەیر بوو، بەلای ئەوەوە سەیر بوو ئەگینا من لای خۆمەوە ورد ڕەنگرێژیم بۆ كردبوو.

چـەند سـاڵێك لەسـەر یـەك دەسـتوورم دەدا كـە ڕۆژی 7ی بـەفرانبار دەرگـای مۆزەخانەكـەی قوتابخانـە دابخـەن، خۆشـم لــە نووسـینگەی قوتابخانەكـەدا دادەنیشـتم و چـاودێریم دەكردتـابزانم كـێ لـەم ڕۆژە مێژووییـەدا بـۆ دیدەنیـی مۆزەخانەكە دێت، مـن خۆشم تاقە چاودێری قوتابخانەكـەم. ئـەم قوتابخانەیـەی مامۆستا یەكێكە لـەو دائیرە میریانـەی كە بودجـەی بـۆ تـەرخان كـراوە. مانگانـە

مۆڵێك پارە بۆ قوتابیانی ئەم فێرگەیە خەرج دەكرێ. لەم سیانزە ساڵەی دواییدا، واتە لە كاتی دوورخستنەوەی مامۆستاوە بۆ كەلات، نزیكەی چەندان ملیۆن تمەن لەم قوتابخانەیەدا خەرج كراوە و تا ئێستا سیانزە هونەرمەندی پێنەگەیاندووە. بەڵام بە لایەنی كەمەوە هەزار و سێ سەد قوتابی لێی دەرچووە كە بڕوانامەی بەكالۆریۆسی هونەرە جوانەكانیان پێدراوە و لە دائیرەكانی میریدا كار دەكەن، هەر لە دائیرەی كان و كانزاوە بگرە تا بانقی كشتوكاڵی و پیشە و هونەر خەریكی پینەوپەڕۆكردنی كاروبارن، بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە دەرامەتێكی باشی هەیە. هەر وەزیرێك كە دەگۆڕێت بەڕێوەبەرێكی تر لە قوتابخانەكە دادەنێت، هەر لەبەرئەمە بە لایەنی كەمەوە قوتابخانەكەمان ساڵی دوو بەڕێوەبەر بە خۆیەوە دەبینێت، بەڵام دە ساڵ دەبێت كە هەر من چاودێریم، بۆیە ئەوەندە دەسەڵاتم هەیە كە ڕۆژانی 7ی بەفرانبار مۆزەخانەكە دابخەم، جارێك بەو بیانووەی كە پێویستە هۆڵەكەی پاك بكرێتەوە و، جارێكی دی بەو بیانووەی كە ساپیتەكەی دڵۆپە دەكات و، جارێكی تریش بەو بیانووەی كە خۆم ناساغم.

سێ چوار ساڵ تێپەڕی و كەس نەهات. ئافرەتە نەناسەكە نەهات تا ڕۆژی 7ی بەفرانباری ئەمساڵ. ئێستا پانزە ساڵ بەسەر ڕۆژی مەرگی مامۆستادا تێدەپەڕێت. ڕۆژی 7ی بەفرانبار دەستوورم پێیان دا دەرگای هۆڵی مۆزەخانەكە دابخەن، خۆشم لە نووسینگەكە دانیشتم. لە پەنجەرەی ژوورەكەوە دەمتوانی چاوم بە هامشۆكەران بكەوێت، سەعات چوارونیوی پاشنیوەڕۆ بوو، قوتابییەكان قوتابخانەیان جێدەهێشت. زۆربەشیان ڕۆیشتبوون، ئۆتۆمبیلێكی جوان لەبەر دەرگای قوتابخانەكەدا وەستا. ئەو ئافرەتەی كە ئۆتۆمبیلەكەی لێدەخوڕی لێی هاتە خوارێ.

ئافرەتێكی باڵاوەنجی، ڕەشپۆش، سەنگین و گوڵئەندام، هاتە حەساری قوتابخانەكە و ویستی ڕووە و هۆڵەكە بڕوات، كە چەند هەنگاوێك نزیك بووەوە و تەماشایەكی كرد، سەری سوڕما، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر هەنگاونانەكەی بەردەوام بوو، لە یەكێك لەو قوتابیانەی كە بە پێپلیكانەكاندا دەهاتە خوارێ

شتێکی پرسی، یەکسەر پەنجەرەی ژوورەکەمم کردەوە و پرسیم: "خانم، چ فەرمایشێکتان هەبوو؟".

دڵم کەوتبووە تەپەتەپ. بە زۆر بەسەر خۆمدا زاڵ بووم، هەستم دەکرد ئەو شتەی سالأنێکە چاوەڕێیم وا خەریکە ڕوودەدات. دەتگوت مژدەم بە خۆم دەدا: دۆزیمەوە، خاوەنی چاوەکانم دۆزیەوە، ئەمە ئەو چاوانەیە کە بوونەتە سەرچاوەی عەزابی مامۆستام، بەلأم هێشتا چاوەکانیشیم نەبینیبوو.

خانمە شیکەکە بە بیستنی دەنگی من ڕاچەنی، سەری بەرزکردەوە، بەو چاوانەی کە هەرگیز پڕ نهێنی و دڵڕفێن نەبوون نیگایەکی منی کرد.

زەردەخەنەکەی وەك هەتاوی بەهارێك کە دەدات لە بەفری سەر کێوەکان ئاوەها شادیی بە دڵ دەبەخشی. بەلأم وەختێ هەمان زەردەخەنە دووبارە دەبووەوە، ئینسان هەستی دەکرد ساختەیە. بە دەنگێکی پڕ سۆز و ڕێزەوە وتی "ببەخشە ئاغا، بۆ تەماشای مۆزەخانەکە هاتبووم".

ویستم هەر لە پەنجەرەکەوە وەلأمی بدەمەوە و ڕەوانەی بکەم، چونکە دەنگەکە زۆر سادە و ئاسایی بوو. من ئەو ئافرەتەم بە جۆرێکی دی دەبینی، بەلأم ڕێز و سۆزەکەی دەنگی وای لێکردم ئەوە نەکەم، جگە لەوە دوودڵیی مرۆڤ لە ژیاندا دووچاری شتی سەیری دەکات.

–فەرموون وەرنە نووسینگەکە تا لێرە قسە بکەین.

هات، ئاخ، بریا ئاغا ڕەجەب ئێستا زیندوو دەبوو، نەیدەتوانی ئەمەیانم لێ بشارێتەوە، زۆر بێشەرمانە لەبەرچاوی خانم خۆیدا لێم دەپرسی: ئایا ئەمە هەمان ئەو ئافرەتە نییە کە بە مۆدێل دادەنیشت؟ بەلأم خۆ گەر ئەم ئافرەتە قەشەنگ و سەلار و سەنگینەش بووبێت؛ دەبێ بەڵگەیەك هەبێت، فەڕاشەکە خانمەکەی بۆ ژوورەکەم هێنا.

هەر ئەوەندە هاتە ژوورەوە، وەکو کەسێك کە سالأنێکە من دەناسێت و یان یەکێك کە هەموو خەڵکی بە کەس و خزمی خۆی دەزانێت زۆر ساکارانە و بە گەرمییەوە وتی: "ئاغا فەڕاشەکەشتان گۆڕاوە.." لێرەدا نەمتوانی بەسەر خۆمدا

زاڵ بم. ڕەنگ لە ڕووم پەڕی. یەکسەر دڵنیابووم لەوەی کە ئەم ئافرەتە بەدرۆ پێدەکەنێت. هەر قسەیەکی دەکرد بە دوایدا بەرز پێدەکەنی. لە هەمان کاتدا پێکەنینەکەی دڵڕفێن بوو.

پرسیم: "کوا فەڕاشەکەمان گۆڕاوە؟ غولام سێ ساڵ و چەند مانگێك دەبێ کە لێرە فەڕاشە".

بە هەمان ئاوازی شیرین و پڕ ڕێزەوە و، بە هەمان زەردەخەنەی ساختەوە وتی:

"سەیرە، دەشێ من بەهەڵەدا چووبم".

ئەم ئافرەتە لە نواندندا کارامە بوو، هەر لە یەکەم ساتەوە هەستم کرد کە ئافرەتێکی ئاسایی نییە، لە پڕێکدا گەرچی بۆ چەند ساتێکیش بێت دڵنیا بووم کە خۆیەتی. تاوێك لە چاوەکانی ورد بوومەوە، هیچ لێکچوونێك لە نێوان ئەم چاوانە و چاوەکانی تابلۆکەدا نەبوو. بەڵام ناوچەوان و دەم و لێو و زوڵفە ڕەش و لوتە ڕێکەکەی لەوانەی تابلۆکە دەچوون. دیاربوو کە زەبری ڕۆژگار ئەم دەم و لێوەی پیر کردووە، دانەکانی خشت و سپی بوون و هەر ئەو دان و لێوە تەنکانەشی بوون زەردەخەنەکەیان دڵڕفێن دەکرد. ئەم ئافرەتە زۆر باش دەیزانی کە بە زەردەخەنەکەی چۆن کار لە خەڵکی دەکات. پاڵتۆیەکی فراوانی مۆدی ئەو ڕۆژەی لەبەردا بوو. پاڵتۆکە ڕەش بوو، ئێخە و ملوانە ئاوریشمییە سوورەکەشی وای کردبوو، دەموچاوی ئافرەتەکە پرشنگدارتر بنوێنێت. بەری سووری پاڵتۆکە دەبریسکایەوە و بە جۆرێك کە لە دووریشەوە هەست بە نەرمونیانییەکەی دەکرا. قۆپچەکانی پاڵتۆکە کرابوونەوە. جانتا ڕەشەکەشی کردبووە قۆڵی و دەستی لە قایشە سوورە بریقەدارەکەی کەمەری گیرکردبوو، کە لەسەر کراسە ڕەشەکەی بەستبووی. قاچەکانی ڕێك و پووزەکانی پڕ بوون.

دڵنیا بووم کە دەبێت زۆر وەستایانە لەگەڵ ئەم ئافرەتەدا بجووڵێمەوە؛ ئەگینا دەڕوات و منی بێچارەش دەبێ سەرلەنوێ خوێنی دڵی خۆم بخۆمەوە. ئەوەی مامۆستا کێشاوێتی هیچ و، منیش دەبێ ئاگری چاوەڕوانی بمسووتێنێ.

وتم: "بەڕێزتان هاتبوون تا تەماشای مۆزەخانەکە بکەن؟".

–بەڵی زۆرم حەز دەکرد ببینم.

–بەڵام بە داخەوە ئەمڕۆ مۆزەخانەکە داخراوە. بە هۆی ئەو بەفروبارانەی ئەم چەند ڕۆژەی دواییەوە ساپیتەکە دڵۆپە دەکات و جا بۆ ئەوەی ئەزێت بە تابلۆکان نەگات بۆ ماوەی هەفتەیەك مۆزەخانەکەم داخستووە؛ تا بە تەواوی ساپیتەکە چاك دەکەینەوە، ئەوسا سەرلەنوێ دەرگا بۆ هەمووان دەخرێتە سەرپشت.

–کەواتە مۆزەخانەکە لەژێر چاودێریی جەنابتاندایە و ئەگەر حەزبکەن دەتوانن ئیجازە بفەرموون تا ببینم.

–بێگومان دەتوانم. بەڵام خانم، خۆتان دەزانن شتەکە کارێکی ئیدارییە و بەرپرسیاریی تێدایە.

هێندە بە نەرمی و شیرینی وەڵامی دامەوە کە ناچاری کردم ڕام بێم و چەند پتر پێم دادەگرت ئەو نەرمتر دەبوو. من ئەگەر بە تەواوەتی دڵنیا دەبووم کە ئەم خانمە قەشەنگە هەمان خانمی نەناسی خاوەن چاوەکانە، بێگومان خۆم بە دەستەوە نەدەدا و ناچارم دەکرد کە زیاتر تکام لێ بکات، تا دەمهێنایە سەر بار و دەکەوتە سەر ئەژنۆ. هەستم دەکرد کە ئەم ئافرەتە مامۆستای ناسیوە. لە هەمان کاتدا دوودڵیش بووم. دەبووایە کەسێتی و ئیرادەی خۆمم بە سەریدا بسەپاندایە، بەڵام خەوشەکەم لەوەدا بوو کە نیگەرانی ڕێی لێ دەگرتم و ناچار بووم دەست بە دارەوە بڕۆم. چەندەها جار خۆزگەم خواست کە ئاغا ڕەجەب زیندوو بوایە و هیچ نەبوایە گەر بۆ تەنها جارێکیش بووایە وەڵامێکی ڕاست و ڕەوانی پرسیارێکمی بدابایەتەوە.

پێی وتم: "دەتوانرێ ڕۆتیناتی کاری ئیداری بشکێنرێ، جگەلەوە من لەسەر سەفەرم و ئەگەر ئەمڕۆ ئەو تابلۆیانە نەبینم ئیدی بوارم نابێت".

ئەمە هەڕەشە نەبوو، ئەم ئافرەتە بە بۆنەی تێپەڕبوونی 15 ساڵ بەسەر ڕۆژی مەرگی مامۆستادا بۆ تەماشاکردنی کارەکانی هاتبوو. بەڵام من ئەوەم بە هەڕەشە

لە قەڵەم دا و گیرتر بووم: "دەتوانم تکا لە خانم بکەم کە ڕۆژێکی تر بۆ ئێرە بفەرموون؟".

-نەخێر، ئاغا، ئەو تکایە مەکەن.. ناتوانم.

ئافرەتە نەناسەکە ڕاچەنی. زەردەخەنەکەی سەرلێوی گۆڕا بە خەم، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند. سەری ڕاوەشاند. سەرلەنوێ زەردەخەنە سیمای ڕۆشن کردەوە و دانە سپییە خشتەکانی خستەڕوو.

وتم "بۆچی؟ دیارە ئەمڕۆ ڕۆژێکی تایبەتییە؟".

-نەخێر..ئەمڕۆ ڕۆژێکی تایبەتی نییە. بەڵام حەزم دەکرد ئەمڕۆ کارەکانی مامۆستام ببینیایە.

خەریك بوو بێ ئومێد دەبوو،ئەوەندەی نەمابوو بڕوات. ئەم هەلەم قۆستەوە و پرسیم: "دەتوانم داوا لە خانم بکەم خۆیانم پێ بناسێنن؟ من چاودێری ئەم قوتابخانەیەم".

-ئاغا، چ کارێکتان بە من هەیە؟ من هەرکەسێك بم داواتان لێ دەکەم ئیجازە بفەرموون کە ئەمڕۆ تەماشای کارەکان بکەم، چونکە دەرفەتی ترم نابێت. زۆر سوپاسیشتان دەکەم.

-دیارە خانم خۆشی هونەرمەندە. لەوە دەچێت خۆشتان نیگارکێش بن، هەڵبەتە لەم حاڵەتەدا دەتوانین ئاسانکارییەك بکەین، گەرچی ئیجازەدان بە بەڕێزتان.. هەرکەسێك بن.. لە سەرئێشە خاڵی نییە، بەڵام هەمیشە دەتوانین بیانووش بدۆزینەوە. بۆ نموونە بەو بیانووەی کە باری خراپی هۆڵەکەتان پیشان ئەدەم، دەتوانم فەرمان بدەم دەرگاکەی بکەنەوە. کە حەزم کرد خۆتان بناسێنن؛ مەبەستم ئەوە بوو، ئەگینا من دەتوانم چی بکەم؟ من لەم مۆزەخانەیە بەرپرسیارم و خۆشم دەوێ. ئەگەر بزانم پێشنیازی ئێوە دەگاتە بەرچاوی کاربەدەستان کە هیمەتێك بکەن ساختومانی نوێی ئەم قوتابخانەیە زوو تەواو بکرێ؛ ئەوا ئامادەم لە ئێستاوە تا سبەی بەیانی دەرگای هۆڵەکەتان بۆ بخەمە سەر گازی پشت. جگە

لە هەموو ئەم شتانەش هەر کەسێك بۆ تەماشاکردنی مۆزەخانەکە دێت، دەبێ لە پێشدا ئیجازە لە نووسینگەی قوتابخانە وەربگرێت.

وا بزانم دڵی بە حاڵم سووتا، بە چاوی بەزەییەوە نیگایەکی کردم، وەك ئەوەی قسەکانی من کاریان لێکردبێت، یان دەشێ ئەو زمانە ڕەسمییەی من بەزەیی ئەوی وروژاندبێت.

لە ناکاودا شتێکی سەیر ڕووی دا، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە مێژە چاوەڕوانیم، لەگەڵ ئەوەشدا کە سالآنێکە خۆم بۆ ئەم ڕێکەوتە ئامادە کردووە؛ کەچی بە لامەوە هەر سەیر بوو، پێی وتم: "ناوم فەرەنگیسە". ئێستا ئەگەر تکاتان لێ بکەم کە ئیجازە بفەرموون ئەمڕۆ تەنها نیو سەعات تەماشای مۆزەخانەکە بکەم و بڕۆم، هەمدیسان داواکەم ڕەت دەکەنەوە؟ من نە هونەرمەندم و نە نیگارکێش و نە ڕۆژنامەنووس. بەلآم زۆر حەز دەکەم ئەمڕۆ ئەو تابلۆیانە ببینم".

شتە سەیرەکە ئەو قسانە نەبوو کە کردنی، شێوەی گوتنەکەشی نەبوو، ئەوەش نەبوو کە "فەرەنگیس" بێ ناوهێنانی خانەوادەکە، ناوی هەمان ئەو ئافرەتە بوو کە پێنج ساڵ لەمەوبەر ڕۆژی حەوتەمی بەفرانبار هات بۆ دیدەنیی پێشانگەکە و ئەوەبوو دوای چەند ڕۆژێك ئاغا ڕەجەب پێی وتم کە لە هۆڵەکەدا بینیویەتی. نەخێر، من دڵنیابووم کە ئەم ئافرەتە خۆیەتی. لەنێو پێنج ئافرەتدا کە پێنج ساڵ لەمەوبەر ڕۆژی 7ی بەفرانبار هاتبوون، یەکێکیان ناوی "فەرەنگیس" بوو و ئەویش ناوی خانەوادەکەی خۆی نەنووسیبوو. من سەرژمێری تەواوی بینەرەکانم لەبەردەستدا بوو، لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەدا چەند جارێك کچان و ژنانی "فەرەنگیس" ناو هاتوون، بەلآم هەموو ئەمانە لەگەڵ ناوی خۆیاندا ناوی خانەوادەکەشیان دەنووسی. لەگەڵ هەمووشیاندا قسەم کردبوو. بە چ تاسەیەکەوە گوێم بۆ قسەکانیان شل دەکرد. بەلآم ئەو سیفەتەی کە دەبوایە لە ئافرەتە نەناسەکەدا هەبووایە، واتە نیگای بڕندەی چاوەکانی، لەم کچ و ژنانەدا نەبوو، تەنها یەك فەرەنگیس بێئەوەی ناوی خانەوادەکەی بنووسێت، پێنج ساڵ لەمەوبەر لەم ڕۆژەدا هاتبوو کە 7ی بەفرانبارەو وا لە هەمان ڕۆژدا و پاش

تێپەڕبوونی پانزە ساڵ بەسەر مەرگی مامۆستادا سەرلەنوێ هاتۆتەوە، بەم نیگایەشەوە! هیچ گومانێکم نەما کە ئەم ئافرەتە خۆیەتی. هەمان ئەو جانانەیە یا فریشتەیەیە کە سەری مامۆستای خواردووە، یان ماوەیەك بەختەوەری کردووە. هەر لەبەرئەمە هەقی خۆم بوو زیاتر پێ دابگرم و ئەو ڕۆژە ڕێی نەدەم کارەکان ببینێت تا هەمدیسان بێتەوە و بکەوێتە سەر ئەژنۆ و خۆی بە دەستەوە بدات و هەموو ئەو نهێنییانەم بۆ ئاشکرا بکات کە لام بوونەتە مایەی پرسیار.

بەلام وەك وتم ناکاو شتێکی سەیر ڕوویدا، وەختێ وتی: "ئەگەر تکاتان لێ بکەم.." چاوەکانی حاڵەتێکی سەیریان بەخۆوە گرت.. نازانم بڵێم چ حاڵەتێك بوو، تکا بوو؟ پاڕانەوە بوو؟ دەیویست دڵی من بکا بە ئاو؟ دەیویست بەو چاوە فریودەرانەی بمخرۆشێنێت؟ ناتوانم حاڵەتی چاوەکانی ڕوون بکەمەوە. هەستم کرد هێزێکی قورس خەریکە دڵم لە جێی خۆی هەڵدەتەکێنێت. ترسام، شڵەژام، دووچاری حاڵێکی کردم کە باس ناکرێ. دەتوانم تەنها ئەوەندە بڵێم کە حاڵەتی چاوەکانی لە حاڵەتی چاوەکانی تابلۆکە دەچوو، زۆر حەزم کرد هەر ئەو ساتە خۆم بە هەڵەداوان بچم و تەماشای چاوەکانی تابلۆکە بکەم، چۆکم دا، من چۆکم دا، منێك کە وام هەست دەکرد وشك بوومەتەوە و بوومەتە مۆمیا، منێك کە جگە لە کاری ئیداری و مامۆستایی بیر لە هیچی دی ناکەمەوە، من لە ئاست ئەم ئافرەتە نەناسەدا ئەژنۆم شکا. نیگای چاوەکانی سیحری لە منیش کرد.

بۆ چەند ساتێك تووڕەیی لە ناخمدا گینگڵی پێدام، پاشان شتێك لە دڵمدا توایەوە. گرێیەك کرایەوە و زامێك دەمی کردەوە و، خوێنی لێ ڕژا. خاو بوومەوە، ئینجا ناسیمەوە. بە خۆمم گوت: "دەبێ چ ئازارێکی بەدەست ئەم ئافرەتەوە چەشتبێت؟!".

ئێستا کە خەریکم بیرەوەرییەکانی ڕۆژانی ڕابردوو دەنووسمەوە، ئەم خەیالاتانەم دێتەوە یاد. لەو ساتەدا هیچ دەسەلاتێکم نەما و ئەو، ئەم ئافرەتە فریودەرە، یەکسەر پەی بەو هەستەم برد و پاشەکشێی کرد تا بڕوات. منیش ڕاستەوخۆ بەرەو لای دەرگاکە چووم و کردمەوە. ڕووە و دالانەکە هاوارم کرد:

"غولام، وەرە ئەو دەرگایە بکەرەوە!" ئافرەتە نەناسەکە، لە نزیك مێزەکەوە لەسەر کورسییەك دانیشت، تەماشایەکم کرد، وەختێ غولام هاتە ژوورەوە، چووەوە سەر مێزی نووسینگەکە و کلیلەکەم دەرهێنا و دامە دەستی و پێم وت: "هۆڵەکە ساردە، وانییە، ئەمڕۆ ئاگرت نەکردۆتەوە!"

–نەخێر، خۆتان فەرمووتان.

–سۆپا نەوتییەکە هەڵ بکە، لای دەرگای هۆڵەکەوە دایبنێ تا ئێمە دێین.

فەرەنگیس هەلێکی قۆستەوە تا تەماشایەکی ئارایشتەکەی خۆی بکات، جانتاکەی کردەوە، ئاوێنەیەکی لێ دەرهێنا. سەیرێکی دەموچاوی خۆی کرد، بە دەسڕێکی ئاوریشم گۆشەی لێوەکانی پاك کردەوە، ئاوێنەکەی خستەوە ناو جانتا سوورەکەی دەستی و تەماشای منی کرد، ئینجا کەوتە قسەکردن. باسی ساختومانی مۆزەخانەکەی کرد، باسی ئەوەی کرد کە هاوڕێی هونەرناس و هونەرپەروەری لە دەزگا دەوڵەتییەکاندا زۆرە. سەرۆکی کۆمپانیای مافوور چنین زۆر ڕێزی لێ دەگرێت. بەڕێوەبەری گشتیی وەزارەتی ڕۆشنبیری لە هاوڕێیانی پۆکەرێتی، هەر پێشنیارێکیش بکات یاریدەری سەرۆك وەزیران خۆی دەیخوێنێتەوە، بەڵام بە کورتی ئەمانە کاری باشیان لێ ناوەشێتەوە، ئەمانە بابایەکن دەیانەوێت لەم دنیایەدا چەند ڕۆژێك بە خۆشی بگوزەرێنن. شەریکی دزو هاویاری قاڤڵەن. هەریەکە و بۆ خۆی لێ دەدات و کەس بە کەس نییە، بەڵام ئەم ئافرەتێکی تەنها و بێکەسە، نرخ و بەهای ئەم مۆزەخانەیەی لایە و دەزانێت کە دەبێ چۆن چاودێریی مۆزەخانەیەکی نیگارکێشان بکرێ ، لە جیاتی جارێك چەندین جار مۆزەخانەکانی ئەورووپای بینیوە. ئامادەشە تەواوی تابلۆکانی بکڕێ‌و خۆشی ساختومانیان بۆ دروست بکات، پاشان دەربارەی وەزیری ڕۆشنبیری قسەی کرد و وتی کە کابرایەکی خراپ نییە، بەڵام هێندەی گوێرەکەیەك سەری لە هونەر دەرناچێت.

ئەم ئافرەتە یەکریزە دەدوا و قسەکانیشی دەربارەی شتیکی دیاریکراو نەبوون، سەبارەت بە هەموو شتیك دەدوا و باسی ورد و درشتی دەکرد، ئینجا

لەمەڕ هاوسەرەکەی وەزیری ڕۆشنبیرییەوە قسەی کرد و، زۆر شتی دەربارەی کچەکەی دەزانی. من گوێم بۆ ئەو قسانەی نەدەگرت، هەر لە یەکەم ساتەوە ڕقم لێی هەڵگرت. بە دوژمنی خۆم دەزانی، بە بکوژی مامۆستام دەزانی. بەڵام نەشمدەویست ڕقەکەم پێوە دیار بێت، دەمویست تۆڵەی خۆم لەم ئافرەتە دڵڕەقە بکەمەوە. تەماشای دەکردم، ئایا دەیویست دڵ و ڕۆحم لەت و پەت بکات؟

لەژێر چاوەوە چاودێریی هەڵسوکەوتیم دەکرد، هەر ئەوەندە هەستم دەکرد سەیرم دەکات، یەکسەر خۆم بە شتێکەوە خەریك دەکرد، وەختێ هەستی کرد من زۆر بایەخ بە قسەکانی نادەم، پێڵوەکانی چاوی ترووکاند. بە دیوارەکەوە، لە ژوور سەری منەوە تابلۆیەکی مامۆستا هەڵواسرابوو، فەرەنگیس جار جار سەیرێکی دەکرد و بە دەم سەیرکردنیشەوە هەر دەدوا. بە دەستە چەپدا،بەرامبەر پەنجەرەکە چەند کاشییەك بە دیوارەکەوە بوو کە مامۆستا نەخشەیانی کێشابوو. کە یەکێك بۆ نووسینگەی قوتابخانەکە دەهات، لە پێشدا ماوەیەك لە وێنەکەی مامۆستا ورد دەبووەوە، پاشان ڕەنگی شین و درەوشاوەی کاشییەکان سەرنجی ڕادەکێشا.. ئافرەتە نەناسەکە ئەوەندە لە کاشییەکان ورد نەبووەوە، دەتگوت زۆری بینیون. پاشان ڕووی وەرگێڕا و تەماشای درەختێکی کاژی جوانی کرد کە بەفر پۆشیبووی، لەگەڵ ئەوەشدا لە قسە نەدەکەوت، لەسەر کورسییەکە هەڵسا و چاوی بڕییە درەختەکە، منیش ئەم هەلەم قۆستەوە تا بە تەواوی لێی وردببمەوە، دەموچاوی لە لاوە زۆر جوان بوو، لەوە دەچوو تەمەنی چل ساڵێك بێت، بەژنوباڵا ڕێك.

هەمدیسان لەژێر پاڵتۆ گەورەکەیەوە، دەستەکانی لە کەمەری گیر کرد، پەنجەکانی درێژ و شمشاڵی بوون، پێستی سپی و ئاڵی پەنجەکانی نەرمونیان دەهاتە پێشچاو. هیچ نیشانەیەکی پیری بە دەموچاوییەوە دیار نەبوو، تەنها ئەوەیە مرۆڤ کە لووت و لێوی بە وەی تابلۆکەی "چاوەکانی" بەراورد دەکرد هەستی بە جۆرە جیاوازییەك دەکرد، زوڵفەکانیشی کە درێژ بوون تا ئاستی خەتی لێوی خاو بوو، لەوێشەوە تا سەر شانەکانی شەپۆل شەپۆل هاتبوونە

خوار. قژی ڕەشێکی قەترانی بوو، لە چوارچێوەیەکی ڕەش دەچوو کە پێستە سپییەکەی سپیتر پیشان دەدا. تاقە خەتێك لە نێوچەوانیدا دەبینرا، دەم و لێو و نێوچەوانی تەعبیریان لە هیچ حاڵەتێك نەدەکرد؛ بەڵام چاوەکانی.. تەنانەت لەباری ئاساییاندا خەماوی خۆیان دەنواند.

بۆ چەند ساتێك بێدەنگی باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا. من هەر بیرم لەوە دەکردەوە چۆن ئەم ئافرەتە بهێنمە قسە، بەڵام قسەی بێسەروبەر نا، بەڵکو قسەیەك کە تامەزرۆی گوێگرتنیم، نەك قسەیەك کە دەیەوێت منی پێ هەڵخەڵەتێنێت.

لە دڵی خۆمدا بیرم لەوە دەکردەوە دەبێ چۆنچۆنی لەگەڵ ئەم ئافرەتەدا ڕەفتار بکەم، ئایا دەبێ بە نەرمی لەگەڵیدا بجووڵێمەوە، بە تکا و پاڕانەوە لێی نزیك بمەوە، یان دەبێ بە شێوازێکی توندوتیژ ئەم ئافرەتە خۆ بەگەورەزانە بهێنرێتە سەربار؟ تەنانەت بێدەنگییەکەشی پڕمانا بوو.ئێستاش دەیویست یاریم لەگەڵدا بکات، دوای ئەوەی بە نیگاکانی سیحری لێکردم . وەختێ غوڵامم بانگ کرد تا دەرگای هۆڵەکە بکاتەوە؛ دەبووایە بە جۆرێك لە جۆران سوپاسی بکردمایە. ئەم ئافرەتە زۆر بە چاوی خۆیەوە دەنازێت، هەر بەم تەلیسمەش ئەفسوونی لە مامۆستا کردووە و ئەوەتانێ ئێستاش لەگەڵ مندا بە نیازی خۆی گەیشت.

بەهەرحاڵ من لەمێژ بوو خۆم بۆ مامۆستا تەرخان کردبوو. لە پێناوی ئەوەشدا ئامادە بووم بەرگەی هەموو جۆرە سووکایەتییەك بگرم، ئامادە بووم بیست ساڵی تریش لە پشتی ئەم مێزەوە دانیشم و چاودێرێکی ئاسایی بم؛ تەنها بە ئومێدی ئەوەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم ئافرەتە ببینم. لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەتوانی دەربەستی هیچ نەیەم.

ڕەنگە فەرەنگیسیش داخی ئەوە لێی دابێت کە لە پێناوی داوایەکی بچووکدا ناچار بوو دوا چەکی و بڕندە ترینیان کە لە دەستیدا بووە لەگەڵمدا بەکاربهێنێت‌و، بە نیگاکانی من ڕام بکات. لەوانەشە هێشتا ئەم ئافرەتە نەهاتبووبێتەوە سەر خۆی و بۆ ئەوەی خۆی لەدەست نەدات هێمنییەکی

ساختەی پیشان دەدا و بێباکانە خۆی دەنواند، بەهەرحاڵ ئەو بە مەبەستی خۆی گەیشتبوو و ئینجا نۆرەی من بوو کە ئەم دەرفەتە لەدەست نەدەم و ئەم ئافرەتە بهێنمە قسە. لەسەر ئەم شتە سوور بووم، ڕۆحم هاتبووە سەر لێوم و ئەگەر نەهێنیی ئەو تابلۆیەم نەدۆزیبایەتەوە، ئەمڕۆ بوایە یا سبەی؛ لە داخاندا تەقم دەکرد. ناکاو چەخماخەیەك لە مێشکمی دا. ئیتر دەرفەتی ئەوەم نەبوو لەوە زیاتر بیر لە سوود و زیانی نەخشەکەم بکەمەوە. لەسەر مێزەکە هەڵسام. لە دەرگاکە نزیك بوومەوە. دەسکی دەرگاکەم گرت و وتم: "ئیجازە دەفەرموون سەرێك لە پۆلەکان بدەم؟ جاری وایە قوتابییەکان لە پۆلەکاندا دەمێننەوە و ئەوەش پێچەوانەی دەستوور و فەرمانەکانە.. دەچم لە پۆلەکان دەریاندەکەم و یەکسەر دەگەڕێمەوە و بە یەکەوە بۆ هۆڵی مۆزەخانەکە دەچین؟".

–زۆرتان پێ دەچێت ئاغا؟ نابێ ئیجازە بفەرموون من لەگەڵ فەڕاشەکەدا بچم؟ تۆسقاڵێك سەبری نەمابوو، تۆسقاڵێك منیشی بەلاوە گرنگ نەبوو.

–نەخێر، خانم. یەکەم دەبێ من خۆم لە خزمەتتاندا بم، جگە لەوەش هەمووی پێنج دەقیقەم پێ ناچێت.

ئەمەم وت و دەرگاکەم کردەوە و چوومە دەرێ.

بەهەڵەداوان بەرەو هۆڵی مۆزەخانەکە چووم، غولام دەرگاکەی کردبووەوە و لە تەنیشتەوە چاوەڕێی من بوو. پێم وت: "غولام، ئیتر تۆ پێویست ناکات چاوەڕێ بیت، بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە، من خۆم دەرگاکە دادەخەم و کلیلی دەرگای ساختومانەکە دەدەمە دەست پاسەوانی قوتابخانەکە، بڕۆ گیانەکەم".

هەر ئەوەندە غولام بە پێپلیکانەکاندا چووە خوارەوە، خۆم کرد بە هۆڵی مۆزەخانەکەدا. گڵۆپەکەی داگیرسابوو، بە تاسووقێکەوە کە هەرگیز لە خۆمدا شکم نەبردبوو ڕووەو تابلۆی "چاوەکانی" ڕۆیشتم. دەتوت یەکەمجارە ئەم تابلۆیە دەبینم، دەتوت سالانێکی زۆرە ناویم بەرگوێ کەتووە و کۆپییەکانیم بینیوە، بەلام هەرگیز چاوم بە تابلۆکە خۆی نەکەوتووە. دەتوت سەرلەنوێ لاو بوومەتەوە و لە یەکەم ژووانی ئەو ئافرەتەدام کە دەیەوێت خۆی فڕێبداتە

ئامێزمەوە. ئیدی چاوەکان بەلای منەوە مانایان بەخۆوە گرتبوو. چاوەکان هێزیان لەبەر منیش بڕی. تاوێك لێیان وردبوومەوە، تەواوی کارەساتەکەی ژیانی مامۆستا هاتە بەرچاوم. دەبێ پشتی ئەم ئافرەتە بدرێ لە ئەرز. تەماشای تابلۆکەم دەکرد و بیرم لە پیلانەکەی خۆم دەکردەوە. گڵۆپەکەم کوژاندەوە تاوەکو لە دەرەوە کەس نەزانێت چی دەکەم. دەرگای عەمبارەکەم کردەوە و تابلۆکەم لە جێیەکەی خۆی هەڵگرت و لەسەر مێزەکە دامنا و دەستێکم بەسەر چاوەکاندا هێنا، وەك بڵێی بەدەستلێدان زیاتر هەستیان پێ دەکەم و چێژیان لێ دەبینم. هەستم بە تۆزێکی ورد کرد کە لەسەر تابلۆکە نیشتبوو، بە دەسڕێك تۆزەکەم سڕی. تابلۆکەم بەرزکردەوە و بە هەردوو دەستم کردمە سەر سەرم و بۆ عەمبارەکەم برد. تابلۆکە قورس بوو، منیش لاواز، هەستم دەکرد خەریکە لەژێر قورساییەکەیدا دەچەمێمەوە، بە هەناسەبڕکێ گەڕامەوە بۆ هۆڵەکە، تاوێك لەسەر کورسییەك دانیشتم، ئارەقەکەی دەموچاوم سڕی، چوومەوە بۆ نووسینگەکە و وتم:

"فەرموون خانم با پێکەوە بچین بۆ هۆڵەکە".

لەسەر کورسییەك دانیشتبوو؛ تەماشای وێنەکەی مامۆستای دەکرد. هەر ئەوەندە گوێی لە دەنگم بوو، هەڵسایە سەرپێ. دەستی دایە جانتاکەی کە لەسەر ئەژنۆی دانابوو، کردییە قۆڵی و وتی: "سوپاس، ئاغا" لای دەرگاکە وەستا، وەختێ فەرەنگیس هاتە دەرەوە دەرگاکەم جووت کرد و بە کلیل دامخست. فەرەنگیسیش چاوەڕێی نەکرد تا من ڕێگاکەی نیشان بدەم، دیاربوو کە خۆی شارەزای ڕێگاکەیە. بە پێپلیکانەکاندا سەرکەوت و منیش بە دوایدا. لای دەرگای هۆڵەکە وەستا. دەرگاکەم کردەوە و چووە ژوورەوە. دەرگاکەم داخستەوە و گڵۆپەکانی هۆڵەکەم داگیرساند. هەر ئەوەندە هۆڵەکە ڕووناك بووەوە، چاوم بڕییە دەموچاوی. شوێنی تابلۆی "چاوەکانی" بە دیوارەکەی بەرامبەر پەنجەرەکەوە خاڵی بوو، ناکاو لەبەر ڕووناکیی گڵۆپەکاندا هەستم کرد کەموکووڕییەك هەیە. بەڵام فەرەنگیس هەستی بەوە نەکرد. یان لەوانەیە هێشتا بەوەی نەزانیبێت.

چونکە من لە شتێك دڵنیا بووم، ئەویش ئەوەیە کە: ئەم ئافرەتە زۆر وت وریایە و ئەوەندە کارامەشە کە بە ئاسانی دەتوانێت چۆن بیەوێت ئاوەها خۆی پیشان بدات. گەر پێویست بکات، دەتوانێت بە تاقە نیگایەکی چاوەکانی، بە جوولەیەکی لێوی، و بە یەك چرچیی نیوچەوانی خۆی وا بنوێنێ کە میهرەبان و هەستناسكو شەیدا و وریایە. زۆر کەسی بە لێوخەندێك فریو داوە. لەوانەیە ویستبێتی وا پیشان بدات کە هیچ شتێك سەرنجی ڕانەکێشاوە، بەڵام یەکسەر هەستم کرد کە هۆڵەکە بەبێ تابلۆی "چاوەکانی" وەك ئەوەی هیچ کارێکی مامۆستای تێدا نەبێ ئاوەهایە. چوومە ناوەڕاستی هۆڵەکەوە و لای سۆپا نەوتییەکەوە وەستام و ئافرەتەکەم خستە ژێر چاودێریی خۆمەوە.

فەرەنگیس لە دەستە ڕاستەوە دەستی بە تەماشای تابلۆکانی مامۆستا کرد. من لە ناوەڕاستدا وەستابووم، ئەو بۆ هەر کوییەك دەچوو من وەردەچەرخام و چاودێریم دەکرد. بەرامبەر هەندێك لە تابلۆکان تۆزێك دەمایەوە، بەسەر هەندێکی تریاندا تێدەپەڕی. ئەم ئافرەتە بینەرێکی ئاسایی نەبوو، نەشیدەویست وەك هونەرمەندێك خۆی پیشانبدات. لە خۆمم دەپرسی کە بۆچی بۆ ئێرە هاتووە.. ئەمە چ حەزێکە؟ من هەمیشە لە پشتەوە دەمبینی، بەرەو کوێ دەچوو، منیش ڕووە و ئەوێ وەردەچەرخام. نەمدەویست ئیتر سەیری چاوەکانی ئەم ئافرەتە بکەم، سڵم لە نیگاکانی دەکردەوە. دەمویست لە پشتەوە و دوور لە کەوتنە ژێر کاریگەریی ئەفسوونی چاو و جوانیی ڕوخسارییەوە، چاودێریی جووڵەکانی بکەم.

هونەرمەند نەدەهاتە پێشچاو، بەڵام وەك ئەوانەش نەدەبینرا کە بە سەرسوڕمان و دەم داچەقینەوە تەماشای تابلۆکان دەکەن.

بەسەر هەندێ لە تابلۆکاندا تێدەپەڕی، جاری وابوو دەمایەوە و ڕادەما، ئینجا ناکاو بە چەند هەنگاوێکی خێرا بەرەو تابلۆیەکەی دی دەچوو. دەتگوت بە تەواوی تابلۆکان ئاشنا بووە و لەهەر یەکێکیاندا شتێکی دەدۆزییەوە کە خۆشیویستووە. لەو ساتەوەی کە هاتە نووسینگەکە، یەکەم جار بوو ئەم ئافرەتە

دەمی بچێتە کلیلە. تۆ بڵێی هونەرەکەی مامۆستا کاری لێ کردبێت؟ یان بیرەوەرییەکانی ڕابردووی یان هەردووکیان؟

من وەك ئەو فەرماندەیەی کە پلانێکی داناوە و ئێستا تا تۆزێکی دی چاوەڕێی هەواڵی سەرکەوتنە، نیگەران بووم و دڵم کەوتبووە پەلەپەل. بەڵام دڵنیاش بووم لەوەی کە بە مەبەستی خۆم دەگەم. ڕقم هەڵسابوو، بێئاگایانە لەگەڵ خۆمدا دەدوام، بە خۆمم دەوت: "بایەخ بە من نادەیت و بێدەربەستیت؟. هیچ حسابێك بۆ من ناکەیت؟ ئاسمان و ڕێسمانم بۆ دەهۆنیتەوە؟ بۆ ئینسانێك کە لەم ژیانەدا منەتی لە هیچ کەس نییە و هەر لەبەر ئەمەش زمانی درێژە؟ بۆ ئینسانێك کە دیوانەی مامۆستایە؟ ئینسانێك کە چەندەها شەو خەوی بە چاوەکانی تۆوە بینیوە؟ منێك کە هەر لە یەکەم نیگاتەوە لێت تێگەیشتم و زانیم لەگەڵ کێدا بەرەو ڕوو بوومەتەوە؟ دەبا ئێستا بزانم کێ ناچار دەبێت بە زمانی شیرین قسە بکات؟ با بزانم کێ دەکەوێتە تکا و پاڕانەوە؟ دڵنیابە سیحری چاوەکانت هەر یەکەم جار بڕی کرد. ڕۆی.. من لە خەفڵەتدا بووم. ڕاستە توانیت کار لە یەکێکی وەکو مامۆستا بکەیت، بەڵام ئینجا دەبێ بە حەزی من بکەیت.

لە گەیشتن بە مەرام دڵنیا بووم. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا خۆرەی دوودڵی دەستی لە لەش و گیانم هەڵنەدەگرت و ژێیەکانی ڕۆحمیان دەکرۆشت. دەترسام نەبادا ئەم ئافرەتە بۆ ئەوەی خۆی ئاشکرا نەکات، هەر ناوی تابلۆی "چاوەکانی"یش نەهێنێت؟ ئەوسا مانای وایە من دۆڕاوم. ئەم ئافرەتە خۆویستە نەکات هەر بۆ ئەوەی نهێنییەکانی ژیانی ڕابردووی بشارێتەوە بە هیچ جۆرێك باسی ئەوتابلۆیە نەکات کە لە هۆڵەکەدا لابراوە؟ ئافرەتە نەناسەکە خەریك بوو لە شوێنی خاڵیی تابلۆکە نزیك دەبووەوە. دڵم زیاتر کەوتە پەلەپەل، بەڵام لە هەمانکاتدا بەسەرخۆمدا زاڵ دەبووم. بەلای منەوە مەسەلەی ئەم ئافرەتە مەسەلەی مەرگ و ژیان بوو.. سەرکەوتنم لە ژیانمدا بەسترابوو بەو سەرکەوتنەوە کە خەریك بوو چنگم دەکەوت. من ئەگەر نەتوانم نهێنییەکانی ژیانی مامۆستا بە خەڵکی ئێران بگەیەنم، ئیدی چ سوودێکم لە ژیانم بینیوە؟ ئەمڕۆ کە ڕۆژی هەوڵ و

تیکۆشانە، ئەگەر خەلکی ئیران بزانن کە مامۆستا چەند پرکیش بووە و چۆن تیکۆشاوە، ئەمرۆ ئەگەر ئەوە بزانن کە نیگارکیشی گەورەی ئیران چۆن لە هەمانکاتدا دەستی لە رووداوەکانی ولاّتەکەیدا هەبووە و چارەنووسی خۆشی بە چارەنووسی خەلکی ولاّتەکەیەوە بەستووەتەوە، بەلی ئەودەمە بە کەفوکولتر دەبن و پتر خۆیان لە قەرەی مەسەلەکان دەدەن و خۆرەی نائومیدی و بیدەربەستی کەمتر ناخیان دەخوا. پیویستە هونەرمەندەکان بزانن کە مامۆستای نیگارکیش لەسەر چی دوورخرایەوە. کەسیك لە رۆژگاری ستەمدا، کە رۆژگاریك بوو باوك بە ترسەوە لەگەل کورەکەی خۆیدا دەنووست، خۆی راگرت و دژ بە رژیم وەستایەوە، وا ئەمرۆ لە سای ئەو قوربانییانەی کە مامۆستاو نموونەکانی ئەو دایان، ئازادییەکی پتر هەیە لە بەردەمی هەموواندا و هەر مرۆڤە و ئەرکیکی لە ئەستۆدایە. بەلاّم ئەمە تاقە هۆی دلەراوکیکەم نەبوو. خۆپەرستییەکەشم رۆلیکی گرنگی هەبوو.

ئا..، ئەو دەمە کە لە هۆلی مۆزەخانەکەدا وەستابووم و بە چاو شوین ئافرەتە نەناسەکە کەوتبووم. شتەکان لە بەرچاومدا پەرشوبلاّو بوون، بەلاّم ئەمرۆ کە زۆر بە روونی ئەوە دەبینم، بەلیٚ؟ دەتوانم بلیم کە خۆپەرستییەکەشم رۆلیکی گرنگی هەبوو.

بەلاّم بەهەرحال من تاقە کەسیکیش بووم بتوانم پەردە لە رووی ژیانی پر چەرمەسەریی مامۆستا لادەم. من بە قوولی و وردییەوە لە تەواوی تابلۆکانی مامۆستام کۆلیبووەوە. تەواوی یاداشتەکانیو پەراویزی کتیبەکانیم خویندبووەوە.

کیٚ دەربارەی ئەو هونەرمەندە هیندەی من ئازاری چەشتبوو، خوینی دلی خۆی خواردبووەوە؟ کیٚ وەکو من مامۆستا دەناسیٚ؟ لە ژیانمدا چەند هەولم دا تا ببم بە هونەرمەند! بەدبەختانە نەمتوانی. هەر بۆیە ئیستا جگە لە خستنەرووی ژیانی مامۆستا چ ئامانجیکی ترم لەبەردەمدا نەماوە و کلیلی سەرکەوتنیشم لەم

کارەدا وا لەدەست ئەم ئافرەتەدا. من ئامادە بووم لە بەردەمیدا بکەومە سەر ئەژنۆ، دامێنی بگرم و تکای لێ بکەم داواکەم جێبەجێ بکات.

ئافرەتەکە گەیشتە شوێنی تابلۆی "چاوەکانی"، تەماشایەکی شوێنە خاڵییەکەی کرد و تێپەڕی، دوو جار گەڕایەوە، دەستی لە کەمەری هەڵگرت و سەرێکی بۆ دواوە وەرگێڕا، ناکاو لە جێی خۆیدا وشك بوو. سەری پەنجەی دا لەو تۆزەی کە چوارچێوەی تابلۆکە جێی هێشتبوو. سەیرێکی منی کرد، ڕەنگ لە ڕووی پەڕیبوو، چاوەکانی دەدرەوشانەوە، وەك ئەوەی بیەوێت بڵێت: دەتەوێ هەڵم بخەڵەتێنیت؟ چ فریوێکت لەژێر سەردایە، کوا تابلۆکە؟ بەلام من ڕووم وەرگێڕا. چاوەڕوان بوو قسەیەك بکەم، بەلام من لەگەڵیدا سارد بووم. دەستم گەرم دەکردەوە و تەماشای گڕی شینی سۆپاکەم دەکرد. ئەمە ساتی هەڵخلیسکانی بوو، دەبێ بیهێنمە قسە.

-ئاغای چاودێر، لەوە دەچێت شوێنی تابلۆیەك خاڵی بێت؟

-بەڵێ، خانم.. دەشێ.

-بۆچی تابلۆکانی مامۆستا لە هۆڵەکە دەبەنە دەرەوە؟

-بەڵێ، دەیبەن و جاری وایە ونیش دەبێت، یان دەفرۆشرێ.

-ئەم تابلۆیانە دەفرۆشن؟

-بۆنا.

-چۆن؟!!

سەبری لێ بڕابوو. بە ڕادەیەك پەشۆکابوو، ئەوەی لە دەموچاویدا پەنهان بوو ئاشکرا بوو، خەمبار هاتە پێشچاو، بەلام من سارد و بێدەربەست بووم.

-بۆ نا خانم، هەموو شتێك دەبێت. مامۆستا تابلۆی زۆرە، لەمانە زیاترە کە ئێستا ئێوە تەماشایان دەکەن، دەیانبەن و دەیانخۆن، کەس بە کەس نییە. بەهەرحاڵ تابلۆیەك زیاتر یا کەمتر بەلای دەوڵەتەوە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت.

-ئەم تابلۆیەی ئێرەیان فرۆشتووە؟

-ڕەنگە. لەوانەشە لای قوتابییەك بێت کە دەیەوێت نەقڵی بکات.

–بیرتانە کام تابلۆیەیە؟

–نەخێر بیرم نییە.

دیاربوو ئەم ئافرەتە مەبەستی تابلۆی "چاوەکانی" بوو و هەر ئەوەش هێنایە قسە. ڕووی لە من وەرگێڕا. سەرلەنوێ کەوتەوە تەماشاکردنی تابلۆکان. لە بەردەم تابلۆیەکدا، کە درێژییەکەی دوو مەتر و نیو و پانییەکەشی مەتر و شتێك بوو، وەستا. ئەم تابلۆیە یەکێك بوو لە کارە جوانەکانی مامۆستا. لە ناوەڕاستی تابلۆکەدا کابرایەکی چوارشانەی پۆشتە و پەرداخ دەبینرێ، بەرامبەر ئاوێنەیەك وەستاوە و کڵاوێکی لێوداری بە دەستەوەیە، دەموچاوە پان و پڕ چرچ و لۆچییەکەی لە ئاوێنەکەدا دیارە. پاڵتۆ درێژ و خاڵخاڵەکەی کابرا سێیەکی تابلۆکەی گرتووەتەوە. لای ئاوێنەکەشەوە، لەسەر مێزێکی بچووك داردەستێکی ئەستوور هەڵپەسێردراوە، جگەرەکەش لەسەر تەپڵەکەکە دووکەڵ دەکات. لای ڕاستەوە، ئافرەتێکی لاوازی چل و پێنج ساڵە دەبینرێ کە خەریکە لە ژوورێکەوە دێتە دەرێ. جلەکانی لەبەریا دەگرین.

سەروسیمای ئافرەتەکە دڵگیرە بەڵام خەمبارە، لەچکێکی ڕەشی بەستووە و لەژێر چەناگەیدا گرێی داوە، بەسەر لەچکەکەیدا کڵاوێکی فەرەنگیی ڕەشی ئافرەتانەی کردووەتە سەر. دیمەنی ئەم ئافرەتە بەو لەچك و کڵاوەوە بە ڕادەیەك پێکەنیناوییە کە ئەگەر مرۆڤ بە تەنها ئەم بەشەی تابلۆکە ببینێت پێکەنین دەیگرێت. وەك ئەوەی ئافرەتێکی سەر بەدەرەوە بێت و بیەوێت خۆی بنوێنێت. بەڵام گاڵتەجاڕی بە سیمای ئافرەتەکە خۆیەوە نابینرێ. ئافرەتەکە دەڵێی لە مۆم دروست کراوە و ئەوەندەی نەماوە بتوێتەوە و ببێ بە ئاو. لەژێر تابلۆکەدا و لەسەر چوارچێوەکە نووسراوە "جەژنی چارشێو لابردن" کاتێ بینەر ئەمە دەخوێنێتەوە؛ پێکەنینەکەی نامێنێت و کەمێك بیردەکاتەوە، ئەم کابرایە چەند دەربەستی ئەو جەژنە دێت. بەوپەڕی جیدییەوە خەریکە خۆی بۆ بۆنەیەکی گرنگ ئامادە دەکات. بەڵام بە سیمای ئافرەتەکەوە ترس و شڵەژان دەبینرێ، دەزانێ خەریکە خۆی بکاتە گاڵتەجاڕی خەڵکی، بەڵام چار چییە؟ دەبێ بڕوات، ئەمە

دەسـتوورە و دەبـێ هـەموو لـە جـەژنی چارشـێو لادانـدا بەشـداربن، دەبـێ هاوسەرەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بەرن. پیاوەکە ئەمەی زۆر بەلاوە ئاساییە.. دەبێ چی لەو چاوەڕێ بکرێ؟ بەڵام هەی بەسزمان ئافرەتەکە!

فـەرەنگیس ماوەیـەك بەرامبـەر ئـەم تابلۆیـە وەسـتا. هەسـتم کـرد ئافرەتـە نەناسـەکە پـەی بـە قووڵایـی ئـەو کارەساتە بـردووە کـە لـەم تابلۆیـەدا بەرجەسـتە کراوە. ئەو مەسەلەیەی کە ئەم تابلۆیە دەیخاتە ڕوو ئەوەیـە کـە بـەمجۆرە چارشێو لانادرێ. ئەم ئافرەتە سەرلەنوێ عەبا دەداتەوە بە سەریدا و گەر هەزار جاریش بۆ ئاهەنگی چارشێو لابردنی ببەن، خۆی لە ئەسڵدا چۆنە هەروا دەمێنێتەوە.

کارامەییەکی سەرسووڕهێنەر لە کێشانی سیمای پیاوەکەدا بەدی دەکرێ کە لە ئاوێنەکەدا دیارە. سیمایەکی ئارامی هەیە. هێشتا دەموچاوی ژنەکەی خۆی بـەو جلوبەرگـە تازەیـە و بـەو لـەچك و کـڵاوە فەرەنگییـەوە نـەبینیوە. ئافرەتەکـە هەست بە تەریقبوونەوە دەکات، شەرم دەکات بەو شێوەیە تەنانەت خۆی پیشانی مێردەکەشـی بـدات .دەڵێـی بـەنێو زەوییـەکی درکـاویدا ڕایدەکێشـن و ئـەوەتانێ هەست بـە ئازاری ئەو درکـە نـووك تیژانە دەکـات کـە لەشـی ڕووتـی قـاش قـاش دەکەن. بەڵام هێشتا هەر چاوەڕێی ئازارێکی زیاتریشە. فەرەنگیس پرسـی: "ئـەم ئافرەتە بۆچی لەژێر کڵاوە فەرەنگییەکەدا لەچکی بەستووە؟"

پێـم وت: "لـەبیرتان نییـە؟ دەسـتوور وابـوو کـە ئافرەتـان دەبـێ بـە کـڵاوی فەرەنگییـەوە بۆ ئاهەنگەکان بچـن، بـەڵام ئـەم ئافرەتـە نـەیتوانیوە مـووی سـپیی سەری بە بێگانە پیشان بدات. باش بڕوانە! لە ڕەفتە کۆنەکانە بەستوویەتی. تاکو هیچ نەبێت گەردن و مووە سپییەکانی بشارێتەوە".

فـەرەنگیس لـەو تابلۆیـەش تێپـەڕی، چـەند سـکێچێکی ئاغـا ڕەجـەب بـە دیوارەکەوە بوو، هەموویانم لە چوارچێوە گرتبوو. فەرەنگیس ڕووی تێکردم و من پێشدەسیم کرد و وتم: "خانم، ئەمە خزمەتکاری مامۆستا بووە".

–سەیرە!

ئەم "سەیرە"یە خەریکبوو وام لێ بکات بە سەریدا بتەقمەوە. خەریك بوو بڵێم: "تف لەوەی کە تەمسیل دەکات!" بەڵام خۆم ڕاگرت و لە دڵی خۆمدا وتم: "سەبر کە.. ئەم چارشێوە لەسەر ڕووی تۆش لادەچێت. هەر دەبێ بتهێنمە قسە!" ئینجا بە دەنگێکی بەرز وتم: "بەڵێ، خانم، ئەم تابلۆیانە هەر یەکە و بەسەرهاتی خۆی هەیە. هەر یەکەو پەردە لەسەر لایەنێك لە بیر و هەست و سۆز و قۆناغێکی ژیانی مامۆستا هەڵدەماڵێت. بە داخەوە کە ئێوە هەر ئەمڕۆ وەختتان هەیە و ئیدی ناتوانن بۆ دیدەنیی ئەم پێشانگایە بێنەوە. ئەگینا من بەوپەڕی پێخۆشحاڵییەوە ئامادە بووم هەندێ لایەنی تابلۆکانتان بۆ ڕوون بکەمەوە".

–زۆر سوپاسگوزار دەبووم، بەڵێ، هەروەکو فەرمووتان. من هەر ئەمڕۆ لە تارانم و سبەینێ دەبێ تاران جێ بهێڵم. من زۆر جار لە لە ڕۆژنامەکاندا شتم دەربارەی کارەکانی مامۆستا خوێندۆتەوە، بەڵام هەرگیز بواری ئەوەم نەبووە بێم بیانبینم.

هەمدیسان دەستی بە درۆ کردەوە، گەر جڵەویم نەگرتایە، وەك سوارچاکی مەیدان بە ئارەزووی خۆی دەهات و دەچوو. یەکسەر بە دوا قسەکەیدا وتم: "تا ئێستا هیچ کارێکی مامۆستاتان نەدیوە؟".

پرسیارەکەی من بە لای ئەوەوە شتێکی تازە بوو. لەبەرئەوە کەوتبووە نێو سێڵاوی زۆر وتنیشەوە، دەرفەتی بیرکردنەوەی نەبوو. ماوەیەك بێدەنگ بوو، بەڵام ئەم ئافرەتە خاوەن توانایەکی سەیر بوو و دەیتوانی چۆنی بوێت وا خۆی پیشان بدات و سەروسیمای خۆی بگۆڕێت. بەڵام هەمان ئەو ساتە بێدەنگییەی، هەمان ئەو لۆچییەی خستییە ناوچەوانییەوە، هەمان ئەو چاوانەی کە بچووکی کردنەوە، تێیانگەیاندم کە لە ناوەوە ئەو ئارامە نییە کە دەیەوێت وا پیشان بدات. بەهەر حاڵ نە لە قسە و نە لە زەردەخەنەکانیدا نەدەتوانرا شتێکی وا هەڵهێنجرێ. لە وەڵامدا وتی: "بۆ نا؟ چەند ساڵێك لەمەوبەر ڕۆژێك هاتم بۆ ئێرە، بەڵام زۆر سەرپێییانە تەماشای تابلۆکانم کرد، وابزانم چەند تابلۆیەکی تریش لێرە هەبوون.. دیارە نەماون".

-لەوە دەچێت تەنانەت سەروسیمای فەڕاشی قوتابخانەکەشمانت لەیاد مابێت. چونکە وەختێ هاتن، فەرمووتان کە فەڕاشەکەمان گۆڕاوە. ئەم تابلۆیەی کە ئێستا تەماشای دەکەن وێنەی ئەو ئاغا ڕەجەبەیە کە خزمەتکاری مامۆستا بوو و پاشانیش بوو بە فەڕاشی قوتابخانەکەمان. ئەو جارە کە بۆ ئێرە هاتن ئاغا ڕەجەب هێشتا مابوو و تاقە کەسێکیش کە تەواو ئاگاداری ژیانی مامۆستا بوو ئەو ئاغا ڕەجەبە بوو، ئەویش ڕۆیشت. چەند چرکەیەك بێدەنگ بووم و پاشان لەسەرخۆ وتم: "ئافرەتێکیش کە تا ئێستا نەزانراوە کێیە.."

وەختی ئەوە هاتبوو هەگبەکەم لە پاشماوەی تیرەکانم خاڵی بکەم. ڕێك ڕاوەستابووم و ئامادەی هێرش بووم، لەو ورد دەبوومەوە و هەوڵمدەدا هەست بە بچووکترین ڕاچەنینی ڕۆحی بکەم. ئافرەتەکە برۆکانی لێك نا، بە حاڵ دەمی کردەوە. دەیویست بە درۆ زەردەخەنە بخاتە سەر لێوی. زەردەخەنەکە بە لێوەکانییەوە وشك بوو. ئیدی نەیدەتوانی بە سووکییەوە سەیری من بکات و شتەکە بە گاڵتە وەربگرێت. بەڵام هێشتا بەسەر زمان و قسەکانی خۆیدا زاڵ بوو. وتی: "چیرۆکێکی چەند سەیرە! کەسیش ئەو ئافرەتە ناناسێت؟".

-جگە لە من کەسی تر ئەو ئافرەتە ناناسێت.

دەستم لەسەر سۆپاکە لابرد و لە یەکم خشاندن و هێدی هێدی بەرەو ڕووی فەرەنگیس ڕۆیشتم و چاوم بڕییە چاوەکانی. ڕەنگ لە ڕووم پەڕیبوو. ئەم جارە سیحری چاوەکانی من ئەوی گرت.

ئافرەتە نەناسەکە جارێکی دیکە هێزە لەدەستچووەکانی خۆی کۆکردەوە، قاقا پێکەنی، بەڵام پێکەنینەکەی ئەو زرنگانەوەیەی لە گوێمدا نەمابوو. خەریك بوو دەکشایەوە. لێم دەترسا، دەیویست لێم دووربکەوێتەوە. بەڵام هەنگاوەکانی من خێراتر بوون، دەیویست ئەو دەمامکەی بە دەموچاوییەوە نابوو نەکەوێت، بەڵام لە هەمانکاتدا سەرسامی بە چاوەکانییەوە دیاربوو.

-دەڵێن چی؟ تەنها ئێوە ئەو ئافرەتە دەناسن؟ لەوەوبەر بینیوتانە و ڕووبەڕوو لەگەڵیدا ڕاوەستاون؟

هەنگاوێکی تریش لێی نزیك بوومەوە، مەودای نێوانمان لە مەترێکیش کەمتر بوو. خەریکبوو چۆکی دادەدا. زۆر ورد و لەسەرخۆ، لە کاتێکدا دانم بە وشەکانیشدا دەنا پێم وت: "بەڵێ، ڕووبەڕوو لەگەڵیدا ڕاوەستاوم" هێندەی نەمابوو بڵێم: "ئەوەتانێ ئێستا ڕووبەڕووی ڕاوەستاوم" بەڵام سەیرم کرد هێشتا هەر بەسەر خۆیدا زاڵە، یان دەیویست زاڵ بێت، ڕووی لە من وەرگێڕا. دیسان کەوتەوە تەماشاکردنی تابلۆکان و داوی قسەکردنی گرتەوە دەست، دەیویست بابەتەکە بگۆڕێت. ئەو پرسیارەی کە لێشی کردم، ئەوەی گەیاند کە دووچاری شڵەژان بووە و دەیویست بزانێت کێ ئەو نهێنیەی ئاشکرا کردووە.

پرسیی: "خزمەتکارەکەی ئەو ئافرەتەی بە ئێوە ناساندووە؟".

-کەس ئەوی بە من نەناساندووە، من خۆم ئەوم ناسی.

-چەند دەبێ خزمەتکارەکەی مردووە؟

-سێ ساڵە. چی دارایی مامۆستاشە لە دەستی ئەودا بوو و ئەوی ماشەوە درا بە مناڵەکانی ئاغا ڕەجەب، هەندێ جار بۆ ئێرە دێن.

-ئەم تابلۆیانەش هەر موڵکی ئەوانە؟

-نەخێر، ئەمانە دەوڵەت کڕیونی. هیچی واشیان نەماوە و دەشێ تا چەند ساڵێکی تر ئەوەی ماویشە بفەوتێت. تەنانەت ئێستاش هەندێ لەم تابلۆیانە نەقڵن، قوتابییەکانی مامۆستا دێن و بە ناوی ئەوەوەی کە دەیانەوێت لەسەر ئەم تابلۆیانە نەقڵ بکەن، دەچن تابلۆ ئەسڵییەکە دەفرۆشن و نەقڵەکە دەگەڕێننەوە. کەسێکی وا شارەزاش نییە ئەسڵەکە لە نەقڵەکە جیابکاتەوە.

-مایەی داخە.

ئێستا وەختی بوو بڵێم: "سەیرە!" ئەم ئافرەتە نەناسە شتێك شك دەبات لەم دونیایەدا داخی بۆ بخوات.

تەماشایەکی کاتژمێرەکەم کرد. مەبەستم لەوە ئەوە بوو ئافرەتەکە وا بزانێت من پەلەمە و دەمەوێ هەرچی زووترە ڕەوانەی بکەم و بچم بە لای کاری خۆمەوە.

پرسیی: "ئاغای چاودێر، پەلەتانە؟".

ئامانجەکەم پێکا. ئەوەی مەبەستم بوو هاتە دی. نیگەران بووبوو. تۆزێك جڵەوم بۆ شل کرد.

هەرچۆنێك بێت تێگەیشت کە سەرە داوێکی گلۆڵەکە لە دەستی مندایە. با وا نەزانێت منیش گرفتاری بووم و دەتوانێ وەکو کەسانی دی ڕەفتارم لەگەڵدا بکات.

وتم: "نەخێر، خانم، پەلەم نییە، بەڵام هەرچۆنێك بێت مرۆڤ ناتوانێت کاروبارەکانی پشتگوێ بخات و نەچێت بە لایانەوە".

-ببەخشن! من زۆر دوام خستن.

سەرلەنوێ خۆی بە تەماشاکردنی تابلۆکانەوە خەریك کردەوە، هێشتا لە نیوەی هۆڵەکەدا بوو. پتر لە دوو سێ دەقیقە بەرامبەر تابلۆی "خانووی ڕەشوڕووتەکان" وەستا و لێی ڕاما. تا دوای ڕووداوەکانی مانگی خەرمانانیش لە عەمبارەکەدا بوو. زۆربەی هاوڕێ و دۆستەکانی مامۆستا ئەو تابلۆیەیان نەبینیبوو. سێ ساڵ لەوەوبەر لە مانگی خەرماناندا دەرمهێنا و خستمە چوارچێوەوە و هەڵمواسی. لەم تابلۆیەدا بە ئاشکرا ڕق و کینە و جاڕسیی مامۆستا دەردەکەوێت لە ئاست ئەو شتانەدا کە لە ڕۆژگاری دیکتاتۆریدا ڕوویاندەدا.

مامۆستا نیگاری خانوویەکی کێشاوە کە لە کەنار شەقامەکانی مازندەرانەوە، موڵکدارێتی نوێی ئەو پارێزگایە بە پارەی خەڵکی و "بۆ ڕەشوڕووتەکان"ی بینا کردووە. لە بەشی پشتەوەی تابلۆکە و لەبەر تریفەیەکی کزی مانگەشەودا تارمایی خانوویەکی لادێیی دەبینرێ. خانوویەکی تازە و ڕازاوەیە. بەڵام لە هەمانکاتدا لەبەر تیشکی ئەو شەوەدا شووم و ترسناك دێتە پێشچاو. بەسەر دوندی کێوەکەوە کە دارستانێکی چڕ پۆشیویەتی ڕۆشناییەکی کز هەست پێ دەکرێ کە سروشتی جوانی مازندەران دەهێنێتەوە یاد. مەرەزەکان لە تاریکیی شەودا درەوشاوە و شادیبەخش دێنە پێشچاو. لە بەشی پێشەوەی تابلۆکەدا لادێییەکی پیر و کوڕە لاوەکەی پێیەکانیان کە وەکو سەرە بزووت ڕەش و بۆرن

لەسەر ئاگرەکە گەرم دەکەنەوە. پیرەمێردەکە لەو ئۆخژنەی کە گەرمای ئاگرەکە پێی بەخشیوە سیمای پڕ ئازاری دەدرەوشێتەوە. بەڵام کوڕەکەی بە نیگایەکی ترسئامێزەوە دەڕوانێتە ئەوبەری تابلۆکە. پیرەژنێك گوریسێکی لە دەستدایە و گایەکی لاواز و نیوەگیانی بە زۆر پێ ڕادەکێشێت. گیانەوەرەکە بڕستی لێ بڕاوە و سەرمای سەرەتای بەهار خەریکە فەوتی دەکات. سەگێکی گەورەش کە لای ئاگرەکەوەو لەسەر زەوییەکە ڕاکشاوە، تۆزێك سەری بەرزکردووەتەوە، دەڵێی ئەویش چاوەڕوانی ئەو ڕووداوە ناخۆشەیە کە خەریکە ڕوودەدات.

فەرەنگیس چەند دەقیقەیەك تەماشای کرد و پاشان پتر لە تابلۆکەچووە دواوە تا باشتر ببینێت. هەر پشتاوپشت هات تا لە سۆپاکەی ناوەڕاستی هۆڵەکە نزیك بووەوە.

وتم: "خانم، وریابن بەسەر سۆپاکەدا نەکەون، ئاگادارن مامۆستا لەم تابلۆیەدا چی دەخاتە ڕوو؟".

–ئێوە بفەرموون.

زمانە شیرینەکەی خۆی بیرچووبووەوە. دیاربوو ترساندبووم.

–من حەزم دەکرد ئێوە بتانفەرمووایە چیی لێ حاڵی بوون.

–من شتێکی زۆری لێ حاڵی نەبووم.

–دەتانەوێ دەربارەی قسەتان بۆ بکەم؟

–تکا کارم.

–ئەمە خانووی ڕەشوڕووتەکانە. ڕایانسپاردبوون کە دەبێ خانووەکانیان هەمیشە پاکوتەمیز بێت، بە تایبەتیش سەرەتای بەهاران وەختێ شاهەنشا بۆ مازندەران دەچوو، هەموو ڕۆژێك کاربەدەستانی دائیرەی موڵکداری خانووەکانیان دەپشکنی کە نەبادا پیس و پۆخڵ بن. لەو گۆشەیەی تابلۆکەدا ئەو تەپۆڵکەیەی کە سەرنجی دەفەرموون داروپەردووی کوختی پێشوویانە.

گوندییەکان لەوێدا تەویلەیان بۆ گا و مەڕ و ماڵاتەکانیان دروست کردبوو و لە ترسی ئەوەی خانووە تازەکانیان پیس نەکەن، تەنانەت زستانان خۆشیان لەوێدا

دەیــانگوزەراند. ئێســتا هــەموو ڕۆژێــك چــاوەڕوانی هــاتنی شاهەنشــان. کاربەدەستانەکان هاتوون و کوختەکانیان ڕووخاندووە تا ئیتر نەچنە ئەوێ. چار نییە، جگە لەوەی کە دەبێ بچنە ئەو خانووە نوێیانەوە. بەهەرحاڵ ئەمە بووەتە هۆی ئـەوەی مەڕوماڵاتـەکانیان بـێ جـێ بمێنێتـەوە و ئـەوەتانێ ئـەو گیانـەوەرە خەریکـە لـەتاو سـەرما و بـێ جێیـی دەمرێـت، هـەر گۆشـەیەکی ئـەم تابلۆیـە سەرگوزەشـتەیەکە. لـە دەسـتە چـەپدا، لـە بەشـی پێشـەوەی تابلۆکـەدا، ڕووی خانوویەکی دیکە سەرنج ڕادەکێشێت. لە پەنجەرەی خانووەکەدا سەماوەرێك و دوو سێ لامپا دەبینرێ. تەماشاکە مامۆستا چراکانی چۆن بە باق و بریق پیشان داوە. گوایـە: لادێییـەکان لـە نـاز و نیعمـەتدان، ئـەم چرایانـە سـەرەتای بـەهار کاربەدەستانی موڵکداری بە بارمتە دەیاندەنێ، تا کاتێ شاهەنشا بەوێدا تێپەڕی بیـانبینێت. سـەرەتای بـەهاران وادەی کـار و ئاودێرییـە. لادێییـەکان دەبـێ بـە پێخاوسـی لـە مـەرەزەکاندا کاربکـەن، لـە ماڵـەوە هـۆی گەرمکردنـەوەیان نییـە، تەماشایەکی ئەو سەگە بە ئەمەکە بکە! ئـەویش سـەیری ئـەو پیرێژنـە لادێییـە دەکات کە لەوە دەچێت دایکی ئەو لاوە بێت، دەشێ سەگەکە بەر لە هەموویان پێشبینیی ئەو کارەساتەی کردبێت و خاوەنەکەی ئاگادار کردبێتەوە.

–ئاغای چاودێر، ئەم تابلۆیە ئەسڵە یان نەقڵە؟

–ئەم تابلۆیە ئەسڵە.

–ئێوە دەتوانن ئەسڵەکە لە نەقڵ جیابکەنەوە؟

–تا ڕادەیەك.

–ئەی باشە بۆچی وتتان کەس ناتوانێت؟

–من دەتوانم، بەڵام کارەکە هەمیشە لە دەستی مندا نییە.

–ئەی لە دەست کێدایە؟

–لـە دەسـتی بەڕێوەبـەری قوتابخانەکەدایـە، لـە دەسـت وەزیـر و جـەنابی بەڕێوەبەری گشتیدایە.

–ئەگەر کەسێك بیەوێت یەکێك لەم تابلۆ ئەسلانەی دەست بکەوێت، دەبێ بە کێ بڵێت؟

ئاهێك هاتەوە گیانم، خەریکبووین لە یەکدی نزیك دەبووینەوە. خەریکبووین لە نواندن دوور دەکەوتینەوە. فەرەنگیس هەستی کرد من دەتوانم یارمەتیی بدەم، ئەو نەخشەیەی کە زۆر بە پەلە کێشابووم، خەریکبوو ئەنجامێکی باشی بەدەست دەهێنا.

–ئەگەر ئەو کەسە کێ بێت خانم؟

–ئەگەر من بم؟

–ئێوە کێن؟

–من؟ ئافرەتێکم لە چەند ڕۆژێك زیاتر لە "تاران"دا نامێنمەوە. کەسیش شك نابەم لەم شارەدا. باوك و دایکم؛ هەردووکیان لە دەرەوەی ئێرانن و گەر ڕۆیشتیشم لەوانەیە ئیتر هەرگیز نەمبیننەوە.

–کام تابلۆیەتان دەوێت؟

–ئەو تابلۆیەی من دەمەوێ لە هۆڵەکەدا نییە.

–کام تابلۆیە؟

–جارێ پێم بڵێن؛ دەتوانن داخوازییەکەم بەجێ بێنن، تا منیش پێتان بڵێم کام تابلۆیەم دەوێت؟

–ئەمە بەوەوە بەستراوە کە ئایا ئێوە دەتوانن پاداشتم بدەنەوە یان نەء؟

–ئێوە ئەگەر تابلۆی "چاوەکانی" کە دەبوایە لەوێدا بووایە و لێی نییە بمدەنێ، من پێنج هەزار تمەنتان دەدەمێ.

بە هەموو ئەو وت ووریاییەوە کە خۆمم بۆ ئامادەکردبوو، سەرلەنوێ تێکەوتمەوە. چاوەڕێم نەدەکرد ئەم ئافرەتە ئاوەها بە پرکێشییەوە پێشنیازی دزێتیم بۆ بکات. چەند ساتێك دوودڵ بووم، ئەم چەند ساتە بەلای منەوە زەمانێك بوو، بێدەنگییەکەی من ئافرەتەکەی ترساند.

–من دەزانم ئێـوە ئـەم پارەیـەتان بـۆ خۆتـان نـاوێت. دەزانم دەبـێ بیـدەن بـە وەزیرو بەڕێوەبەری گشتی.

باشە بۆچی دەیویست دزێتی بخاتە پاڵم؟ لەبەرئەوەی وایدەزانی ئێرە بازاڕی دزانە و هەر كەسە و شتێكە و منیش دەستم لەم تاوانەدا هەیە؟ یان لەبەرئەوەی ترسا كە ئەگەر جارێكی تـر بـۆ ئـەم مۆزەخانەیـە بێتـەوە تاقـە تابلۆیـەكی تێـدا نابینێتەوە. یان پەیوەندیی بە تابلۆی "چاوەكانی"یەوە جورئەتی پـێ بەخشـی و دزێتیی دایە پاڵم و وەختێ زانیی كە دەتوانێت بۆ هەتاهەتایە ببێتـە خـاوەنی ئـەو تابلۆیـە بڕیـاری دا تـا زووە پـڕی پێــدا بكـات و بیباتــەوە بـۆ ماڵــەوە؟ بــەڵام چ جورئەتێكە؟ چۆن و لە كوێوە بێشەرمیی گەیشتە ئەو ڕادەیەی بیەوێت ئابڕووی من بە پێنج هەزار تمەن بكڕێت؟ تەنها پێنج هەزار تمەن؟ دە ساڵی ڕەبەقە من لـەم قوتابخانە وێرانەیەدا و لەسەر ئەم مێزە شڕە دانیشتووم و سەرباری هەموو ئەو دزە پسپۆڕانەی كە بە ناوی پشكنەری تایبەتی دارایی و بەڕێوەبەری وەزیرەوە بۆ ئێرە هاتوون، نەمهێشتووە لاپەڕەیەك كە بە خـەتی مامۆسـتا خـۆی نووسـرابێت ببرێتە دەرەوە، كەچی ئێستاش ئافرەتێك كە كەس نازانێت لە كوێوە هاتووە و ئەم پاڵتۆ گرانبەهایەی بەری و ئەو ئۆتۆمبیلەی ژێری چۆن پەیدا كردووە؛ هاتووە تا ئابڕووی من بە پێنج هـەزار تمـەن بكڕێت!! ئاخ، چەند حـەزم كرد ئـەم ئافرەتـە هەرزەیـە لـە قوتابخانەكە دەربكەم، چەند حـەزم دەكرد پێی بڵێم: خـانم، ماچێكم بدەرێ و تابلۆكە بەرە. نا.. ئەم ئافرەتـە سـەربەدەرەوەیە لـە مەبەسـتی مـن ناگـات، حەزم دەكرد پێی بڵێم: خانم، بۆ تەنها شەوێك لە باخەڵمدا بنوو ئەوسا تابلۆكە بـۆ خۆت.

لـە سـۆپاكە دووركەوتمـەوە، بـەرەو سـووچی هۆڵەكـە هـەنگاوم نـا، كـە ڕێـك ڕووبەڕووی ئەو و نزیك دیوارەكەی بەرامبەری بوو. مەودای نێوانمان هەر زۆر كەم بوو. ڕۆیشتم و لەسـەر مێزێكی بچووك كـە تایبـەت بـوو بـەو دەفتـەرەی لەسـەری دادەنری تا بینەران سەرنجی خۆیانی تیدا بنووسن، دانیشتم، قاچم خستە سـەر

قاچ، دەستم خستە ژێر چەناگەمەوە و چاوم برییە چاوەکانی. ڕەنگم پەڕیبوو. تەواوی هێز و توانای مانەویی خۆم کۆکردەوە.

–خانم تەنها پێنج هەزار تمەن؟

–ئێوە قایل بن ئەو تابلۆیەم بدەنێ، هەرچییەکتان بوێت دەتاندەمێ.

–هەرچییەکم بوێت، دەمدەنێ؟

چاوەکانی دەدرەوشانەوە.. تووڕە بوو؟ نازانم. من تەواوی تارەکانی ڕۆحی ئەم ئافرەتەم یەك بە یەك دەناسی. لە سەعاتێك پتر لەگەڵمدا نەبوو. بەڵام من سەروسیمای خۆم چەند دەناسی، ئەوەندەش بە لێو و دان و گۆنا و نێوچەوان و چەناگەی ئەو ئاشنا بووم. جاری وا بووە چەندان سەعات من لێیان ورد بوومەتەوە. ساڵانێك ڕۆژی چەندان جار دەمبینین. لای من نهێنی تەنها لە چاوەکاندا بوو. ئەو نیگا تووڕەیەم تەسەور نەدەکرد، ئەم نیگایە لەو نیگایە نەدەچوو کە نیو سەعات لەمەو پێش دڵی کردم بە ئاو. ئەمە نیگای گیانەوەرێکی برسی بوو. ڕەنگە مەبەستیشی بە سووکییەوە سەیرکردنی من بووبێت؟ بەڵام ئەم حالەتەی چاوەکانی لە چرکەیەك تینەپەڕی. یەکەم جار دەرکی بەو مانایەی قسەکەم نەکرد کە من دەمویست پێی بگات، بەڵام پاشان هەر ئەوەندەی چاوترووکانێك مانای ژێرەوەی قسەکە تێگەیشت.

بەرەو ڕووم هات و سەرلەنوێ بە ڕێز و میهرەبانییەوە گوتی: "چەند پارەتان بوێت دەتاندەمێ"

بەڵام من هەر سوور بووم لەسەر قسەکەی خۆم و هەمدیسان وتم: "هەرچییەکم بوێت دەمدەنێ؟"

ئەمجارەیان بە جۆرێك قسەکەم گوت خاڵی لە بێشەرمی. دەمویست گفتی لێ وەربگرم کە ئەو شتەی من دەمەوێ بمداتێ. ئەوم ترساند. بەڵام خۆشم هەر ترسابووم، بە هەنگاونانێکی خێراوە هات و لەبەردەممدا وەستا. بە تووڕەییەوە سەیری کردم، بە چاوەکانی دەیویست لە قووڵایی ڕۆحم بدات، من وامزانی هاتووە تا لێم بدات. هەڵسام و وەستام و چاوم بڕییە چاوەکانی.

ئەمجارەیان حاڵەتی چاوەکانی ڕێك هەمان حاڵەتی پڕنهێنی و پڕمانـای نـاو تابلۆکە بوو. ئێستا تێگەیشتم کە بۆچی چاوەکان لە تابلۆکەی مامۆستادا مانای جۆراوجۆر لەخۆ دەگرن، بۆچی جاری وایە مرۆڤ دەگرێنـن و جـاری واشـە لـە هەموو شتێك بێزاری دەکەن.

هەنگاوێکی تر هاتە پێشەوە و گوتـی: "بەڵی هەرچییـەکتان بوێ دەتاندەمـێ، بە مەرجێك بێشەرم نەبن".

—قبووڵمە. ناونیشانی ماڵەوەتانم بدەنێ. ئەمشەو تابلۆکەتان بۆ دەهێنم.

—ئەی بۆچی ناتانەوێ ئێستا پیشانم بدەن؟

—خۆ دەبێت سەواو مامەڵەکەمان بگاتە ئەنجام.

—ئەی بۆ ناتانەوێ ئێستا مامەڵەی لەسەر بکەین؟ لێرە تابلۆکەم پیشان بدەن.

—نابێ هـەمووی بـە ئـارەزووی ئێـوە بێـت. بـا جـارێك لـە ژیانتـاندا کابرایـەك ڕووبەڕووتان بێتەوە کە لە ئێوە بەهێزتر بێت. ئێوە وا نەزانن کە دەتوانن سومعە و ئابڕووی من بـە پێنـج هـەزار تمـەن دەکـڕن. مـن بـەڵێنتان دەدەمـێ کـە ئەمشـەو تابلۆکـەتان بۆ دەهێنـم بـۆ ماڵـەوە. یـەك پوولیشـم لێتـان نـاوێ. لـەوێ داواکـەی خۆمتان پێ دەڵێم.

—کەواتـە ببەخشـن! مـن دەڕۆم. چاوەڕێتـانم. هـەرکاتێ ویسـتتان بفـەرموون. تەنها ئەو ڕستەیەی لە دڵەوە و خاڵی لە درۆ وت. دۆڕابوو. بە سـەریدا زاڵ بووم، لەو ساتەوەی لەگەڵمدا بوو، ئەمە یەکەم جار بوو خودی خۆیم پێ نیشان بدات، من خومـاری سـەرکەوتن بووم، ئیـدی زمـان شیرینی بێسـوود بـوو، دەمامکەکـەی دەموچاوی کەوت و ڕووی ناشرین.. نا ڕووی ناشرین نەبوو.. ڕووی خۆی پیشـان دام.

ناونیشانی خانووەکـەیانی دامـێ. کـەوتبووە یـەکێك لـەو شـەقامانەی کـە لـە شەقامی پشت باڵیۆزخانەی ئینگلتەرەوە جیادەبنەوە.

تا دەرگای دەرەوە بەڕێم کرد، دەرگـای ئۆتۆمبیلەکـەم بـۆ کـردەوە و وەختـێ کەوتە جووڵە من بۆ ناو قوتابخانەکە گەڕامەوە.

ئیدی هیچ گومانێکم لا نەمابوو کە خۆیەتی، ئەم ئافرەتەش هیچ چارێکی نەبوو ئەوە نەبێت کە خودی خۆی، ڕۆحی خۆی، لەبەردەممدا ڕووت بکاتەوە.

چووم بۆ عەمبارەکە، تابلۆکەم دەرهێنا، بردم بۆ هۆڵەکە و تاوێك لەبەردەمیدا وەستام، ئیدی تابلۆکە لای من مانایەکی تایبەتیی بەخۆوە گرتبوو، کلیلی پەردە هەڵماڵین لەسەر نهێنیی ژیانی مامۆستا ماکان بوو. ئیدی سڵم لەو چاوانە نەدەکردەوە. بیرم کردەوە هەر نەچم بۆماڵیان. چونکە دڵنیا بووم گەر منیش نەڕۆشتمایە ئەو خۆی دەهاتەوە بۆ لام.

بەهەرحاڵ لەوە تێگەییبوو کە لەم دونیایەدا کەسێك هەیە پەی بە نهێنییەکانی ئەو بردووە، بەڵام سەرلەنوێ ڕام گۆڕی. نەبادا لەژێر دەسەڵاتی مندا نەمێنێت. نەبادا پاش خەوێکی حەوێنەر هەمدیسان بەسەر ئیرادەی خۆیدا زاڵ بێتەوە. بڕیاری ڕۆشتنم دا، دوو پارچە کەتانم هێنا، لەسەر کەتانەکەشەوە کاغەزم تێوە پێچا، ئینجا بە پەتی قەند بەستم و بە هەردوو دەستم تابلۆکەم هەڵگرت و خستمە سەر سەرم و بۆ نووسینگەکە چووم.

گەڕامەوە هۆڵی مۆزەخانەکە، سەیری شوێنە خاڵییەکەی تابلۆکەم کرد، گڵۆپەکەم کوژاندەوە، دەرگاکەم داخستەوە و هاتمەوە نووسینگەکە. دەرگاوانەکەم ڕاسپارد بچێت عەرەبانەیەکم بۆ بهێنێت. هیچ ڕێگایەکی دیم بۆ بردنی تابلۆکە

شك نەدەبرد. لە ئۆتۆمبێلدا جێی نەدەبووەوە. بردنە دەرەوەی تابلۆکە لە قوتابخانە شتێکی ئاسایی بوو. زۆر لە قوتابییەکان و مامۆستاکان کارەکانی خۆیان بۆ ماڵەوە دەبردەوە و کەس نەیدەتوانی بچووکترین گومانم لێ بکات، لە تووڕەییشدا هەڵدەلەرزیم. هەوا سارد بوو و ئەو بەفروبارانەی ئەم چەند ڕۆژەی دواییش باریبوو خەریکبوو دەیبەست. هەڵدەلەرزیم. بەڵام نەك لە سەرمانا، بەڵکو دەتگوت خەریکم تاوانێك دەکەم. بە بەهاترین کاری گەورەترین نیگارکێشی ئێران خەریکە لەدەست دەدەم، ئایا ئەوەی دەهێنا؟ خۆشم نەمدەزانی خەریکم چی دەکەم؟ تا ئەم ساتە نەخشەکەم سەری گرتبوو. بەڵام حسابم بۆ لەم ساتە بەدواوە نەکردبوو. ئەم تابلۆیە چی لێ بکەم؟ هەر بە ڕاستی بڕیارم دابوو تابلۆکە لە ماڵی ئەو ئافرەتە نەناسە دابنێم کە هێشتا نەمدەزانی کێیە؟ ئەی سبەینێ وەڵامی چی بدەمەوە؟ بە خۆم بڵێم چی؟ ئەی چ وەڵامێکی ئەو داڵە لاشە خۆرانە بدەمەوە کە ئەوەندەی سەرە دەرزییەك نرخی هونەرەکەی مامۆستا نازانن؟ چی بە من دەڵێن؟

وردەوردە خەریکبوو تێدەگەیشتم کە ئەم ئافرەتە سیحری لە منیش کردووە، بەڵام ئایا لە ڕاستیدا کاممان کەوتبووینە ژێر دەسەڵاتی ئەوی ترمانەوە؟ من؟ یان ئەو؟ ئایا لە ڕاستیدا خۆشەویستی و ئەمەکی من بۆ گەورەیی مامۆستا و بایەخدان بە ژیانی پڕ ئازار و تەقەللای وای لە من کرد کە نەزانانە و بێ هیچ حسابێك ئابڕووی خۆم بەرم، یان ئەم ئافرەتە هەرزەیە توانیبووی منیش لە قەفەسە تەنگەکەی ژیانی خۆم دەربهێنێت؟

سەعات هەشت بوو. لەبەردەم دەرگای قوتابخانەکەدا وەستابووم، دەترسام لەوەی چۆن بەو حاڵەوە بەرەو ڕووی دەرگاوانەکە ببمەوە کە چاوەڕێی بووم بە عەرەبانەکەیەوە بێتەوە؟ دەنگی پێی ئەسپەکان کە شەختەی سەر شەقامەکەیان دەشکاند، لە دوورەوە هاتە گوێم. پشتم کردە ئەو لایەی کە دەنگی پێی ئەسپەکانی لێوە دەهات تا دەرگاوانەکە سەروسیمام نەبینێت. مانگ بە ڕووی گوستاخی خۆیەوە هەموو نهێنییەکانی ئاشکرا دەکرد. ئاسۆ ڕووناك و زەمین و

خانووەکان لە سپییەکی ماتدا نوقم بووبوون. ئۆتۆمبێلەکان بێشەرمانە هۆڕنیان لێ دەدا و جەنجاڵیی ئەم ژیانەیان بە ڕووی مندا دەکێشا.

تازە سەرێك بوو هێنابووم و نەمدەگەڕانەوە دواوە، شەیتان چووبووە بنکڵێشەمەوە. وەختێ دەرگاوانەکە هاتەوە، خواحافیزیم لێکرد و پێم وت: "ئەمشەو کەمێك درەنگتر بنوو، لەوانەیە هەر ئەمشەو تابلۆکە بهێنمەوە".

لە شەقامی ئیسلامبولدا ڕووناکیی کزی گڵۆپەکانی شەقامەکە ئاسمانیان تاریکتر پیشان دەدا، گەواڵە هەوری سپی و شین لە ئاسماندا پەڕاگەندە بووبوون و سروەیەکی سارد لووت و پەڕەی گوێمی سوورهەڵگەڕاندبوو. کڵاوەکەم هێنابووە سەرچاوم تا کەس نەمناسێتەوە. سەعات هەشتی شەو بوو و شەقامەکە جمەی دەهات. خەڵکەکە چەند بێباکانە دەهاتن و دەچوون! چەند خۆشحاڵ بوون! ئۆتۆمبێلەکان لە چەپ و ڕاستەوە وەك واشە تێدەپەڕین. بوقی عەرەبانەکە لەو نێوەدا شتێکی نەشاز بوو. لە پشت باڵیۆزخانەی ئینگلتەرەوە ئافرەتان بەدوا مشتەریدا دەگەڕان و یەخەکراوەکان وێڵی دوای نێچیر بوون، یەکێکیان وەختێ عەرەبانەکەی ئێمەی دی وەستا، سەیرێکی منی کرد، ئیشارەتێکی بۆ کردم و پلارێکی تێ گرتم.

حەزم دەکرد عەرەبانچییەکە غاری بکردایە، دەمویست زووتر بگەم بەو ئارامییەی کە پێویستم پێیەتی و وا خەریکم لە ماڵی ئافرەتە نەناسەکە دەیبینمەوە.

بە عەرەبانچییەکەم وت: "تۆزێك خێراکە. ئەمانە سەرخۆشن و تووشی گێچەڵێکمان دەکەن".

عەرەبانچییە پیرەکە لەمن ئازاتر بوو.

—ئەمانە سەگی کێن؟ قابیلە شاری بێ حاکم بێت؟ زەوییەکە بەستوویەتی، ئەگەر خێراتر بڕۆم ئەسپەکانم هەڵدەخلیسکێن.

من گوێم بۆ قسەکانی ئەو ڕانەدەگرت، خۆرەی دوودڵی هەناومی دەکێڵا. چۆن دڵنیابم کە سەرکەوتن وەچنگ دەهێنم؟ تۆ بڵێی ئەم ئافرەتەش یەکێك لەو ئافرەتە

سەر بەسۆدرانە نەبێت کە کەم تا زۆر دوای ڕووداوەکانی خەرمانان دەبینران؟ کێ دەڵێت نایەوێت بمخاتە داوێکەوە و تابلۆکە لە دەستم دەربهێنێت، تا پاشان غەریزەی خۆپەرستیی خۆی پێ تێر بکات!!.

ئەو پارچە کاغەزەی کە ناونیشانی ئافرەتە نەناسەکەم لەسەر نووسیبوو، چرچولۆچ بووبوو. لەبەر ڕۆشنایی گڵۆپێکی سەر چوارڕیانەیەك خوێندمەوە. چاوم بە ئۆتۆمبیلە ڕەنگاوڕەنگەکە کەوت کە ئافرەتە نەناسەکە پێی هاتبوو بۆ قوتابخانەکە.

لە دەرگام دا، ئافرەتێك کە بەرکۆشێکی سپیی بەستبوو و لەچکێکی سپیشی کردبووە سەر، هات و دەرگاکەی کردەوە.

وتم: "خانم، بەڵکو ڕابگەیەنن کە تابلۆکەم هێناوە".

ئافرەتەکە ماتڵ نەبوو و وتی: "فەرموون وەرنە ژوورەوە".

کرێی عەرەبانەکەم دا، سەرەوەی تابلۆکەم پاڵدا بەنێوچەوان و شانمەوە و خوارەوەشیم بە هەردوو دەستم گرت و بەرەو هۆڵەکە چووم. کچەکە دەیویست لێم بگرێت. وتم: "نەخێر، ئەمە کاری ئێوە نییە، پێم بڵێن بۆ کوێی بەرم؟"

-فەرموون بۆ ژوورەوە! خانم لە ژوورەکەی خۆی دانیشتووە. پاڵتۆکەتان داناکەنن؟

یەکسەر بە خانووەکەدا زانیم کە ماڵی یەکێك لە خانەدانەکانە. هۆڵێکی گەلێ قەشەنگ!! مێزێکی خڕی نزم لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بوو کە ئینجانەیەکی بلووری پڕ لە گوڵە مێخەکی لەسەر بوو. ئەو چلچرایەی کە لە بنمیچە ڕەنگاوڕەنگەکەوە هاتبووە خوار، تەواوی هۆڵەکەی ڕۆشن کردبووەوە. گوڵدانێکی گەورەی لە داری خورما دروستکراو لە گۆشەیەکدا دانرابوو. تابلۆکەم بە قەراغ مێزە نزمەکەدا هەڵپەسارد. کچەکە پاڵتۆ و کڵاوەکەی لێ گرتم. تەماشایەکی دەورووپشتی خۆمم کرد، هەموو شتەکان جوان دەهاتنە پێشچاو، لەم شوێنەدا خۆم نامۆ بینییەوە. هەستم بە بچووکی و بەدبەختیی خۆم کرد. ترس دایگرتم، ئەم ئافرەتە نەکات لەم ماڵ و ژینگەیەی خۆیدا بەسەرمدا زاڵ بێت؟! لە قوتابخانە

مـن خانـەخوێ و فـەرمانڕەوا بـووم، بـەڵام لـێرە هـەموو شـتەکان بـە سـووکییەوە سەیریان دەکردم. چاوەکانم نەیاندەتوانی ئالوودەی ئەو گوڵدان و چلچرا و دیوارە ڕەنگاوڕنگ و مافوورە پڕ نەخش و نیگارانە بـن. مـن بـە تـەواوی کەلوپەلـەکانی قوتابخانەکە ئاشنام، مێژووی یەکبەیـەکیان دەزانم، سـاڵانێکی زۆر لـە نێویـاندا ژیاوم، تەواوی تابلۆکان لەم دەستانەمدا بوون.. بەڵام لێرە.. لەم خانووە پڕشکۆ و بەهەیبەتەدا؛ هەستم بە ونبوونی خۆم کرد.

کارەکەرەکە وتی: "فەرموون ئاغا".

دەرگـای ژوورێکـی کـردەوە. فـەرەنگیس لەسـەر کورسـییەك دانیشـتبوو. کراسـێکی سـەوزی تەسـکی پۆشـیبوو، لاوتـر دەهاتـە پێشـچاو. دەموچـاوی قەشەنگی، منی هێنایـەوە سەرخۆ. تۆزێك هەستی خۆ بە گەورەزانین هاتەوە بە بەرما. بێئەوەی بایەخێکی ئەوتۆ بە ئافرەتە نەناسەکە بدەم، بە کارەکەرەکەم وت "بەڵکو تابلۆکە بهێننە ژوورەوە. بەڵام وریابن بەر دەرودیوار نەکەوێت".

وەختـێ کارەکەرەکـە ویسـتی تابلۆکـە بەرزبکاتـەوە، وتم: "نـا نـا.. وانـا.. لـە ناوەڕاستەوە بیگرە".

بە دەنگێکی بەرز ئەمەم وت تا سەرنجی فەرەنگیس بەلای خۆمدا ڕابکێشم. تـاوێك خـۆی بەو ڕۆژنامەیەوە خـافڵاند کە بە دەستییەوە بـوو. هەرکـە گوێـی لـە دەنگی من بوو هەڵسایە سەرپێ. ناچار بوو تا بەر دەرگاکە بۆ پێشوازیم بێت.

پاڵتۆ بە دەستمەوە و بەدوا کارەکەرەکەدا و، وەکو یەکێك بەو جۆرە خانووانە زۆر ئاشنا بێت چوومە ژوورەوە. بەسـەر سـڵاوێکم لـە خـانم کـرد و بـە چـاویش چاودێریی کارەکەرەکەم دەکرد بزانم تابلۆکـە لـە کوێدا دادەنێت. بـەڵام ئـەو تـابلۆ گەورەیەی کە بـە دیوارەکەی بەرامبەرمـەوە بوو، سەرنجی ڕاکێشـام. دیمـەنی ئـەو حەشاماتە دیاربوو کاری مامۆستا بوو، چونکە من چەند سکێچێکی ئەو تابلۆیـەم بینیبوو، بە دوای تابلۆکەش خۆیدا زۆر دەگـەڕام. وەختـێ لـە ژووری ئـەم ئافرەتـە نەناسەدا بینیم؛ پێم گران بوو. ئیتر بەم هەموو بەڵگانەوە نەدەکرا گومان بکرێ کە ئەم ئافرەتە مامۆستای نەناسیوە.

هەر ئەوەندە کارەکەرەکە تابلۆکەی لەسەر زەوییەکە دانا، چووم و لە دەستم گرت و وتم: "زۆر چاکە، من خۆم دەیکەمەوە".

کارەکەرەکە خەریکبوو لە ژوورەکە دەچووە دەرەوە کە فەرەنگیس بە فەرمانەوە وتی: سەکینە، سەبرکە! ئاغا حەز بەچی دەکەن؟ حەز بە پێکێك کۆنیاك دەکەن؟

هەمدیسان لەگەڵ ئەم دەنگە پڕ ڕێز و میهرەبانەدا زەردەخەنەیەکی درۆی خستەوە سەرلێوی.

ئەگەر ئەم ئافرەتە سەرلەنوێ بەمجۆرە ڕەفتارم لەگەڵدا بکاتەوە. لە پێستی خۆم دەچمە دەرەوە. خۆی چاك دەزانێت من بۆچی بۆ ئێرە هاتووم. دەزانێت کە نزیکەی سەعاتێکە کە دەبێ بە مەیلی من بکات و چی نهێنی شك دەبات لام بیدرکێنێت، کەچی ئەوەتانێ بە هەمان زمانی نوسینگەکە قسەم لەگەڵدا دەکات.

ڕووم کردە کارەکەرەکە و وتم: "مێرسی، من هیچم ناوێت"

فەرەنگیس لەو زمانە توندوتیژەی من دەموچاوی سوورهەڵگەڕا. پڕکێشیم نەکرد سەیری چاوەکانی بکەم. بە ئاوازی دەنگیدا دیاربوو کە خۆی لەدەست دابوو. پرسیی: "کەواتە ئیجازە بفەرموون با بێت و تابلۆکە بکاتەوە".

–نەخێر، خانم، ئەو ئەرکە بە من بسپێرن، تکا دەکەم ئیجازە بفەرموون با بڕوات. بە سەری ئاماژەیەکی بۆ سەکینە کرد و ئەو ڕۆیشت.

بەبێ ئەوەی چاوەڕێی موجامەلەی ئەو بکەم، چووم و لەسەر کورسییەکەی بەرامبەری دانیشتم.

فەرەنگیس پاش تۆزێك هات و دانیشت.

نزیکەی دوو دەقیقە بێدەنگی بالی بەسەر ژوورەکەدا کێشا، دەنگی ئۆتۆمبێل و گالیسکە و تەنانەت ڕێبوارانیش دەهاتە گوێ، تا ئۆقرەی لێ بڕا.

–ناتانەوێ تابلۆکەم پیشانبدەن؟

–تابلۆکەم بۆ ئەوە هێناوە پیشانتانی بدەم. بەڵام دوای ئەوەی لەسەر مامەڵەکە ڕێك دەکەوین.

–وتم پارەتان چەند دەوێت دەتاندەمێ.

–منیش عەرزم کردن کە ئامادەنیم ئابڕووی خۆم هەرزانفرۆش بکەم. پاشان ئەگەر دەتانەوێ بە هەمان زمانی پێشووتان قسەم لەگەڵدا بکەن کە بە ڕای مـن جگە لە ساختە و درۆ هیچی تر نییە، ئـەوا یەکسـەر دەست دەدەمـە تابلۆکـە و دەڕۆم. خانم، من بۆ ئێرە هاتووم تا بێ پێچ و پەنا و ڕاسـتگۆیانە قسـەتان لەگـەڵدا بکەم، ببەخشن تا ئێستا ناویشتان نازانم، هەر بە فەرەنگیس خانم بانگتان دەکەم، ئێوە بەڵێنتان دا هەرچییەکم بوێت بمدەنێ.

–چیتان دەوێت؟

–ئێوە دەبێت ئەو شتەی نەتانداوە بە کەس بمدەنێ.

–مەبەستتان چییە؟

–ئەگەر دەتانەوێ بزانن مەبەستم چییە، ناچارم سەرەتا پێشەکییەکتان بدەمێ تا باشتر لە مەبەستم حاڵی بن. من کە داوای ڕاستگۆیی لە ئێوە دەکەم، دەبـێ خۆشم لەگەڵتاندا ڕاستگۆبم. وا نـەزانیت مـن تەنـها ئەمشـەو ئێـوەم ناسـیوە، دە ساڵی ڕێکە من هەموو ڕۆژێك لەگەڵ ئەم تابلۆیەدا دەژیم کە ئێستا لەم ژوورەدایە. هەر بۆیە من دە ساڵە ئێوە دەناسم. ماوەیەك بێدەنگ بووم، چاوەڕێ بووم بە دوای مندا قسە بکات و منیش پێی بڵێمەوە کە وامان بڕیار دا لەگەڵ یەکدا ڕاستگۆ بین.

فەرەنگیس هیچی نەوت، دیاربوو هاتبووە ژێر بار، نکووڵیی نەکرد، سـەری شـۆڕکردبووەوە. پەنجـەکانی هـەردوو دەسـتی لێـك ئـاڵاندبوو. وەك پەیکـەرێك بێجووڵە دانیشتبوو. ئەو کراسە سەوزەی زۆر لێ دەهات کە لە بەریدا بوو، پرچی شەپۆل شەپۆل بەسەر شانیدا هاتبووە خوارێ. لەسەرخۆ پاڵی دایەوە و چاوی بڕیە سەر مێزەکە کە قوماشێکی ڕەشی گوڵدار بوو. هەوڵم دا لە چاوەکانی ورد ببمـەوە، بـەڵام ئـەو تەماشـای نـەکردم، ئیـتر وەکـو جووجەڵەیـەك کـەوتبووە دەستمەوە.

وتم: "خانم، ناوتان چییە؟".

–مەپرسن، ناوی من هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر کارەکەی ئێوە نییە. من ئەو کەسەم کە ئێوە بە دوایدا دەگەڕێن.

–ئەمە دەزانم. زۆر چاکە، با ناوی ڕاستەقینەی تۆ بە لای منەوە ئافرەتە نەناسەکە بێت، ئایا حەز دەکەن لەگەڵ یەکدا ڕاستگۆ و بێ پێچوپەنا بین؟

–تۆ چیت لە گیانی من دەوێت؟

زۆر خەمبارانە ئەمەی گوت. ئاگری لە دڵم بەردا. تەریق بوومەوە لەوەی بەو شێوە توندوتیژە ڕەفتارم لەگەڵدا کرد. فەرەنگیسیش وەکو هەموو مرۆڤە خۆپەرستەکان؛ وەختێ دەسەڵاتی نەدەما، سۆز و بەزەیی مرۆڤی دەورووژاند. ئەمانە تەنها لە لووتکەی دەسەڵاتدا گەورە دێنە پێشچاو. وەختێ تێکەوتن، زەلیل و بەسزمان دەبن.

وەڵامم نەدایەوە. بەڵام ئەو پرسیی: "ئاغای چاودێر، هاتوون بۆ ئێرە تا ئازارم بدەن؟".

–نا.. بە پێچەوانەوە ،هاتووم تا خۆم و ئێوەش لەو مۆتەکەیە ڕزگار بکەم کە ئەشکەنجەمان دەدات، بە کورتی من بۆ ئەو مەبەستە نەهاتووم، ئێوە و ئاغا ڕەجەب تاقە کەسێك بوون کە مامۆستاتان ناسیوە. ئاغا ڕەجەب کۆچی دوایی کرد و هیچی نەوت. ڕەنگە هۆیەکەی ئەوە بووبێت ترساندبێتیان، ڕەنگە لە گرنگیی مەسەلەکەش نەگەیشتبێت و یان خۆی بە تێنەگەیشتوویەك پیشاندابێت. بەڵام ئێوە ئەو نەناسن. ئێوە کۆمەڵێك نهێنیی ژیانی ئەو دەزانن کە بڵاوکردنەوەیان بۆ نەوەی هاوچەرخی ئێستا و ئایندە پێویستە، ئێوە دەتوانن من بە کابرایەکی ڕیاکار و فریودەر لەقەڵەم بدەن، هەقی خۆشتانە. چونکە پەردەهەڵماڵین لەسەر نهێنیی ژیانی مامۆستا لایەنێکی خۆویستیشی بە نیسبەت منەوە تێدایە. من بە خۆم بزانم و نەزانم ژیانی خۆم بەوەوە بەستۆتەوە و دەبێ نهێنیی ژیانی ئەو بدۆزمەوە.

–دەتانەوێ ژیانی مامۆستا بنووسنەوە؟

-لەوانەیــە، ئەگــەر لایــەنیکی کۆمەڵایــەتی بــەخۆوە بگــرێ و بتوانــرێ وەك نموونەیەك پیشانی خەلکی بدرێ.. لەوانەیە بینووسمەوە.

-یانی ئەوەی کە من دەیزانم پیتــان بلیـم، ئیـوە لـە کتیبەکـەتاندا ئاشـکرای دەکەن؟

-من ژیانی ئیوە نانووسمەوە. بەڵام ئاشنابوون بە ژیانی مامۆستا بۆ خـەلکی سوودمەندە.

-ئیوە دەتانویست لەگەل مندا ریکوراست بن؟ ئەی تا ئیستا درۆتان لەگەل کردووم؟

-بـەلی لـە هۆلـی مۆزەخانەکـە هەرچییــەکم دەربـارەی فرۆشـتنی کارەکـانی مامۆستا بە ئیوە وت، هــەمووی درۆ بـوو. لـەو رۆژەوەی مـن لـەو قوتابخانەیـەم، تەنانەت پارچە کاغەزیك کە بەحال نووکی قەلەمەکەی مامۆستای بەرکەوتبیت، نەچووەتە دەرەوە. بەڵام هەتاهەتایە وا نابیت. تا ئیستا تەنانەت ئەوەندەی من لـە دەستمدا بووبیت توانیومە زۆر لەو تابلۆ و سکیچانەی کە خۆشی لە ژیانیدا بەم و بەوی فرۆشتوون یان پیشکەشی کردوون؛ کۆبکەمەوە. نزیکەی سەد کـاریم بـە پـارەی دەولـەت کریوەتـەوە و بردوومەتـەوە بـۆ مۆزەخانەکـە. ویـرای ئـەوەش وا ئەمشەو ئەم تابلۆیـەم هیناوە بۆ مالی ئیوە و ئامادەم هـەر لیرەشـدا دایبینیـم و برۆم. بـەڵام ناتوانن بـە پـارە قـایلم بکـەن. دە سـالە مـن چاولـەریی ئیـوەم. ئیـوە خاوەنی ئەم چاوانە نین..؟

ئافرەتــە نەناســەکە راچــەنی. هــەردوو دەســتی خســتە ســەر دەســکەکانی کورسییەکە. لەشە ریك و نەرمونیانەکەی راست کردەوە و وتـی: "نـەخیر، وانییـە، ئەم چاوانە هی من نین".

-بەڵام ئەم دەم و لیو و ناوچەوان و زولف و روومەتانە بیگومان هی ئیوەن.

-لەوانەیە.

-لەوانەیە!! ئەی چاوەکانی چۆن هی ئیوە نین؟

-ئاغای چاودیر.

دەنگی نەرمتر و تکاکارانەتر بوو. هەمدیسان دلم پیی سووتایەوە. شتەکەم زۆر قورس گرتبوو..

-ئاغای چاودیر، ئەمە شتیك نییە بە وشەیەك وەلأم بدریتەوە. رەنگە ئیوەش راست بکەن! رەنگە گەر بۆ تەنها جاریکیش بیت بتوانم ئەوەی کە بەسەرمدا هاتووە بۆ کەسیکی بگیرمەوە، یان وەکو ئیوە دەلین ئەوەی بە کەسم نەداوە بە ئیوەی بدەم بۆ من باشتر بیت و ئەو تارماییەی کە لە هەموو شوینیك بە دوامەوەیە دەستبەردارم بیت. ئیوە حەز بە پیکیك کۆنیاك ناکەن؟

سەری ناقایلیم بادا.

-بەهەر حال گفتوگۆی ئەمشەومان زۆر دریژە دەکیشیت. ئیجازەم بدەن تا پییان رابگەیەنم شیو بۆ ئیوە ساز بکەن. بۆ خۆشم پیکیك کۆنیاك بهینن. من ئەعسابم پەرشوبلأوە، لە سەعات چوار و نیوەوە، واتە لەو کاتەوەی لە ئیوە جیابوومەتەوە تا ئیستا نائارام و بیئۆقرەم. گەرچی ئەمە حالی تەنها ئەمشەوم نییە. مانگیك دەبیّ هاتوومەتەوە بۆ تاران و چەند رۆژیکە بۆ بینینی تابلۆکان پەریشانم. هەموو جاریّ کە سالرۆژی نزیك دەبیتەوە ئەمە حالی منە. هەر بۆیە ئەو رۆژانە بەرەو شوینی دوور سەفەر دەکەم، تا دەستم بە تابلۆکان نەگات. بەلأم ئیتر ئەمسال خۆم پی نەگیرا..

هەلسابووە سەرپیّ، دەیویست بەرەو لای دەرگاکە بروات.

وتم: "زۆر چاکە، تا ئیوە رایاندەسپیرن شیو ساز بکەن؛ منیش تابلۆکە دەکەمەوە".

-نەخیر، جاریّ سەبر کەن.

بەرەو لای من گەرایەوە، دەستی خستە سەر دەسکی ئەو کورسییەی کە منی لەسەر دانیشتبووم و وتی: "سەبرکە، من هیشتا ئامادە نیم" دەرگاکەی کردەوە و چووە دەریّ. من لە کەلوپەلەکانی ژوورەکە ورد دەبوومەوە. لە بەشی سەرەوەی ژوورەکە میزیکی نووسین هەبوو، چەند کتیبیك و هەندیّ کاغەزی سەفتەکراوی لەسەر بوو، گلۆپیکی بەرزی کلأوە سەوز سەرمیزەکەی رۆشن دەکردەوە، لە

دەستە راستیشدا قەفەسەیەکی بچووك هەبوو کە پربوو لە کتیبی فەرەنسایی. لەسەرمیزەکەش وینەیەکی مامۆستا دەبینرا کە لە چوارچیوە نرابوو.

پەردەکانی ژوورەکە سوورمەیی بوون. لەسەر کۆمیدییەك چەند پەیکەریکی کۆن ریز کرابوون. تابلۆی حەشاماتەکەش رەونەقیکی تری بە ژوورەکە دابوو. دوو کورسیی تر و مۆبیلەیەکی گەورە دیمەنی ژوورەکەیان تەواو دەکرد.

هەلسام و بەرەو دیوارەکە رۆیشتم تا تەماشای تابلۆکەی مامۆستا بکەم.. لە هەمان کاتدا ئافرەتە نەناسەکە دەرگای کردەوە و بە دوایدا کارەکەرەکە بە سینییەك و دوو پەرداخەوە هاتە ژوورێ. ئەمانەی لەسەر میزەکە دانا و رۆیشت. ئافرەتە نەناسەکە بوتلیك کۆنیاکی دەرهینا و لەسەر میزەکە داینا و دانیشت. پیکیك کۆنیاکی هەلدا، تۆزیك بیری کردەوە و وتی: "با جارێ پیتان بلیم ئەوم چۆن ناسی. پاشان چیتان دەوێ بپرسن".

–من پرسیارم نییە لیتانی بکەم. حەز دەکەم هەرچی زووترە دەربارەی ئەو قسە بکەن.

–من نامەوێ هیچ شتیك دەربارەی ژیانی خۆم بلیم، شتیکی تازەی ئەوتۆ لە ژیانی مندا نییە کە جیابیت لە چارەنووسی زۆربەی خەلکی و، ئیوەش چ کاریکتان بە من و چارەنووسی کەسانی وەکو من دەبیت؟ بەلام مامۆستا تا رادەیەکی زۆر لە دەوروبەرەکەی خۆی گەورەتر بوو.

"بە وردی لە یادم نییە چ سالیك بوو ناسیم، بەلام ئەوەندە دەزانم کە من نۆزدە بیست سالانیك دەبووم، کچیك بووم جەسوور، خۆم دەلیم جەسوور، ئەگینا کچەکانی هاوریم بەبێ شەرمیان لە قەلەم دەدام. دەمتوانی خۆم بە کەسیك بناسینم کە هەرگیز لەوەوبەر نەمدیبیت و نەمناسیبیت و بە سەعات قسەی لەگەلدا بکەم. دەربارەی زۆر شتی بیسەروبەر، شتی وەها کە خۆشم نەمدەزانی چین، چونکە جوانیش بووم ئەم سیفەتەی من کاریگەر بوو. لاوەکان کەیفیان بەم جەسوورییەی من دەهات و پەروبالیان بۆ دروست دەکرد. لە قوتابخانە مندالیکی گیل نەبووم، بەلام توانام لە قەوارەی خۆی پتر گەورە کرابووەوە. تاقانەی دایك و

باوکم بووم و زۆر نازیان دەکێشام. دایکم دووەم ژنی باوکم بوو و بچووکترین ڕۆڵی لە بەڕێوەبردنی ماڵەکەدا نەبوو، هەموو شتێك بە حەزی باوکم ئەنجام دەدرا، دایکم جارجار بۆڵەیەکی دەکرد بەڵام لە کۆتاییدا تەسلیم دەبوو، هەر لە منداڵیمەوە حەزم لە نیگارکێشان دەکرد".

"هەندێ جار بۆ خۆم بە ئاو و ڕەنگ دیمەنی سروشتم دەکێشا. باوکم ئەوەندەی هەبوو کە دەستی بگاتە دەمی و ژیانی من لە ڕووی مادییەوە باش بوو، هەمیشە لە خۆشگوزەرانیدا بووم، لە هەموو تەمەنمدا هەستم بە هەژاری نەکردووە، باوکم زیاد لە پێویست نازی دەدامێ و وایدەزانی زۆر بەهرەوەرم، پێی دەوتم تۆ زۆر بەهرەمەندیت و ئەگەر کاربکەیت، ڕۆژێك دێت دەبیت بە گەورەترین نیگارکێشی ئافرەتی ئێران.

زۆربەی وەخت کە باوکم لەگەڵ هاوڕێکانیدا دەبوو و یاریی کاغەزی نەدەکرد، یان دەربارەی سیاسەت و مەسەلەکانی ڕۆژو بارودۆخی وڵات قسەی نەدەکرد، بۆ تێرکردنی هەستی خۆپەرستیی خۆی کارەکانی منی پیشانی ئەوان دەدا و شانامەی پیاهەڵدەدام".

"ئەگەر جوان نەبوومایە، و کارەکەی خۆمم بە جیدی بگرتایە، لەوانە بوو شتێك بە شتێك بکەم. بەڵام چونکە سەرەڕۆ و ڕاڕا بووم و هەرچییەکم بویستایە باوکم دەیخستە بەردەمم، هەر لە تەمەنی شانزە ساڵیمەوە هەستم کرد کە لە ڕێی جوانی و ڕوخسار و پڕکێشیمەوە پتر دەتوانم دەربکەوم وەك لە ڕێی هونەرەوە. لە ئەنجامدا هیچ کارێکم بە جیدی نەگرت. هەمیشەش ئاسانترین ڕێگام هەڵدەبژارد".

"هەر لە یەکێك لەو ڕۆژانەدا بوو کە باوکم دەربارەی ئەو، واتە مامۆستا ماکان قسەی بۆ کردم، ئەودەمە دوو ساڵ بوو خانەی مامۆستایانم تەواو کردبوو و خەریکبوو لەتاو بێکاری ڕۆح دەهاتە سەر لێوم.

باوکم وتی ماکان لە فەرەنگ نیگارکێشیی خوێندووە و ماوەیەکیش لە ئیتالیا بووە و لە نێوەندی هونەریدا پلەوپایەیەکی تایبەتیی هەیە. تابلۆکانی لە بەرەودانو خەریکە لە نێو پیاوان و خانەداناندا دەنگ دەداتەوە، هەر لە

قسەکانیشیدا وتی کە وانەی تایبەتی دەڵێتەوەو وا چاکترە منیش بچم بۆ لای ئەو تا نیگارکێشی بخوێنم. دایکم کە ئافرەتێکی بە ئیمان و لەخواترس بوو و نیگارکێشانی بە حەرام دەزانی؛ زۆر لەگەڵ ئەم ڕایەی باوکمدا نەبوو. دوو سێ مانگ باوکم و دایکم مشتومڕیان بوو لەسەر من کە چی بکەم و چی نەکەم، دایکم دەیویست بمدا بە شوو، بەڵام باوکم دەردی ژن هێنانی چەشتبوو و لە ناخی دڵەوە حەزی دەکرد من خۆم مێردی خۆم هەڵبژێرم. ئیتر جاری وا وابوو کە ئەم مشتومڕە بە ناخۆشی لە نێوانیاندا کۆتایی دەهات".

"ڕۆژێکیان بە بێئەوەی بە کەس بڵێم دەستم دایە کارە هونەرییەکانی خۆم؛ کە زۆر بە جوانم دەزانین و بەرەو کارگەکەی ئەو ملی ڕێگام گرتە بەر. نازانم، من هیچ کاتێك نەمتوانیوە ڕۆحیەتی خۆم شی بکەمەوە، هەرگیز نەمتوانیوە؛ نەك لەبەرئەوەی بیرم لەوە نەکردۆتەوە، نا، بەڵکو لەبەرئەوەی نەمتوانیوە پەی بەو هۆیانە بەرم کە پاڵیان پێوە ناوم کارێك بکەم کە نەدەبوایە لێم بوەشایەتەوە. کارێکی ناشرین، کارێك کە لایقی کچێکی چینەکەی خۆم نەبووە کردبوومە، بەڵام هەرگیز بە کارێکی ناشرینم نەزانیوە. نازانم چۆن و بۆچی، بەڵام هەر لە یەکەم ساتی بینینییەوە، زانیم کە ڕووبەڕووی مرۆڤێك بوومەتەوە جیاوازە لەوانەی لەوەوبەر هەڵسوکەوتم لەگەڵدا کردوون. بە شێوەیەکی سەیر هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردم. لە کاتێکدا کەسانی تر هەموو دەکەوتنە ژێر سیحری زەردەخەنە و ڕووخۆشیمەوە و لەخۆ دەچوون، کەچی ئەو نەك هەر سەرنجی زەردەخەنەکانیشمی نەدا کە زەردەخەنەیەك بوون لە ناخی دڵەوە دەکەوتنە سەر لێو و چاو و ڕوومەتم و هەڵقوڵاوی لاوێتیو دڵە زیندووەکەم بوو؛ بەڵکو هەستم کرد هەر هیچ دەربەستم نەهات. ئەو خۆی لە بنەڕەتدا مرۆڤێکی لەخۆبایی نەبوو، بەڵام زۆری دەویست تا هۆگری کەسێك دەبوو. هەمیشە بەرگێکی سارد سیمای پۆشیبوو، زۆری دەخایاند تا دەروونی خۆی بۆ کەسێك ئاوەڵا دەکرد. بە پێچەوانەی هەموو ئەوانەی کە ناسیبوومن زۆر بە ساردییەوە پێشوازیی لێ کردم، بەڵام ساردییەکەی شتێك نەبوو من بڕەنجێنێت. لەوە دەچوو من بە لای ئەوەوە

هەر هیچ جوان نەبم، هیچ شتێکی ناشرینی بەرامبەرم نەکرد، بریا دەیکرد، تا هیچ نەبێت مرۆڤ ئەو دەمامکە درۆیەی کە لەم حاڵەتانەدا دەیپۆشێ فرێی بدایەو ئوسا ئەویش ناچار دەبوو دەروونە پڕنهێنییەکەی خۆی بخاتەڕوو. بەڵام هەر ئەو ڕەفتارە ئاقڵانە و هێمنانەی بووە سەرچاوەی ئازار بۆ من. وەختێ ویستم سکێچەکانی خۆمی پیشان بدەم؛ چووە پشت مێزێکی بچووکەوە و دانیشت. لەوە دەچوو بیەوێت جۆرە ڕەسمیاتێك بە تەماشاکردنی کارەکانم بدات و ڕادانی لەسەریان لایەنێکی تایبەتی و دۆستانە بەخۆوە نەگرێت، چەند کاغەزێکی لەو کاغەزانە گرت بە دەستی چەپییەوە کە من نیگارم لەسەر کێشابوون و بە دەستی ڕاستیش ئەوەی کە سەیری دەکرد دایدەنا. هەموو سەیرکردنەکەی دەقیقەیەکی خایاند. من چاوەڕێ بووم کارەکانم پەسەند بکات. چاوەڕێی ئەوە نەبووم وەکو ئەوانی تر پێم بڵێت شاکارت کردووە. بەڵام بە لایەنی کەمەوە دەمویست بڵێت: "باشن، خراپ نین، لە کوێ فێر بوویت؟ بەهەرحاڵ هێشتا لە سەرەتادایت و پێویستت بە فێربوونە" کەچی لە بری ئەوە بە ساردی و وشکییەوە کاغەزەکانی دایەوە پێم و وتی: "ئینشائەڵڵا لەمەودوا باش دەبیت"

یەکێك لە کارەکانم دەموچاوی کارەکەرێك بوو کە لە ماڵی خۆمان کاری دەکرد، ئەو کچە هەر لە منداڵییەوە لە ماڵی خۆماندا گەورە بووبوو و لە شانزە ساڵیدا شووی کردبوو. مێردەکەی دوای یەك ساڵ مرد و منداڵێکی بەسەردا جێ هێشت. من وێنەی ئەم ئافرەتەم لەگەڵ منداڵەکەیدا بە ڕەنگی ئاوی کێشابوو و بە خەیاڵی خۆم ئەو ئازارەم لە چاوەکانی و لە دەمی کراوەیدا بەرجەستە کردبوو کە ئەو ئافرەتە بەدەست شەونخونییەوە بەدیار منداڵەکەیەوە دەیچێژێت. کەسانی دی کە ئەم کارانەی منیان دەبینی دەیانگەیاندە ئاسمان، کەچی ئەو نەك هەر قسەیەکی‌نەوت کە هانم بدات، بەڵکو هەر سەرنجی ئەم کارەشمی نەدا کە لە کارەکانی ترم جیابوو کە زۆربەیان دیمەنی سروشت بوون".

"ئەم کابرایە لە قسەکردندا زۆر ورد بوو، حسابی بۆ هەموو وشەیەکی خۆی دەکرد، وەختێ کارەکانی دایەوە دەستم، من تۆزێك دانیشتم، بە ئومێدی ئەوەی

هیچ نەبێت بە شێوەیەکی گشتی ئامۆژگارییەکم بکات. بەڵام هیچی نەوت، لەوە دەچوو بیەوێت پێم بڵێت: باشە ئەگەر فەرمایشتێکی دیکەت نییە، فەرموو بڕۆ و هەراسانم مەکە".

"من لە هەموو تەمەنی خۆمدا مرۆڤێکی وام نەدیبوو. هەر هیچ نەبێت دەیتوانی پێم بڵێت ئەگەر دەتەوێ فێری نیگارکێشان بیت، وەرە و ماوەیەك کار بکە بزانم چیت لێ دەردەچێت. لای خۆی من کە هاتمە کارگەکەیەوە پێم وت هاتووم فێری نیگارکێشان بم. بیستوومە کە وانەی تایبەتی دەڵێیتەوە. دەتوت ئەم کابرایە بە هیچ جۆریك بە لای وانەوتنەوەدا ناچێت. بەڵام ئەو قوتابخانەیەی کە ئیستا ئیوە چاودیرین؛ لەو قوتابییانەوە دروست بوو کە وانەی تایبەتیی پی دەوتنەوە. نازانم ئەم پیاوە بۆچی کەیفی بە من نەهات، ئەگینا هیچ هۆیەکی دی لە ئارادا نەبوو تا ئاوەها لەگەلمدا رەق بیت".

"من چاوەرێ بووم کارەکانی خۆیم پیشان بدات، وەکو خەلکی دی لەگەلمدا گەرم بیت، دلی بە زەردەخەنەکانم بکریتەوەو و، تەنانەت داوای ئەوەم لی بکات سەری لی بدەمەوە، یان هیچ نەبیت تاقە وشەیەکی لە زار بیتە دەرەوە و بلیت کە فلانە کارتان باش نییە. بەلام نەء.. بە پیچەوانەوە، چەند زیاتر دادەنیشتم ئەو ئەوەندە زیاتر بە ساردییەوە رەفتاری لەگەلدا دەکردم، تا ئاخرییەکەی زەردەخەنە لەسەر لیوم وشك بوو، لەو دیدارەی یەکەمم لەگەلیدا زۆر هەستم بە سووکی کرد، دەتوت بە بێئەوەی بە خۆی بزانیت دەیویست بە چاویکی سووکەوە سەیرم بکات.. باشە چ شتیك لە مندا وای لەو کرد لە من بیزار بیت؟".

"کاتێ خۆم پی ناساند و پیم وت کچی کیم، پرسیی: "سەیرە! کچی ئەمیر هەزار کوهیی مازندەرانیت و خەریکی نیگارکیشانیشیت؟".

ئەو زمانەی ئەو قسەیەی پی کرد زۆر ئازاری دام، نازانم دەبێ لە دلی خۆیدا بیری لە چی کردبیتەوە.

بۆ ماوەیەکی زۆر دوای ئەوە هەزاران جار ئەم رووداوەم هیناوەتەوە بەرچاوی خۆم، بیگومان بیری لەوە کردووەتەوە کە ئەم کچە هەوەسبازە هاتووە ناز و

عیشوەم بەسەردا بفرۆشیت، پاشانیش بچیت لە هەموو لایەك بلیت کە بووەتـە ئاشنای ئەو نیگارکیشە بەناوبانگەی کە هەموو خەلکەکە ریزی لێ دەگرن. بەلاّم نەء. ئەو رووەی نەیدامێ، نەیدامێ. هەلسام، خواحافیزیم کرد، تۆزیك وەستام، بەلاّم ئەو دەستی دریژ نەکرد تا تەوقەم لەگەلدا بکات، هەر بە تەنها تۆزیك لەسەر کورسییەکەی بەرز بووەوە و ئیتر من رۆیشتم.

زۆر رقم هەلسا. تا ئەو رۆژە هیچ پیاویك بەو جۆرە رەفتاری لەگەلمدا نەکردبوو، ناشزانم هۆیەکەی چی بوو، بەهەرحال لەو رۆژەوە کینەم بەرامبەر ئەم پیاوە وشك و بێ ئوسولە لە دل گرت. داخی کردم. تکاتان لێ دەکەم بە سەرنجەوە گویم بۆ رادیرن! ئەو رەفتارەی لەگەلما کاریکی گەورەی کردە سەر ژیانم و ئەگەر کەمیك دلنەرمتر بووایە لەگەلمدا؛ لەوانە بوو دەرفەتی ئەوەم بۆ بخولقایە کە چیژی هونەریم پەروەردە بکەم.

وەختێ لە مالەکەی هاتمە دەرەوە؛ ئەوەندەی نەمابوو دەست بکەم بە گریان، پەرەکانی لووتم دەلەرزین. لە هەموو شتیك بیزار بووم، هەر بیرم لەوە دەکردەوە هۆی چی بوو ئەو کابرایە بەو جۆرە رەفتاری لەگەلمدا کرد؟ بەلاّم لە وەلاّمدا هیچم دەستگیر نەبوو. ئیستا هەرچەند بمەویت هەستی ئەو رۆژەی خۆمت بۆ روون بکەمەوە و، ئەزموونەکانی دواترم بخەمە بەر رۆشنایی ئەو هەستە، ناتوانم.ئەوەی ئیستاش هەستی پی دەکەم، کەم تا زۆر تیکەل بە هەست و سۆزی ئەو رۆژەم دەبیت. قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ لە یەك جودا ناکرینەوە. ئەگەر من مامۆستام نەبینیایە و ئەو بیرەوەرییانەی کە لەگەل ئەودا هەمبووە لە سینەمدا هەلنەکۆلرانایە، ئەو دەمە ئەم رووداوەش بەو قوولییە مۆری بە دل و رۆحمەوە نەدەنا. بەهەرحال ئەو رۆژە هەرچەند بیرم کردەوە هیچم دەستگیر نەبوو. نەمتوانی هۆی رەفتاری چ خۆم و چ ئەو شیبکەمەوە. بەلاّم ئیستا کە خەریکم رووداوەکانی بیست سال لەمەوبەر دەگیرمەوە، وا بۆی دەچم کە هەر ئەو رۆژە دلم نوقلاّنەی لێ دابوو کەئەم کابرا وشك و بێ سۆزە تەواو لە من جیاوازە.

هەرچۆنێك بێت ئەو وێنەیەی کە دەربارەی ئەو لە دڵی مندا نەخش بوو، وێنەی کابرایەکی ڕەق و توندوتیژی لە خۆبایی بوو کە بێ زەوق بوو و جگە لە خۆشی هیچ شتێکی تری لەم دنیایەدا بە لاوە گرنگ نەبوو.

ئاخ، بریا وا دەبوو. ئاسەواری ئەم دیدارە بۆ هەتاهەتایە لە ژیانی مندا مایەوە، دەزانم، ئێوە لە میانی چاوەکانی ئەم تابلۆیەوە کە نیگاتان دەکات حوکم بەسەر مندا دەدەن. ئێوە وێنەیەکی ناڕەواتان لە خەیاڵی خۆتاندا سەبارەت بە من کێشاوە. هەقی خۆشتانە. دەزانن بەدبەختییەکەی من لە چیدایە؟ بەدبەختییەکەی من لەوەدایە کە جاری وایە خۆشم خۆم بە ئافرەتێکی بەدخوو دەزانم. خۆم بە گوناهبار دەزانم و گوناهی مەرگی مامۆستا دەخەمە ئەستۆی خۆم. لە کاتێکدا تاقە هۆی ئەوەی کە من ئێستا ئەوەندە بەدبەختم، ئافرەتێکی بێ یار و یاوەر، ئافرەتێکی بێکەس و وەیلان، ئافرەتێکی بێ مێرد و بێ برا و بێ هیچ کەسێك و، لە هەمووش خراپتر ئافرەتێکی بێ هاودەم و هاوڕێ.. ئۆه، نا،.. من نامەوێ ئەو وێنەیەی کە ئێوە لە خەیاڵی خۆتاندا بۆ مامۆستاتان کێشاوە لەکەدار بێت، نا..، ئێستاش بەلای منەوە تاقە پیاوێك شایانی ستایش و ڕێز بێت ئەوە. مامۆستاکەی ئێوە هەموو شتێکی من بوو و من هەرگیز قایل نیم ئەو بیرەوەرییانەی لە ئاوێنەی خەیاڵمدا کێشاونی لەکەداریان بکەم، بەڵام تەنها لە پێناوی ئەودا من هەموو شتێکی خۆم دانا. دەمتوانی شوو بکەم.. منالم هەبێت.. بۆچی شووم کرد؟ هەر لە پێناوی ئەودا، بۆچی تەلاقم وەرگرت؟ هەر لە پێناوی ئەودا.. بۆچی ئێستا بێکەس و بێ هاوڕێم؟ هەر لە پێناوی ئەودا. ئاغای چاودێر دەزانن ئەمە یەکەم جارە سەرگوزەشتەی شوومی خۆم بۆ کەسێك دەگێڕمەوە.. ئەی دەزانن چی دەگەیەنێت کە ئەم هەموو بەدبەختییە لە دڵیکەسێکدا پەنگ بخواتەوە و دەروویەکی نەبێت؟

من ئەمشەو کە بۆ یەکەم جار و دواجار دەمەوێ شتێك بڵێم، تەنها بە مەبەستی ئەوەیە کە خۆم و ئەوتان پێ بناسێنم. لەبەرئەوە حەوسەڵەتان هەبێت! تا من نەناسن، ئەو ناناسن. ئەی من پێم نەوتن تا من نەناسن ئەو ناناسن.. پێم نەوتن؟

ڕەنگــە هــەر منیــش ســەبەبکاری مــەرگی بم. ڕەنگــە مــن هەڵخەڵــەتابم، ڕەنگــە نەیانویستبێت بیکوژن، ڕەنگە هەر بە تەنها دووریانخســتبایەتەوە.. یـان ئەگـەر منی لەگەڵدا بوومایە، ڕەنگە ئێستا زیندوو بووایە و.. ڕەنگە و.. ڕەنگە و.. هەزار ڕەنگە..

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە دەمەوێ شتێك بە ئێوە بڵێم، شـتێك کـە خـۆم بـاش دەزانم چییە و تێیدەگەم، بەڵام ئەو توانایــەم نیـە بـە شـێوەیەك بیخەمـە ڕوو کـە شایستەی تێگەیشتن بێت. مـن هیـچ وەختـێ لـە ژیـانمدا نـەمزانیوە چیـم دەوێ. هەمیشە دوو هێزی دژ بە یەك منیـان لـەم تەرەفەوە بـۆ ئـەو تـەرەف ڕاکێشـاوە و نەمتوانیوە دڵ و گیانی خۆم بکەمە قوربانی تەرەفێکیان و دەست لە تەرەفەکەی تریان هەڵگرم. بەدبەختییەکەی منیش لەمەدایە، هەمیشە دوودڵ بووم. هەمیشە بـە پێیـەکم ڕووە و نێشــو و بــە پێیەکــەی دیکــەم ڕووەو بــەرزایی ڕۆیشــتووم و دەرئەنجام بوونی من مۆلەق بووە. ئێستاش کە دەمەوێ ئەو ڕۆژە.. بیرەوەریی ئەو ڕۆژە، وەختێ لە کارگەکەی ئەو لە شەقامی لالەزار هاتمە دەرەوە، بهێنمەوە یادم، ئێستاش دوودڵم کە ئایا ئەوەی ئەمڕۆ بیری لێ دەکەمەوە و دێتــە خـەیاڵم، ئـەو ڕۆژەش دەمزانی یان نەء. ڕۆژانی دوایی هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر ئەو ڕۆژە ئەو تۆزێك، هەر ئەوەندەی مرۆڤێکی ساکار لەگەڵمدا میهرەبان بووایە، دەڵێم ڕەنگە –تکا دەکەم سەرنج بدەن– ڕەنگە ڕەوتێکی تـرم لـە ژیـاندا بگرتایەتە بەر. تەماشا کەن: من وتم هیچ شتێك لەم ژیانــەدا شـك نابـەم، بـەڵام خـەڵکی وا دەزانن کەسێك نییە لەم دونیایەدا لە من بەختــەوەرتر بێـت، ئـافرەتێکم خـاوەن سامان. هـەموو شتێکم هەیە. هەمیشە لـە سـەفەرم. زۆربـەی تەمـەنم لـە سـەیران و گەڕاندا بەسەر بردووە، جاری وایە تەنها بۆ ڕێکخستنی کاروباری دارایی خۆم بـۆ ئێران دێمـەوە.. پارەم هەیە.. پارە، ئاخ. ئەم پارەیە منـی بەدبـەخت کـرد، منـی وەیلان و سەرگەردان کرد. لە هیچ شوێنێك هەست بە ئارامی ناکەم، باوك و دایکم ماون. ئەوان لـە کەربـەلا نیشتەجێ بوون و ماوەیەکە تەنانـەت نامـە بـۆ ئـەوانیش نانووسم. دایکم بۆم دەنووسێت تا بڕۆمەوە بۆ لای ئەوان و ئیتر تۆبە بکەم. ئاخ..

ئەو کۆترە پیرە چەند بەختەوەرە! بەڵام من لە هیچ جێیەك هەست بە ئارامی ناکەم. لانەیەك شك نابەم دڵم تیایدا ئۆقرە بگرێت. هەرچی خۆشیی ژیانە لای من بووە بە عەزاب. بریا وەکو دایکم گێل دەهاتمە ئەم دنیایەوە و گێلانەش لە کەربەلا نیشتەجێ دەبووم. بریا گەدایەك بوومایە و بەڵام یەکێك خۆشی بویستمایە. ئەودەمە گیانی خۆم دەکرد قوربانی ئەو.

"بۆچی وەها تەماشام دەکەن؟ بەڵێ، من تەنها جارێك لەشی خۆم قوربانی مامۆستا کرد. هەقتانە! شتێکی پێکەنینهێنەرە! جاری وایە خۆشم پێکەنینم دێ. هەست بەمانە دەکەم.؟ بەڵام تەنانەت باوەڕم بە هەست و بیری خۆشم نییە. دەترسم هەست و سۆزم تەنانەت سەبارەت بە خۆشم هەر درۆ بێت. چی ئافرەتی ئەم شارە هەیە ئێرەیی بە حاڵی من دەبەن. پیاوان لەنێو دەستەکانمدا وەکو مۆم وەهان، دەتوانم بە دوو قسەی شیرین لە خشتەیان بەرم، چیم بوێت لەگەڵیاندا بیکەم، وەکو مێش بە دەورمدا باڵەفڕی دەکەن. بەڵام ئێوە وا دەزانن بەختەوەری ئەمەیە؟ من کەسێك شك نابەم دەردی دڵی خۆمی لا بکەم. من بە کەس بێگانە نیم، هەموو شێت و شەیدای جوانییەکەمن. تەنانەت ئێستاش دڵی خۆیانم دەدەنێ، وەڵێ من هاوڕێیەك چییە شك نابەم. ئاخ لەدەست ئافرەت! هەموو بە دەممەوە پێدەکەنن. بەڵام لە ناخی دڵەوە ڕقیان لێمە و هەموویان وا دەزانن من دەتوانم بە زەردەخەنەیەك هاوڕێ و دەزگیران و مێرد و دۆستەکانیان لە ئامێزیان بڕفێنم. لە کاتێکدا کە ئەمە وا نییە. ئاغای چاودێر ئەمە وا نییە. ئێستا تێدەگەن من لەم ژیانەدا چەند ئازار دەچێژم، هەر بەو بەڵگەیەی کە ئەم وێنەیەی ئێستاش ئێوە بۆ ئێرەتان هێناوە من لێی بێزارم. چونکە ئەویش هەر ئاوا منی ناسیبوو.. نازانم من هەر لق و پۆپ لە قسەکانم دەکەمەوە و ناتوانم بە شێوەیەکی زنجیرە ئاسا شتەکانتان بۆ بگێڕمەوە. ئێوە دەبێ کەمێك حەوسەڵەتان لەگەڵ مندا هەبێت. بهێڵن کەمێك داخی دڵمتان بۆ هەڵڕێژم.."

پێکێك کۆنیاکی بۆ خۆی تێکرد. ئەمە پێکی دووەمی بوو. پێکێکی بۆ منیش تێکرد. قومێکی لە پێکەکەی دا و لەسەر مێزەکە داینا. پاشان کەمێك بیری کردەوە "ویستم چی بڵێم؟".

—نازانم ویستتان چی بڵێن، بەڵام من حەز دەکەم بەم جۆرەی ئێستاتان درێژە بە قسەکانتان بدەن. بەمجۆرە باشتر شێوەتان لە بەرچاومدا بەرجەستە دەبێت. دەتانویست باسی ئەوە بکەن چ هەستێك دایگرتن وەختێ لە کارگەکەی ئەو هاتنە دەرەوە..

—بەڵێ، بەڵێ، ڕاست دەکەن. باوەڕ دەکەن کە من دواتر، بە تایبەتیش کاتێ تارانم جێهێشت، بە لایەنی کەمەوە هەزار جار بیرم لەو چەند دەقیقەیە کردووەتەوە کە لە لالەزارەوە بۆ ماڵەوە گەڕاومەتەوە. ئاخر تەماشاکەن. من ئەوم نەدەناسی، من شارەزای ئاکار و تەبیعەتی ئەو نەبووم. تەنها ئەوەندە تێدەگەیشتم کە کارەکانی منی بەلاوە پەسەند نەبوو، ئەو هیچ کاتێك بە شان و باڵی کاری کەسێکدا نەهاتووە. بگرە تەنانەت سەبارەت بە کارەکانی خۆیشی سارد و دڵڕەقانە حوکمی دەدا.

ئەو ئەسڵەن ڕانەهاتبوو خۆشەویستیی خۆی بەرامبەر کارێك کە زۆر بە لایەوە پەسەندیش بووبێت پیشانبدات، من ئەمەم نەدەزانی. ئەو ڕەفتارەی لەگەڵمدا کردی من بە جۆرێکی دی لێکمدایەوە. یادم نییە، بەڵام وا بزانم ئەودەمە بە خۆمم گوت: "دیارە هیچم لە باردا نییە". دەمویست ئەوە بڵێم: ڕەفتاری ئەو تەواو کاری کردە سەر ژیانم.

"لە ڕێی گەڕانەوەمدا بەرەو ماڵەوە بیرم دەکردەوە. مرۆڤ جاری وایە نەزانانە هەڵوەدای شتێك دەبێت، وەختێ ئەو شتەی دەسگیر نابێت، وا هەست دەکات تەنانەت خۆیشی ون کردووە. کاتێ گەیشتمەوە ماڵەوە، سەیرم کرد لاوێك کە ئەو ڕۆژانە بووبوو بە مووی لووتم، لە ژووری میوانەکەمان دانیشتووە. لاوێکی قۆز بوو، باڵای مامناوەندی بوو، تازە بووبوو بە دکتۆر، سەبیلێکی دەگرت بە دەمەوە تا گەورەتر بێتە پێشچاو. بە ئۆتۆمبێل دوام دەکەوت و جاری وا بوو کەیفیشم پێ

دەهات، بەڵام چاوباشقاڵییەکەی وای لێ کردم لێی بێزار بم. ئەگەر ئەو ڕۆژە بەو جۆرە ڕەفتاری لەگەڵدا نەکردمایە، لەوانە بوو ژیانم لەگەڵ ئەو لاوەدا بەسەر ببردایە. ئیتر ئایا بەختەوەر دەبووم یان نەء، ئەوەیان نازانم، بەڵام خۆ دەژیام.. وەك هەموو خەڵکی. سەرنج دەدەن دەمەوێ چی بڵێم؟ ئەو ڕەفتارەی لە کارگەی نیگارکێشانەکەیدا بەرامبەرم نواندی کارێکی تەواوی کردە سەر ژیانم. باسی چیم دەکرد؟ ئا.. ئەو لاوە لە ژوورەکەدا دانیشتبوو. وەختێ چوومە ژوورەوە، بە زمانێك کەزۆر قورس هاتە گوێم، پرسیی: "ئەوە بۆ وا منت دواخست؟ ئەی قەرار نەبوو ئەمشەو بچین بۆ فلانە شوێن؟" وەها بە تووڕەییەوە وەڵامم دایەوە کە نەگبەتە یەکسەر ڕۆیشت و ئیتر هەرگیزاو هەرگیز نەمبینییەوە. لە کاتێکدا ڕاستی دەکرد، بڕیارمان دابوو پێکەوە بچین بۆ ئاهەنگێك کە بە بۆنەی ڕۆژی لەدایکبوونی یەکێك لە هاوڕێکانمانەوە ساز کرابوو. دایکم لە ڕێی فزە سوڵتانەوە ئەو ڕەفتارەی منی لەگەڵ ئەو لاوەدا پێگەیشتەوە و تاچەند ڕۆژێك قرەقری بوو لەگەڵمدا. "لەگەڵ یەکێکی غەریبدا ئاوەها ڕەفتار دەکرێ؟ دەکرێ هەر لە خۆتەوە دڵی خەڵکی لە خۆت بڕەنجێنیت؟ لەقە لە بەختی خۆت بدەیت؟". دوایی بیستبتوومەوە کوڕەکە بە یەکێکی وتبوو: پیاو نازانێت چۆن لەگەڵ ئەم کچەدا ڕەفتار بکات، جاری وایە حەز دەکەیت بە کێردێك ورگی هەڵدڕیت.

"مانگێك بەسەر خۆمدا زاڵ بووم، توانیم ئەو دیدارەی لەبیر خۆم بەرمەوە. بەڵام وەکو گوتم، هەستم دەکرد شتێکم لێ ون بووە، جاران هەموو ئیشێکی من کڕینی بۆیەو فڵچە و کاغەز و قەڵەم و سێپایە بوو. ئەوەی کە دەگمەن و گرانبەها بوو، دەمنارد لە ئەڵمانیا و فەڕەنسا و ئیتالیاوە بۆم بێت. بەڵام لەم مانگەدا خەریکبوو نیگارکێشانم لەبیر دەچووەوە.

"شەوێکیان بەر لە شێو باوکم لێی پرسیم: "ئێستا تۆ ناتەوێ بچیت بۆ لای ماکانی نیگارکێش؟".

باوکم هەمیشە بەر لە شێو چەند پێکێك عەرەقی دەخواردەوە، وەختێ پێکی دووەمی هەڵدەدا سەری گەرم دەبوو و ئەو ساتانەش باشترین سات بوون بکەویتە

قسەکردن لەگەڵیدا. لە دوای پێکی چوارەمەوە ئیدی مەست دەبوو. وتم: "ئاغا گیان، چووم".

–ئێ ئەی چی بوو؟

–ئاغا گیان، ئەو خۆی هیچ نازانێت.

–ئەوە تۆ دەڵێی چی کچم؟ ئاغای صارم الممالك زۆر وەسفی کارەکانی دەکرد، ئەو کابرایەکی پسپۆڕە. ئەی ئەو کارە جوانانەیت نەدیوە کە لە ماڵەوە هەڵیواسیون؟

–ئاغا گیان، تۆ لە من بپرسە، سەری لە هیچ دەرناچێت، ئەسڵەن هەر سەیری کارەکانی منیشی نەکرد، لێیان تێناگات. تەنانەت لە کارگەکەشیدا کاری جوانی خۆیم نەبینی. کابرایەکی چەند بەفیز و لە خۆباییە!

"باوکم ئیتر قسەی نەکرد، لەسەر خواردنەوە زۆر حەزی لە قسەکردن نەدەکرد، پەڕەی ڕۆژنامەیەك کە لە دەستی من یا دایکمدا دەبوو لێی دەسەندین و خۆی پێوە خەریك دەکرد، بەڵام من نەمهێشت.

"ئاغا گیان.."

دایکم سەری بەرزکردەوە و سەیرێکی کردم، ئەو باش دەیزانی وەختێ بەم زمانە قسە لەگەڵ باوکمدا دەکەم، دیارە ئیشێکم پێیەتی، ئەوەشی دەزانی کە باوکم هیچ داوایەکمی ڕەت نەدەکردەوە، بە تایبەتی کاتێ مەراییم بۆ دەکرد.

باوکم وتی: "چی؟"

–بابە دەمەوێ بمنێریت بۆ فەرەنگ تا لەوێ بخوێنم، لێرە کەس نییە لای بخوێنم.

"باوکم لەژێر چاویلکەکەیەوە چاوە بچووکەکانی هێندەی تر بچووك کردەوە. تەماشایەکی کردم، بەڵام هیچی نەوت. دایکم کە لەوسەری قەنەفەکە دانیشتبوو، نێرگەلەی دەکێشا، وتی: "باشە.. زۆر باشە، ئەمەیان لە کوێوە فێر بوویت؟ فەرەنگ دادی کێ دەدات! دەردی خۆت دەڵێیت: ئەوەی لە فەرەنگ گەڕاوەتەوە چ نموونەیەکە تا تۆش بچیت. کچ و چوون بۆ فەرەنگیان نەوتووە".

باوکم سەری لەسەر ڕۆژنامەکە بەرز کردەوە و وتی: ئەگەر کوڕ بووایە قەیدی نەدەکرد؟

–ئاخر ئاغا، تۆ بۆچی ئەو هەر شتێك دەڵێت یەکسەر بە قسەی دەکەیت؟ کێ کچی خۆی بە تاقی تەنیا بۆ فەڕەنگ ناردووە؟

–بۆچی بە تاقی تەنیا؟ ئەی سەرهەنگەکەی لەمەڕ خۆمان سەرپەرشتیاری قوتابییە سەربازییەکان نییە لە پاریس؟

پرسیم: "کام سەرهەنگ؟"

باوکم وتی: "سەرهەنگ ئارام!"

دایکم وتی: "کوڕەکەی خانم خاوەر، ئامۆزای ئاغا گیانت".

پرسیم: "نەمبینیوە؟"

–بۆ نا، بەڵام چوار پێنج ساڵ دەبێت لەوێیە، لەوانەیە یادت نەبێت. باوکم ئیتر قسەی نەکرد، چاویلکەکەی داکەند و چاوێکی لێ داگرتم و وتی: "بیرێکی لێ دەکەمەوە".

"ئیدی دەسبەرداری نەبووم، هەر ئەوەندە دایکم لەوێ نەدەبوو دەچوومە بنکڵێشەی باوکمەوە تا ئاخرییەکەی بۆ فەرەنگ چووم.

"چیتان بۆ باس بکەم، نازانم پێویست دەکات ئەمانەتان بۆ بگێڕمەوە یان نەء، بەڵام وەکو وتم بۆ خۆم باشترە. حەز دەکەم هەموو شتێکتان بۆ بگێڕمەوە".

–بیگێڕنەوە، هەموو ئەمانە بۆ من سوودبەخشن، من سەرەتا کە هۆگری ئەم تابلۆیە بووم، بۆ ئەوە بوو دەمویست بزانم مامۆستا لە دوا ساڵانی تەمەنیدا چ ئازارێکی چەشتووە، بەڵام ئێستا هۆگری ژیانی تۆش بووم و دەبینم تانوپۆی ژیانی ئێوە لەگەڵ ئەودا لێکئالاون، یەکێك تا ئێوە نەناسێت، مامۆستاش ناناسێت.

–کێشەکە لێرەدایە، بە هەڵەداچوونێك هەیە کە جاری وایە خۆشم دووچاری دەبم. کەس منی نەناسیوە، خۆشم خۆمم نەناسیوە، مامۆستاکەی ئێوەش بەهەڵەدا چووە.

–ببەخشن خانم، بەڵام هەموو ئەو کەسانەی کە لە ژیاندا پابەند نین بە بیروباوەڕێکەوە و هەر ڕۆژە و لەسەر پەتێك یاری دەکەن، هەموویان ئاوەها بیر دەکەنەوە.

–ئاغای چاودێر، تکاتان لێ دەکەم وەکو قوتابییەکی قوتابخانە ئامۆژگاریم مەکەن، بەر لە ئێوەش زۆر کەسی تر ئەم جۆرە قسانەی بە ڕووما داوە.

–بەڵام هۆیەك نییە واتان لێ بکات ئەوەندە ئاڵۆزبن.

–گاڵتەم پێ مەکەن، دەبینن کە وانییە، بەدبەختییەکەی منیش لێرەدایە.

ئەم ڕستەیەی بە ئاوازێکی هێندە خەمئامێزەوە گوت کە من پەشیمان  بوومەوە لەو پلارەی تێم گرت.

–دەزانن بۆچی هەموو شتێکتان بۆ باس دەکەم؟ چونکە دوای ئەو، لەو دانیشتنەی نێو کارگەکەیدا، ئێوە سێیەمین پیاون کە وەختێ سەیرم دەکەن هەست دەکەم چاو لە چاوم نابڕن و لەشی منتان ناوێت.

–یەکەمیان مامۆستا بوو، سێیەمیشیان منم، ئەی دووەمیان کێیە؟

–دووەمیشیان کەسێکە کە مامۆستای بە من ناساند. ئەویش ئێستا بە لای منەوە نەماوە. لەبەرئەوە من هیچ شەرم ناکەم و دەمەوێ هەموو شتێکتان بۆ بگێڕمەوە.

چاوەکانی نووقاند و من لێی وردبوومەوە. لووتێکی ڕێك، پرچێکی ڕەشی چین چین، دوو لێوی تەنکی بە حاڵ سوورکراو، بالأیەکی ڕێکی کەمێك کورت، دوو قاچی ڕێکی بەلەك پڕ، هەموو ئەمانە جوان و لەخشتەبەر بوون، بەڵام ڕاستی  کرد، ئەمە یەکەمجار بوو لەم ئافرەتە قەشەنگە وردبیمەوە. یەکسەر ئەو کیژە لاوە نۆزدە ساڵانەم هاتە بەرچاو کە بە تەنیا لە شەقامەکانی پاریسدا پیاسەی دەکرد. بۆ ئەوەی نەهێڵم بکەومە ژێر کاریگەریی ئەو حاڵەتە (خەمزە دەیەی) ئەوەوە، دەستم بە قسە کردەوە و وتم: "وا هەست بکەن من لێرە نیم، وا هەست بکەن تەنها بۆ خۆتان قسە دەکەن، تەنانەت مەشڵێن کە من ئەمەم کرد و ئەوەم نەکرد، بەڵکو بڵێن

ئەو کچە بیست ساڵانە، ناوی بنێن (فەرەنگیس)، خۆتان ناوتان فەرەنگیس نییە، ئێ.. وتتان ئەو کچە بیست ساڵانە، بۆ فەرەنگستان چوو".

"نا.. من نامەوێ بەسەرهاتی ژیانی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە. هیچ شتێکی نوێ لە ژیانی مندا نییە، من نەژیاوم، ژیانی من هەمان ژیانی ئەو کچانەیە کە سەر بەو چینەی منن، هاتوون و چوون، بەبێ ئەوەی تامی بەختەوەری بچێژن و لە مانا ڕاستەقینەکەی بگەن، مردوون و نەماون. چ شتێکی من لای ئێوە سەرنجکێش دەبێت؟ جگە لەوە، هێشتا سەرگوزەشتەی من تەواو نەبووە، من بەشێکم لە بەشەکانی کتێبێك. ژیانی من ئەوەندە بایەخی هەیە کە بە ژیانی ئەوەوە وابەستە بووە. ئەگەر ئەو نەبووایە من هیچ نەبووم. ئاخ، ئەو بوو کە سایەیەکی لە ژیانی ڕاستەقینەی مرۆڤ پیشاندام و من هێندە لاواز بووم، کوێر بووم و نەمتوانی تامی جوانیی ئەو ژیانە بچێژم.

"من دەمەوێ باسی پەیوەندییەکانی خۆمتان بۆ بکەم لەگەڵ ئەودا، بهێڵن با تۆزێك بیر بکەمەوە، ساڵی 1930 وا بزانم ناوەڕاستی ساڵی 30 بوو کە گەیشتمە فەرەنگستان. یەکسەر لە ڕێی ڕوسیا و ئەڵمانەوە چووم بۆ پاریس. لە وێستگەکە سەرهەنگ ئارام هات بۆ پێشوازیم، لە پاریس لە Ecolle des Beauuz Arts"4" خۆم ناونووس کرد و بیرم لەوە کردەوە بخوێنم و فێری نیگارکێشان بم. بۆ وەرگرتن لە E.D.B.A دەبووایە لە پێشدا بە تاقیکردنەوەیەکدا تێپەڕیتایە، بەڵام لە فەڕەنسا بۆ بیانییەکان هەموو کارێك ئاسان دەکرێ، بیانییان دەتوانن هەموو شتێك بخوێنن.ئەگەر هەر هیچیان دەسگیر نەبێ، دەتوانن بڕوانامەیەك وەربگرن. دوو ساڵێکی خایاند تا فێری زمانەکە بووم، بەڵام زۆرتری ویست تا بزانم کەوتوومەتە چ زەلکاوێکەوە. بە ڕواڵەت ژیان لای من بریتی بوو لە هەوەسبازی و ڕابواردن و کات بردنە سەر. بەڵام لە ناوەوە.. هەمیشە خۆم بە بەدبەخت دەزانی و نەمدەزانی چۆن خۆم لەو بەلەنگازییە قوتار بکەم.

"تەماشا کەن، زۆر بەڵا هەیە لە ژیاندا کە بەسەر مرۆڤدا دێت، خۆی بەسەر خۆیدا دەهێنێت، دەرکی پێ ناکات، یان وەختێ دەرکی پێ دەکات کە تازە کار لە

کار ترازاوە. ئەوەی لە من قەوما ئەمە بوو. خۆشترین لەزەت ئەگەر زۆر دووپات بووەوە، دەگۆڕێ بۆ ئازار و موسیبەت. ئەو ڕابواردن و بەرەڵاییەی من ناچاری بوو.نامەوێ پاکانە بۆ خۆم بکەم، هەر لە سەرهەنگ ئارامەوە کە لە من گەورەتر و سەرپەرشتیاری من بوو، تا ئەو لاوە فەرەنسایییە بێ زەوقەی کە نەدەچووە دڵمەوە، هەر یەکە و بە جۆرێك دەیویست ببێتە مێردی کاتی یان هەمیشەییم، من گوناهم نەکردووە تا بمەوێ بەرامبەر هەر مرۆڤێ.. هەر مرۆڤێکی بە ویژدان، پاکانە بۆ خۆم بکەم. نە من مەبەستم پاکانە کردن نییە بۆ خۆم، مەبەستم لەم پێشەکییەم ئەوەیە تا بزانن کاتێك بۆ ئێران گەڕامەوە بە چ جۆرە هەست و سۆز و چ جۆرە بیرکردنەوەیەکەوە چوومەوە لای مامۆستاکەی ئێوە، ماکان، هاوڕێ و کەس و تاقە خۆشەویستەکەم".

"هەموو لەزەتێك کاتێك درێژەی خایاند دەبێتە ئازار و بەڵا. وەختێ باش بیری لێدەکەمەوە؛ ڕەگوڕیشەی ئەم بەدبەختییەم لەو ناز و خۆشگوزەرانییەدا دەبینمەوە کە لە مناڵیمدا لە سایەیدا نەشونمام کرد.

جوانییەکەم بوو بە بەڵای ڕۆحم، جوانییەکەم و هەروەها ژیانێکی بێ چەرمەسەری. ئەم دووانە پێکەوە منیان بەم ڕۆژە ڕەشە گەیاند".

"ناوبانگ، شانازی، ڕێز.. هەموو ئەمانە خۆشن، دڵخۆشکەرن، بەڵام هەر کەسێکی بەناوبانگ بگریت، هەندێ جار حەز دەکات لەنێو خەڵکیدا ون بێت. حەز دەکات بچێتە نێو خەڵکییەوە و لە ناویاندا گڕ بخوات، ئەو لەزەتەی ئەوان دەیچێژن ئەمیش بیچێژێت، ئەو دڵەڕاوکێیەی بەسەر ئەواندا دێت بەسەر ئەمیشدا بێت، ئەودەمە خۆشگوزەرانی بە لایەوە پتر لەزەتبەخش دەبێت. بەڵام کاتێك هەموو کەس ئەو دەناسن و پەنجەی بۆ درێژ ئەکەن، ئیدی ئازادیی خۆی لەدەست دەدات، ئیدی ناوبانگ دەبێتە مایەی دەردەسەری بۆ ئینسان، جوانییەکەی منیش ئاوەها بوو.

لە E.D.B.Aیش کاتێ پرۆفیسۆرە پیرەکە قسەی لەگەڵدا دەکردم، لەبری ئەوەی تەماشای کارە ناشرینەکەم بکات، زیاتر لە چاوەکانم ورد دەبووەوە. ئەسڵەن

ئەوەی لەبیر دەچووەوە کە دەبێ وانەم پێ بڵێتەوە، هەر لە خۆڕایی بە شان و باڵی کارەکەمدا هەڵیدەدا، قوتابییەکان لەسەر من بووبوون بە دوژمنی خوێنخۆری یەکتر. هەریەکەیان و ئەوەی بە ڕووی ئەوی تردا دەدایەوە کە من ڕۆژێك لە ڕۆژان سەرپێیانە ڕوویەکم داوەتێ. ئەودەمە هونەری نیگارکێشان بەلای منەوە جێی هەموو خۆزگەکانی تری دەگرتەوە. خۆشەویستیی مێرد، شانازی، ڕێز.. ئەمانە لە ئاست گڕی حەز و تاسەی هونەردا، دووکەڵێکی چڕی کوێرکەر بوون. ڕۆژێکیان لە کارگەی قوتابخانەکەدا ناگەهان ئەوە سەرنجی ڕاکێشام کە زۆربەی قوتابییەکان خەریکن سێکچی من دەکەن، بەو دواییەش کە لەگەڵ سەرهەنگ ئارامدا بۆ ئاهەنگی شەوانەی باڵیۆزخانەکان و وەزارەتی دەرەوەی فەڕەنسا دەچووم، (ڕۆژنامەگەرەکان) بە وێنەگرتنی من پارەیان پەیدا دەکرد، فەریکە نووسەرێکی فەڕەنسایی یەك ڕۆمانی دەربارەی من نووسی، سەرتاسەری ڕۆمانەکەی باسی خۆشەویستیی یەکێك بوو بەرامبەر کیژێکی هیندی. لە شانۆ، لە سینەما، لە ئاهەنگە مۆسیقاییەکاندا، لە سەیرانگە گشتییەکاندا، لە هاوینەهەوارەکاندا، لە کۆڕی وتارخوێندنەوەکاندا، بۆ هەرکوێیەك دەچووم هەموو چاوەکان لەسەر من بوون، منیش ئەمە ببووە سەرچاوەی ئازار بۆم، هەمووش قسەیان بۆ دروست دەکردم، لە هەمووشیان خراپتر هاونیشتمانییەکانی خۆم بوون، ئەوانە چونکە دەستم بە ڕوویانەوە نابوو، لە هەموو شوێنێك لە پاشملە ئەوەی ناشایستە بوو دەیانوت، تەنانەت یەکێك لەوانە نامەیەکی بۆ باوکم نووسی و شتی وەهای تێدا ڕێکخستبوو کە ئەقڵ نەیدەبڕی.

"باوکم منی زۆر خۆشدەویست و هەر لەبەرئەمەش تەواو متمانەی بە من هەبوو، شتێکی ئاساییشە کە ئەم نامانە هیچ کارێکیان لەسەر ڕەفتاری ئەو نەدەکرد لەگەڵ مندا. ئامان لەو کاتانەی پەیوەندیم لەگەڵ یەکێکیاندا گەرم دەبوو، هەر لەبەرئەوەی سیفەتێکیانم لاپەسەند بوو، ئیدی منیان دەپەرست و ئامادە بوون لەسەر من شەڕەچەقۆ بکەن. بەڵام ئەو خۆشەویستییەی ئەوان منی ئازار دەدا. چەند لاوی باش لەنێو ئەمانەدا هەڵدەکەوتن. خۆشم دەویستن، وەکو برایەك

خۆشم دەویستن، ئامادەبووم لە پێناویاندا هەموو جۆرە فیداکارییەك بکەم، کتێبیان دەدامێ، هەوڵیاندەدا بۆ ژیانێکی باش ڕێنماییم بکەن. جارجار بۆ کاروباری‌سیاسی بەکاریاندەهێنام. بەستە پۆستییەکانیان دەدامێ و من بۆ ئێرانم دەناردن. وەختێ بە یەکەوە دەبوون، دەربارەی نیشتمان و کۆنفرانس و کۆبوونەوە و خۆپیشاندان دەدوان. سەبارەت بە سیاسەت و ستەمکاری و ڕژێمی پۆلیسیی ئێران و هەژاری و کلۆڵیی خەڵك گفتوگۆیان دەکرد و منیش کەیفم دەهات کە خەریکم هۆگری ئەمانە دەبم. بەڵام هەموو ئەمانە یەکەیەکە داوای پەیوەندیی خۆشەویستییان لێ دەکردم و بەهایان لەبەرچاوم کەم دەبووەوە. دەبینن من لەگەڵ چ جۆرە بەدبەختییەکدا دەستەوئێخە بووم. هەموو وابوون تەنها یەکێکیان نەبێت، خۆشبەختانە کە ئەویان دەزگیرانی خۆی هەبوو و لەگەڵیدا دەژیا. منیش توانیبووم ئەو کیژە نەرمونیانە دڵنیا بکەم کە چاوم لەسەر دەزگیرانەکەی نییە. ئەمە تاقە کچێك بوو کە منی خۆشدەویست و خوا دەزانێ، ڕەنگە ئێستەش هەر خۆشی بوێم. هەر ئەم لاوەش کە نیگارکێشانی دەخوێند و هەمیشە بیمار و ناساغ بوو، بووە هۆی ئەوەی کە من لە فەرەنگ هەر لە ساڵی چوارەمم بەدواوە هەمیشە بیرم لای مامۆستا بێت و وەختێ بۆ ئێران هاتمەوە، هیچ چارێکم نەما ئەوە نەبێت کە ئەو ببینم و هەموو توانای خۆم بۆ ئەو تەرخان بکەم.

"لەم کوڕە لاوە بەولاوە، ئەوانی تر کەسانێك بوون کە لە نەبەردیاندا لەگەڵ مندا تێکدەشکان و یان بە هیوای سەرکەوتن بەسەر مندا کۆشکیان لە خەیاڵی خۆیاندا بنیاد دەنا. دەشزانن ئەنجامی ئەمانە چی بوو؟ من پێتان دەڵێم، بەوپەڕی ڕاشکاوییەوە پێتان دەڵێم، تا پاشان ئاسانتر بتوانم بەرگری لە خۆم بکەم، تا پاشان بتوانم باوەڕتان پێ بهێنم کە مامۆستا چەند بەهەڵەدا چووە. ئەو چاوانەی کە کردوونی هی من نین. دەزانن ئەنجامەکان بەچی دەگەیشتن؟ ئەنجامەکان بەوە دەگەیشتن کە من ڕقم لەم عاشقە دەبەنگانە هەڵدەستا و لە ئازاردانیان چێژم دەبینی، کەیفم دەهات پێوەیان بدەم، ئەوان چەند دێوانەتر دەبوون؛ من

مەسەلەکەم سەختتر دەگرت، ئیدی ژیانی من بووبوو بەوە. نیگارکێشان، خوێندن لە فەرەنگستان لە E.D.B.A، ئەمانە بەلامەوە تەنها بووبوونە وەسیلەیەکی خۆخەریککردن و بەس.

"با ڕووداوێکتان بۆ بگێڕمەوە کە لە ژیانمدا ڕوویداوە، گەرچی پەیوەندیی بە ژیانی مامۆستاوە نییە، بەڵام حەز دەکەم ئەم شتە چۆن ڕوویداوە ئاوەها بۆتانی بگێڕمەوە. وا هەست دەکەم ئەودەمە باشتر من دەناسن".

"لەنێو قوتابییە هاوپۆلەکانمدا لە E.D.B.A کوڕێکی ئیتالیایی هەبوو ناوی دۆناتێللۆ بوو. پیاوێکی چوارشانەی بەژنوبالا ڕێکوپێکی زۆر قۆز بوو. قژی قەترانی، چاوی ڕەش، برۆکانی پڕ و لووتێکی قەڵەمی و دەم و لێوێکی شەهوەتئەنگێزی هەبوو، بە تەماشایەك دڵی دەپێکا. بەڵام من گاڵتەم بەوچاوە ڕەش و نیگا توندوتیژانەی دەهات، تەریق نەدەبوومەوە، کەمڕووش نەبوو، تا وای لێ هاتسیوای بوومەوە. هەر وەختێ لە قوتابخانە بەرامبەری دەبوومەوە؛ دەمبینی لەژێر چاوەوە سەیرم دەکات و هەر ئەوەندە ڕووم تێ دەکرد یەکسەر تەماشای لایەکی تری دەکرد، وەك ئەوەی ئەسڵەن منی هەر نەبینیبێت.

"دوای سێ چوار ساڵ ژیان لە پاریسدا، تەواوی یاری و پێچوپەناکانی عاشقەکان شارەزا بووم. یەکێك چاونەترس و بێشەرم بوو: دەهات، شتی خۆی دەگوت، گورزی دەخوارد و دەڕۆیشت، یەکێك هەست و سۆز لە سەروسیمای دەباری و بە شیعر و مۆسیقا لێم نزیك دەبووەوە، دەیویست دڵۆپ دڵۆپ شەپۆلە سەر شارەکانی عیشقی پڕ کڵپەی بەسەرمدا بباریێنێت. هەندێك لێهاتوو نین و بە عیشقی ئەفلاتونی دەبنە مووی لووتی مرۆڤ. هەندێکی تر هەتەر و سەرسەختن. ئامان لەدەست ئەمانە کە مرۆڤ جاڕس دەکەن و، من زۆر باش دەمزانی لەگەڵ هەر یەکێکیاندا دەبێ چۆن ڕەفتار بکرێ.

"ئەم ئیتالیاییە کە تەمەنی بیست و حەوت هەشت ساڵێك دەبوو لە هەموویان پێکەنیناویتر دەهاتە بەرچاوم، نەهێنیپۆش بوو و خۆی دەخواردەوە. تەنانەت ئومێدیشم پێ دەدا، بەڵام نزیك نەدەبووەوە. یەك دوو جار زەردەخەنەم تێ گرت،

جارێك لە چاوەكانی ورد بوومەوە، لە پۆلدا، لە نزیك ئەوەوە دادەنیشتم و بە جۆرێك كە ئەوانی دی تێنەگەن فڵچەكەم فرێدەدایە سەر زەوییەكە، نزیك پێی ئەوەوە. بەڵام ئەو خۆی تێنەدەگەیاند. لە هەمانكاتیشدا پێوەیشی دیاربوو كە شەیدای منە.

"شەوێكیان پێڕێك بووین چووین بۆ Bois de Boulogne "بۆدۆبۆلۆنی". سەرەتای شەو بوو و هەوا ساف و مانگەشەویش بوو. بەنێو دارستانەكاندا دەڕۆیشتین. ئەوان هەریەكە و بە زمانی خۆی لە ئاوازێكی دەچڕی، زۆربەیان قوتابیی E.D.B.A بوون و زۆربەشیان كچ بوون. وەختێ پیاوان بە لایاندا تێدەپەڕین دەیاندایە قریوەی پێكەنین. ئەو پێكەنینە ناشرینەیان منی بێتاقەت كرد. وردە وردە خۆم لێیان جیاكردەوە و بە تەنیا بۆ Pavillon "پاڤییون" چووم. كافتریایەكی خۆشە. ناكاو سەیرم كرد دۆناتیللۆ لەسەر مێزێك دانیشتووە و پێكێك شەرابی لەبەر دەمدایە و پەیتاپەیتا جگەرە دەكێشێت. منیش یەكراست چوومە سەر مێزەكەی ئەو.

"لە دوورەوە منی بینی. سەری بەرزكردەوە و بە چاوە درشتە رەشەكانی تەماشایەكی كردم. وتم: "ئیجازە هەیە لەسەر مێزەكەی ئێوە دابنیشم؟" لە جێی خۆی هەڵنەسا، بە دەستی ئاماژەی بۆ كردم. كورسیی بەتاڵ لەسەر مێزەكە نەبوو. ناچار هەڵسا، كورسییەكەی خۆی خستە ئەملاوە و دای بە من. ماوەیەك بە پێوە وەستا تا گارسۆنێك پەیدا بوو و كورسییەكی بەتاڵی بۆ هێنا.

"تەپلەكێك پڕ بوو لە ئاغزە جگەرە. هەندێكیانی تەواو نەكێشابوو، كوژاندبوونییەوە و دیاربوو ئالوودەی جگەرەكێشان نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەیكێشا. هەركە دانیشت، جگەرەكەی كوژاندەوەو. پرسیی: "چیتان دەوێ؟" وتم: "راسپێرن پێكێك شەرابیش بۆ من بێت، ئەوسا شێو دەخۆین". گفتوگۆ لە نێوانماندا دروست نەبوو. دانیشتبوو جگەرەی دەكێشا، دەربارەی مانگەشەو و، پاریس و قوتابییەكانی دیكە و هاوڕێكانی خۆم قسەم بۆ كرد، بەڵام بێهوودە بوو. ئینجا دەربارەی هونەر قسەم كرد، بە وردی ئەوەم روون كردەوە كە (هونەردۆست)

لە هونەرمەندەکە خۆی زیاتر چێژ لەکاری هونەریدەبینێت و هەر هونەرمەندێك بگرێت لە کاری خۆی ناقایلە، تەنانەت ئەگەر شاکاریش بێت. هەمیشە دەیەوێت شتی باشتر و جوانتر بخولقێنێت. هەمیشە دەتوانێت خەوشی کارەکانی خۆی ببینێت. هونەرمەند باشترین رەخنەگری کارەکانی خۆیەتی. بەڵام بینەر نوقمی چێژ دەبێت، زۆربەی خەلکی کەموکوورییەکانی کارە هونەرییەکانی دەرك پێ ناکەن، تەنها جوانییەکانی دەبینن.

"چاوەڕێی بووم بە پێچەوانەی منەوە رابدات و گفتوگۆ بێتە گۆڕێ و، بیهێنمە قسەو پاشانیش بە دەموچاوە جوانەکەم سیحری لێ بکەم. کاتێ خۆشەویستیی خۆشی بۆ خستمە روو، گاڵتەی پێ بکەم و لە شەری ئەمیشیان خۆم لابدەم، بەڵام نەدەچووە ژێر بار، جگەرەی دەکیشا و بۆ ئەوەی من هەراسان نەکات، دووکەڵەکەی دەکرد بە ئاسماندا، کاتێك سەری بەرز دەکردەوە، لە پێستە سپییەکەیەوە دەمارەکانی ژێر ملی دیاربوون کە شین هەڵگەرابوون و هەستم پێکرد کە هەڵدەلەرزێت، کەچی ویرای ئەوەش سارد دانیشتبوو و هیچی نەدەگوت.

"پاشان پرسیارم لێکرد. بە زمانێکی توندوتیژەوە وەڵامێکی پچرپچری دامەوە.

"شیومان خوارد. بوتلێك Graver Superier (گراڤ سوپریوەر)یان هێنا. زۆربەی ئەو خواردییەوە و من هەر لێوم پێ تەر کرد. تاقە شتێك کە لێم هەڵکران ئەوە بوو کە باوکی لە وەزارەتی دەرەوەی ئیتالیای فاشیستدا خاوەن پلەوپایەیەکی گەورەیە.

"تاقەتم چوو. وتم با پێکەوە تۆزێك پیاسە بکەین و پاشانیش من بگەیەنێتەوە ماڵەوە. بە قسەی کردم، وەختێ بە کەنار دەریاچەی Bide de Boulogneدا تێپەرین، سەیرم کرد بەلەمی کرێ هەیە، وتم: "سواری بەلەم ببین" پێی خۆش بوو. لێم پرسی: "دەزانی سەول لێ بدەیت؟" سەرێکی راوەشاند.

"سەرەتا خۆی چووە ناو بەلەمەکەوە. پاشان دەستی منی گرت تا یارمەتیم بدات. من توند دەستیم گوشی، بەو بیانووەی گوایە خەریکە دەکەوم، خۆم بە قۆلییەوە نووساند، بەڵام ئەو هیچ بایەخیکی بەوە نەدا. باوەرم نەدەکرد، دیارە هیشتا دلنیا نییە، من لە دلی خۆمدا وام بیردەکردەوە.

"منی لەسەر تەختەی پشتەوەی بەلەمەکە دانیشاند. لەگەل هەر سەوللیدانیکدا مانگ لەنیو ئاوەکەدا پارچەپارچە دەبوو و یەکسەر هەولی دەدایەوە بچیتەوە سەر دۆخی پیشووی، بەڵام سەرلەنویٚ لەتری دەدایەوە.

"دۆناتیللۆ جگەرەی بە دەمەوە بوو، بە جۆریك کاتیك وەڵامی دەدایەوە قسەکانی دەجووەوە. وردەوردە لەبەرخۆیەوە دەستی بە گۆرانی وتن کرد. دەنگیکی گری هەبوو، پاشان جگەرەکەی فریدایە ئاوەکەوە. بە بازووە پتەوەکانیتوندتر ئاوەکەی دەشکاندەوە و دەنگیشی بەرزکردەوە، بە ئاوازیکی خرۆشینەرەوە گۆرانییەکەی دەچری، لە دلی خۆمدا بیرم کردەوە چەند بەسزمانە. دلم بە حالی سووتا، لە پریکدا رقم هەلسا، لە خۆمم پرسی ئەی کەواتە بۆچی وەها هەراسانم دەکەن، ویستم پیی بلیم کە بگەریتەوە. بەڵام راستییەکەی دەنگی بە رادەیەك دلرفین بوو کە پرکیشیی ئەوەم نەکرد. کە گۆرانییەکەی تەواوبوو، لە جیی خۆم هەلسام، هەنگاویك لیی چوومە پیشەوە و پشتی ملیم ماچ کرد. بەلەمەکە لەتریکی دا، هیندەی نەمابوو وەربگەریت. بەڵام دۆناتیللۆ ناکاو وەکو پلنگیك کە بەیەك شاڵاو پەلاماری نیچیرەکەی بدات، خۆی راپسکاند و توند بە بازووە پتەوەکانی گرتمی و بە رادەیەك گوشیمی کە خەریکبوو بمفلیقینیتەوە و دەستی کرد بە ماچکردنی سەر و دەموچاوم.

"هەر کە دەرفەتی پەیدا دەکرد، بە ئیتالیایی قسەی دەکرد، شتی وەهای دەوت کە من لیی تینەدەگەیشتم. تەنها ئەم رستەیەشم بیرماوە. دەیوت:

Ti volio bene"5" "من تۆم خۆش دەویت".

"خۆم لە چنگی رزگار کرد. لای خۆیەوە منی دانیشاند، ناگەهان تەلیسمەکە شکا و کەوتە قسە، نیوەی ئیتالیایی و نیوەی فەرەنسایی، هەمان ئەو قسانەی

دەوتەوە کە هەموو عاشقە گێلەکان دەیڵێنەوە.. خەمێك دایگرتم. پێم گوت با بگەڕێینەوە. ئیدی بەبێ ئەوەی قسەیەکی لەگەڵدا بکەم و بێدەنگییەکە بشکێنم، بە تاکسی بۆ پاریس گەڕاینەوە. گەشتی بەلەمەکەمان سەعاتێکی خایاند.

"لای دەرگای ماڵەوە، هەر ئەوەندە دەرگاوانەکە دەرگاکەی کردەوە، بە دەم پێکەنینەوە خواحافیزیم لێ کرد، لێی پرسیم: "کەی یەکدی ببینینەوە". پشتم تێکرد و چوومەوە بۆ ئاپارتمانەکەی خۆم.

"ماوەیەك لەسەر قەرەوێڵەکە دانیشتم، خەمێکی گران دایگرتم و دەستی لێهەڵنەدەگرتم. خەوم لێ نەدەکەوت، ماچەکانی ئەم کابرا توندوتیژەم ساختە و قێزەون دەهاتە بەرچاو. دەستم دایە کتێبێك و ئەو چیرۆکەم لەبیر خۆم بردەوە.

"بۆ بەیانیی ڕۆژی داهاتوو؛ وەختێ بۆ قوتابخانە چووم، لەبەر دەرگای قوتابخانەکە وەستابوو و بە دەم پێکەنینەوە بەرەوڕووم هات. بە ڕوویەکی خۆشەوە وەڵامم دایەوە، بە یەکەوە بە داڵانەکەدا ڕۆیشتین. بەڵام ئەو دەمامکە ساختەیە کە لە کاتی گفتوگۆ لەگەڵ دڵدارەکانمدا دەمکردە ڕووم ئەو ڕۆژەش کردبوومە ڕووم. چەند هەوڵیدا ئەو دەمامکە لە ڕووم هەڵبگرێت؛ نەیتوانی. دەمەو نیوەڕۆ بە سیمایەکی شەیدایانەوە پێی وتم: "ئەمڕۆ پاشنیوەڕۆ دێم بۆ لات تا پێکەوە بین"

وتم: "پاشنیوەڕۆ وەختم نییە".

"هەر بە ڕاستیش وەختم نەبوو، لەگەڵ سەرهەنگەکەی ئامۆزای باوکمدا وادەمان بوو یەکتر ببینین.

پرسیی: "ئەی شەو؟" وتم: "تا هەفتەیەکی دی کاتم نییە. جگە لەوە ئەوە نییە هەموو ڕۆژێك یەکدی دەبینین..".

فەرەنگیس لێرەدا وەستا.. چاوەکانی دەبریسکانەوە. لەوە دەچوو تەڕیش بووبن.. وتم: "خانم فەرەنگیس، پاشماوەکەی تەواو بکە".

"پاشماوەی نییە، هەڵبەتە ئێوە تێدەگەن کە من بە تەنها دڵگرانی دۆناتێللۆ نیم، دەزانن ئەم ڕووداوە چەند کاری لێ کردم؟ هێندەی ترشیی دەنکە ترێیەکی

ترش کە دوای هێشـوویەکی شـیرین لـە زارتـدا جێـی دەهێڵێـت. ئـەو ڕۆژانـە لـە سەرانسەری ئەوروپادا فیلمێك باو بوو کە گۆرانییەکەی ئەو فیلمەیان لە هەموو کافتیریایـەکدا لێدەدایـەوە. نە ئاوازی گۆرانییەکە و نـە دەقـی شـیعرەکەیم لـەیاد نەماوە. بەڵام ناوەڕۆکەکەی دەڵێت:

من سەراپا بۆ خۆشەویستی خولقاوم
ئیدی چ کارێکی دیکەم پێ ناکرێ
پیاوان وەکو پێشکە بە دەوری منی شەمدا باڵەفرێ دەکەن
ئەوان کە بە گڕی من پەڕو باڵی خۆیان دەسووتێنن
گوناهی من چییە؟..".

ئایا ئیتر نەیدەویست شتێکی دی بڵێت؟ پرکێشیم نـەکرد هیچـی لێ بپرسـم. تەنها دوا دێڕی شیعرەکەم دووپات کردەوە: "ئـەوان کە بـە گـڕی مـن پـەڕوباڵی خۆیان دەسووتێنن.. گوناهی من چییە..".

پێکە کۆنیاکەکەی هەڵگرت. تاوێك لە ڕەنگە زێڕینەکەی ورد بووەوە و وتـی: "هیچ.. ئیـدی چاوم بـە دۆنـاتێللۆ نەکەوتـەوە.. دوای هەفتەیـەك تەرمەکـەیان لـە دەریاچەی Bois de Boulogneدا دۆزییەوە".

–دەڵێن چی؟!!

–نازانم.

–بەڵایەکی واشتان بەسەر مامۆستادا نەهێنابێت؟

–نا، نا! بەمجۆرە مەدوێن. ئێوە هێشتا منتان نەناسیوە. من تەنها لایـەنێکی ژیانی خۆمم پیشان دان. ئەمانە هەموو مناڵە وردکـە بـوون. ئەمانـە نرخیـان لـە ژیانی مندا نەبوو، بەڵام ماکان منی ئەنجن ئەنجن کرد.

ئەو لەو جۆرانە نەبوو یاریی لەگەڵدا بکرێ. پاشـان ئێـوە وا دەزانـن مـن بـە دەستی خۆم بووە کە بەو جۆرە یاری لەگەڵ ئەو بابایانەدا بکەم؟ نەخێر، وانییە. ئەژدیهایـەك لـە نـاخمدا خـۆی مـەڵاس داوە، تـەواوی تەمـەنم لەگـەڵیدا لـە

کێشمەکێشدا بووم. ئەوە کە لە ناوەوە دەمخوات و لە دەریشەوە وەك دڕندەیەك پیشانم دەدات و..

قسەکەی تەواو نەکرد، چەند دەقیقەیەك بێدەنگ بوو. چاوی لە زەوییەکە بڕیبوو.

زەردەخەنەیەکی خەماوی دەوری لێوی تەنی. ماوەیەك لێی ورد بوومەوە. لەو دەموچاوە پاکیزەیەدا بە دوا ئاسەواری شەیتانیدا دەگەڕام، بەڵام ئێستا هیچ ڕەمزێکی پەنهانم لە چاوەکانیدا نەدەبینی. ئافرەتێکی بەدبەختم دەبینی کە بەرامبەرم دانیشتووە و دان بە گوناهەکانی خۆیدا دەنێت. وەڕینی سەگێك لە باخچەی هاوسێکەوە و هۆڕنی ئۆتۆمبیلێك لە دوورەوە خامۆشییەکەی شکاند، ناکاو بزاوتێکی کرد. سەرلەنوێ سیمای کرایەوە و دەستی بە قسان کردەوە.

"چاوپێکەوتنەکەی مامۆستام لە کارگەی نیگارکێشانەکەیدا بە تەواوی لەبیر چووبووەوە. بیرەوەرییەك بوو خەریکبوو فەرامۆش دەبوو. ئەوەندەی نەمابوو کە هەر بە تەواوی لە یادم بچێتەوە. بەڵام ڕووداوێك سەرلەنوێ مامۆستای هێنایەوە یادم و ژیانی منی بە ژیانی ئەوەوە بەستەوە.

"ژیانی ئەورووپا و تەواوی خۆشی و ڕابواردنەکانی وردەوردە لام بوونە شتێکی بێزراوو جاڕسکەر. ئەو عیشقەی سەرەتا بۆ هونەر هەمبوو، دەسبەردارم بووبوو. زۆربەی ئەو کەسانەی بەدوا شکاری ئەم مەلە پەڕوپاڵ ڕەنگینەدا دەڕۆن و ڕێی پڕ بەڵای هونەرمەند دەگرنە بەر؛ لە نیوەی ڕێدا جێدەمێنن. لە سەدا نەوەدیان جێ دەمێنن و دەکەی تریش هێندە لەخۆبایین کە مرۆڤ دەستی بە دامێنیان ناگات. بەڵام هونەرمەندی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە کەسێتیی خۆی لە هونەرەکەیدا تواندبێتەوە و ئامێتەی کرد بێت. هەر بۆیە هونەرمەند بە پلەی یەکەم دەبێ مرۆڤ بێت.

"ئاخ ئاغای چاودێر، ئەم شتانە بە قسە چەند ئاسانن. ڕاستییەکەی پەند و ئامۆژگاری کارێکی فرە ئاسانە. ئەوانەی لە E.D.B.A لە دەورووپشتم بوون پتر هونەرەکەیان وەکو هۆیەکی کات بەسەربردن تەماشا دەکرد و هێندە خۆیان

ماندوو نەدەکرد کە ئازاری ناکامی بچێژن تا بتوانن لەزەتی سەرکەوتن بە چنگ بهێنن. ژیانی زۆربەیان مەیسەر بوو، بۆیە خووشیان دابووە نیگارکێشان چونکە بەلایانەوە لە گشت کارێکی دی ئاسانتر بوو. ئەمانە باوکە دەوڵەمەندەکانی خۆیان باوەڕپێهێنابوو کە دەیانەوێ کارێك بۆ خۆیان هەڵبژێرن. ساڵی هەزاران کەس لەم نیگارکێشانە بەمجۆرە قوتابخانە تەواو دەکەن، بەڵام لەهەر سەدەیەکدا کۆمەڵگا دوو سێ نیگارکێشی هونەرمەند بە مرۆڤایەتی دەبەخشێت.

ئەو شتەی کە ئەو ڕۆژە هەستم پێکرد کاتێك ئەوم بینی لە تاران و لە نهۆمی سەرەوەی خانوویەکی سەیر و تاریکەوە هاتمە دەرێ بۆ سەر شەقامی لالەزار، پاش چوار ساڵ لە پاریس، لەو دەڤەرەدا.. کە جوانیی ئەفسووناوی لەهەر سەرە کۆلانێك و هەر باخ و هەر ئاهەنگێك و، هەر شانۆیەك و تەنانەت لادێ بچووکەکانیشدا ڕەگوڕیشەی دڵ دەردەهێنێت، ئەو هەستە بە هەموو مانا و تەبعی تراژیکییەوە دایگرتمەوە: چەند حەزم دەکرد بمتوانیایە ئەوەتان بۆ ڕوونبکەمەوە کە ئەم هەست بەبێ بەهرەیی و بێ دەسەڵاتییە چۆن خزایە نێو ناخمەوە. یان چ ئازارێکم چەشت وەختێ ناچار بووم ئەو ڕاستییە تاڵەی کە دەرکم پێکردبوو بە باوکم ڕابگەیەنم.

"حەزتان لە مۆسیقا نییە؟. من بەچێژترین ساتەکانی تەمەنم ئەو ساتانەیە کە ئاوازێکی مۆسیقایی خۆش دەمخرۆشێنێت. سەیر ئەوەیە کە بەردەوامیش وا نیم، جاری وایە تەنانەت مۆسیقاش جاڕس و ماندووم دەکات.

"نازانم بۆچی باسی مۆسیقاتان بۆ دەکەم؟ لەو سیمفۆنیانەدا جاری وایە ئاوازێکی هێمن و کەمخایەن لە میانی ژاوەژاوی ئۆرکستراوە دێتە گوێت. ئەم ئاوازە سووك و ناسکە، بەڵام لە دڵتدا دەنیشێت. هەمیشەش چاوەڕێی دەکەیت، ئەم دەنگە نەرمە دووپات دەبێتەوە، ئەمجارەیان لە جاری یەکەم پتر لە دڵتدا دەنیشێت. وردە وردە تەواوی ئۆرکستراکە پێکەوە هەمان ئاوازی دڵنشین بە جۆرێك دەژەنن کە ئیدی دەسەڵاتت لەدەست وەردەگرن. بەڵا جەرگبڕەکانیش بەمجۆرە پەیدا دەبن. مرۆڤ سەرەتا پەی بە قووڵاییان نابات، جارجار خۆیان

پیشاندەدەن و ون دەبن، بەڵام ناگەهان تەواوی ئۆرکستراکە دێنە دەنگ. ئەودەمە ئەشك لە چاوانت دەبارێ و خۆشت نازانیت بۆچی دەگریت.

"پاش یەکەم چاوپێکەوتنم لەگەڵ ئەودا، هەستکردن بەو کارەساتە، ئەو ئازارە بێسنوورەی کە بێ بەهرەم، هەروەکو ئەو ئاوازە جەرگبڕە خۆی پیشاندام و وەڵێ خۆی حەشار دایەوە. بەڵام وەختێ تەواوی فشاری ئەو هەستەم دەچەشت، ڕاستەوڕاست دەچووم و چەندان سەعات گوێم بۆ مۆسیقا دەدێرا و هەرکە گریانم دەهاتێ بە خۆمم دەوت: نازانم بۆچی دەگریم، من بۆ حاڵی خۆم دەگریم، ئەودەمە، ئەو عاشقە دەبەنگانە کە ئەم حاڵەتەی منیان دەبینی وایاندەزانی ئەم گریانەم گریانی پەرێشانییە بۆ ئەوان، یان هینی ئەوەیە زۆر ناسکم و هەر لە خۆمەوە دڵم پڕ دەبێت.. ئاخ..".

فەرەنگیس چاوەکانی نووقاند، هەروەها دەستە بچووکەکانیشی. ئاخێزێکی توندی بە لەشی کرد. من بزاوتی توندی سنگیم دەبینی.

"نیگارکێشان، وەك ئەوەی نیگاری شتێك بکێشیت، یان هێڵی تەریب و ڕەنگی گونجاو لای یەکەوە دابنێیت، ئەمە شتێکە کە دەتوانیت لە قوتابخانە فێری ببیت. ئەمانە دەستوور و ڕێسای خۆیان هەیە و هەر کەسێك بیەوێت لە ماوەی چەند ساڵێکدا فێریان دەبێت. منیش ئەمانەم دەزانی، بەڵام ئەوەی کە ئەو ڕۆژانە توانام بەسەریدا نەدەشکایەوە، خولقاندنی دونیا و حاڵاتی جیاجیا بوو، واتە کارێکی هونەریی ڕاستەقینە. ئەو شادییەی کە لە ژیانتدا هەستت پێکردووە، ئەو ئازارەی کە چەشتووتە، ئەو پەرێشانیەی کە لە ڕووداوێکدا دووچاری بوویت، ئەو زەبوونییەی کە بەرگەت گرتووە، چاوەڕوانی، پەرۆشی، دڵەڕاوکێ، ترس، تەنیایی، حەسرەت، ناکامی، بێکەسی، ڕەنگدانەوەی ئەمانە. بە جۆرێك کە بینەر هەست بە هەمان ئەو شتانە بکات. فێربوونی ئەمە شتێکی دژوارە و لە دەستی مامۆستاکەتدا نییە، با شێت و شەیدای جوانییەکەشت بێت.

"حەزم دەکرد لە کارێکی هونەریمدا ئەو جۆش و خرۆشەی کە لە ناوەوەمدایە، ئەو ئەژدیهایەی کە بۆ خراپە و بەدی هانم دەدات، ئەو دڕندەیەی کە

چنگی لە دەروونم گیرکردووە، بەرجەستە بێت. من کەسێکم شك نەدەبرد، ئەوانەی کە دەوروخولیان دابووم، گوێیان بە دڵە ئینسانییەکەی من نەدەدا، لە مناڵیشمەوە خوشکێکم شك نەبردووە تا سکاڵای دەروونمی بۆ بکەم. هێندەی بیرم بێت، کیژەکانی هاوڕێشم، ئێرەییان پێ دەبردم. دونیای دایکیشم دونیایەکی دیکە بوو، کتێبی دووعا، سەر بەرماڵ، تەسبیحات، نێرگەلە و شازادە عەبدولعەزیم و قوم دەیانتوانی لە ژیاندا قایلی بکەن. ئەو وەختەی خۆش بوو کە لەگەڵ خاوەر سوڵتان و ئەمینەلحاجییە و خانم عیرفاندا دابنیشێت، نێرگەلە بکێشێت و غەیبەتی خەڵکی بکات.

"باوکم زۆر پیر بوو، گەرچی دڵێکی میهرەبانی هەبوو، بەڵام لاوێتیی بە خۆیەوە نەبینیبوو، هەموو شتێکیشی لە تێڕوانینی خۆیەوە بە باش یان خراپ دادەنا. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵیدەدا بێدڵیم نەکات، بۆ من تاقە ئومێدێك کە مابووەوە ئەوە بوو خۆم بە نیگارکێشانەوە سەرگەرم بکەم و تا گەورەتریش دەبووم هەستم دەکرد ئەم کارە زۆر سەختە و گاڵتە نییە. دەمویست ڕازی دەروونم لەگەڵ هونەرەکەی خۆمدا بکەم و ئەوەی کە ناتوانم بە قسە بیڵێم لە ڕێی هونەرەکەمەوە دەریببڕم. حەزم دەکرد بمتوانیایە بە خۆمم بگوتایە کە بۆچی هیچ شتێك نییە لەم ژیانەدا من خۆشنوود بکات. حەزم دەکرد ئینسانێکم خۆشبویستبایە و هەموو شتێکم بکردایە بە قوربانی ئەو. حەزم دەکرد هیچ نەبێت ئەو شتەی کە بەلای منەوە پەنهانە، بمتوانیبایە لە تابلۆیەکدا بیخەمە ڕوو. ئەمە ئەو موسیبەتەیە کە بە دەم ئاسانە. بە ڕستەیەك کۆتایی دێت. بەڵام ئەی ئەگەر مرۆڤ تەمەنێك ئەو ئازارە بچێژێت و هەر ڕۆژە و بە شێوەیەکی تازە خۆی بنوێنێت. حەزم دەکرد یەکێك لەو حاڵەتە تێپەڕانەم بە ڕەنگ و هێڵی جوان بخستایەتە ڕوو.

"دەزانن کاتێك پەیم بەم حەقیقەتە برد چیم لێهات؟ ئیدی لە هەموو شتەکان نائومێد بووم. بە ڕاستی پێتان بڵێم تەنانەت بیرم لە خۆکوشتنیش کردەوە، ڕۆژێکیان بە تەنیا بۆ هەمان دەریاچەی Bois de Boulogne ڕۆیشتم و لەوێ سواری

بەلەم بووم و سەوڵم لێدا و لە ناکاو بروسکەیەك لە مێشکمی دا کە منیش وەکو دۆناتێللۆ بکەم. کە چاوم بە ئاوی لێڵی دەریاچەکە کەوت، دنیا لام ڕەش بوو، ترسام و گاڵتەم بە دەبەنگیی خۆم کرد.

"کاتێك شتێکم دەربارەی ژیانی خۆم بۆ ئەو لاوە ڕەنگزەردە باس کرد کە لە "مورنپارس" Montparnasse دەژیا و مینیاتۆری دەفرۆشت پێی وتم: "تەمەڵییە. برۆ کار بکە تا تامی ژیان بچێژیت" ڕاستی کرد. ئەو تەمەڵییە یەکێك بوو لە ئەدگارەکانی کەسێتیم. کاتێك منداڵ بووم، فزە سوڵتانم بانگ دەکرد بێت و لەسەر کورسییەکە ئاو بکات بە دەممەوە. من بە منداڵی ئاوەها پەروەردە کرابووم. ئیدی چۆن دەمتوانی کار بکەم؟

"سەرکەوتن بەسەر پەیژەی بەرزی هونەردا پێویستی بە سەرێکی نەترس و خۆڕاگر هەیە؛ کە من لە خۆمدا شکم نەدەبرد، نەمدەتوانی بە سەعات و بە مانگ و ساڵ بە دیار کارێکەوە دابنیشم تا بە ڕەنگ و هێڵ دەموچاوی مرۆڤێ دەربهێنم. ئەو حەوسەڵەیەم پێ نەدرابوو. من هەمیشە کام ڕێیە ئاسان بوایە ئەوەم دەگرتە بەر. ئەوانی دی بە تاقەت بوون و من ئەوەم دەزانی، خۆم هەڵدەخەڵەتاند. کاریشم دەکرد، بەڵام بە نیوەناچڵی جێمدەهێشت. کەیف و ڕابواردن بە سەرمدا زاڵ بوو، هەر ڕۆژە لەسەر بەزمێك بووم.

"ئاخ، مامۆستا، مامۆستاکەی ئێوە لەم ڕووەوە مرۆڤێکی سەیر بوو، گەر من بەو جۆرە بمناسیبایە کە وەختێ بۆ ئێران گەڕامەوە ناسیم، ژیانی من جۆرێکی دیکە دەبوو، من جورئەت ناکەم، تەنانەت کاتێك ڕوخساریشیم دێتەوە یاد، قسەیەکی نابەجێی پێ بڵێم. بەڵام مامۆستاکەی ئێوە و، تاقە خۆشەویستەکەی من، زۆر زوڵمی لە من کرد.

"ئەو تابلۆیەی کە ئێوە لە مۆزەخانەکە بۆتان شیکردمەوە. مەبەستم تابلۆی خانووی ڕەشوڕووتەکانە، سێ ساڵی ڕەبەق پێوەی خەریك بوو. سەدان سکێچی بۆ کردبوو، لە سیمای ئەو پیرەمێردە دێهاتییە ورد بوونەتەوە؟ دەزانن چەند سادەیی و ترس و تەنیایی تیا پەنهانە؟ ئەو پیاوە کابرایەکی دنیادیدە و دڵ و

دەروون ڕوونە. لە تەمەنیدا چەند شا چوونەتە سەر تەخت و ڕۆیشتوون. دوو سێ جار ئەودنیای بە چاوی خۆی بینیوە. خۆشی هەر بەم وشانە دەربارەی پیرەمێردەکە بۆم دوا. ڕەنگە بیست جار هێڵەکانی دەموچاوی گۆڕیبێت. چەندان کاژێر لە دارستانەکانی مازندەراندا دادەنیشت و نیگاری درەختەکانی دەکێشا، تا باشترین حاڵەتیان هەڵبژێرێت، ئەگەر دەمزانی کە دەبێ بۆ نیگارکێشان هێندە ڕەنج بکێشیت؛ هەرگیز فڵچەم بە دەستەوە نەدەگرت.

"من بەم جۆرە نەخولقابووم، فێری ئیشیان نەکردبووم، پێویستیم بەوە نەبوو ئیش بکەم تا گوزەرانم دابین بکەم، کەسانی تر هەبوون من مەیلم لەچی بووایە بۆیان جێبەجێ دەکردم، باوکم دروشمێکی هەبوو: کارێك کە کەسانێکی تر دەتوانن بۆتی ئەنجام بدەن خۆتی پێوە خەریك مەکە، دەیوت کاری گەورەتر هەیە کە لە ئێمە دەوەشێتەوە. بەڵام من هیچ کارێکم لێ نەوەشایەوە.

"لە هەمووی خراپتر ئەوە بوو من خۆم دەمزانی توانای هونەریم چەندە. خۆم لە هەموو کەس باشتر دەمزانی ئەمە ئەو شتە نییە کە بە دوویدا وێڵم، ئەوەی خەیاڵم لێ دەکردەوە شتێکی زۆر بەرز بوو. بەڵام ئەوەی ئەنجامم دەدا، وشك و بێگیان و بێجووڵە بوو، هەر ئەمەش وای لێدەکردم کە لە کارەکەم سارد ببمەوە.

ئیدی بەمجۆرە لە هەموو شتێك تاقەتم چوو. لە ژیان ماندوو بووم، لە ژیانی پاریس بێزار بووم، سەفەرێکیان بۆ ئیتالیا چووم، لەوێ سەرم لە قوتابخانەکان دا. بە ئامۆژگاریی هەندێ لە مامۆستاکانی نیگارکێشانی خۆم لە پاریس و لەگەڵ سەرهەنگ ئارامدا کە ئەو وەختە بۆ پشکنینی باری قوتابییەکانی هێزی دەریایی لە ڕۆما دەچوو، سەردانی مەرسەمی زۆر لە هونەرمەندە نیگارکێشە گەورەکانی ئیتالیام کرد. مەزنیی هونەری ئەم وڵاتە و ڕۆحی هونەریی کە ئێستا لە ناخی خەڵکەکەیدا ماوە، کارێکی پێچەوانەی لە من کرد، من لە بەردەم ئەم هەموو مەزنییەیدا چۆکم دا.

"ڕۆژێکیان چوومە لای نیگارکێشێکی گەورەی ئیتالیایی کە ناوی "ستیڤانۆ" بوو. هەرکە منی بینی؛ لێی پرسیم: "ئێوە ئێرانین؟" کاتێك پێم وت بەڵێ، کەوتە

وەسفکردنی مامۆستا ماکان و پاشانیش دەربارەی لاوێکی دیکەی ئێرانی دوا کە ناوی خودادا بوو و بە یارمەتیی ستیڤانۆ توانیبووی لە E.D.B.A بخوێنێت. ئەم لاوە هەمان ئەو کوڕە ڕەنگزەردەیە کە لە قسەکانی پێشوومدا ئاماژەم بۆ کرد.

"ستیڤانۆ یەکێك بوو لە گەورەترین نیگارکێشەکانی جیهان و تابلۆکانی بە نرخی خەیاڵی دەفرۆشران. "مەزنیی هونەری ئیتالیا و وشە ستایشئامێزەکانی گەورەترین نیگارکێشی جیهان سەبارەت بە ماکان بچووکترین بەرهەڵستیی لام نەهێشت و ئومێدەکەمی بە نائومێدی گۆڕی. چاوپێکەوتنەکەم لەگەڵیدا بیر کەوتەوە. ئەو دیمەنەم هاتەوە پێشچاو کە نیگارەکانمی بە دەستەوە بوو و یەك یەك تەماشای دەکردن، کاتێ ئەو قسەیەم بیرکەوتەوە کە دەربارەی ئەو بە باوکم وتبوو؛ هەستم بە تەریق بوونەوە کرد، ئەمانە ئەوەندەی تر وایان لێکردم کە بڕیاری خۆم لە ژیاندا بگۆڕم، گومانم نەما، ئەوەی کە مامۆستا لە تاران بە منی وتبوو، یان دروست تر ئەوەی کە پێمی نەوتبوو ڕاست دەرچوو. من بێبەری بووم لە بەهرەی هونەرمەندێکی نیگارکێش و ئەو دەوروبەرەی کە تێیدا دەژیام ئەو توانایەی لە من سەندبووەوە. دەرکم بەمە کرد. ئەگەر ئەو هەر ئەو ڕۆژە ئەمەی پێ بگوتمایە، لەوانە بوو ژیانێکی ئارامم بەسەر ببردایە، بەڵام پێی نەگوتم و منیش نەمتوانی لەو گوناهەی خۆش بم.

"گەرچی بۆباوکم نووسیبوو کە نیازم وایە شەش مانگ لە ئیتالیا بمێنمەوە و لەوێ بخوێنم، بەڵام پاش دوو هەفتە گەڕامەوە بۆ پاریس و نامەیەکم بۆ باوکم نووسی کە ئێستاش کاتێك دێتەوە بیرم ئازارم دەدات. دوای مامۆستا نزیکترین کەس لە ژیانمدا باوکم بوو. هەرکاتێك هەستم بە بێدەسەڵاتیی خۆم دەکرد، دەمویست سەرم بخەمە سەر شانی و بگریم.

"باوکم پیاوێکی ئاقڵ بوو و بڕوا ناکەم بەر لە خۆشەویستیی بۆ من، چێژی خۆشەویستی و میهرەبانیی کردبێت. ئەو هەمیشە بیری لە پاشەڕۆژی من دەکردەوە. دەیویست من بەختەوەر بکات، لە یەکێك لەو نامانەدا کە لە ساڵی سێیەمی مانەوەم لە پاریسدا بۆم نووسیبوو، دوای ئەوەی باوکم کەم تا زۆر لە

باری ژیان من –لە ڕێی نامەی یەکێك لە نیاز چەپەڵەکانەوە– ئاگاداریی پەیدا کردبوو، پێم گوتبوو کە هەڵەیەکی گەورەم لە ژیانی خۆمدا کرد و نەدەبوایە بۆ فەڕەنسا بهاتمایە و چەند باشتر بوو هەر لە تاران بمامایاتەوە و ژیانێکی ئاساییم بەسەر ببردایە. بە ئاشکرا ئەوەشم بۆ نووسیبوو کە ئەو تێڕوانینەی نیگارکێشە بەناوبانگەکەی تاران دەربارەی من هەیبوو لە ڕاستییەوە نزیکە. بەڵام لەوە دەچوو باوکم یان لە قسەکانم نەگەیشتبێت، یان بایەخی پێیان نەدابێت، کاتێك لە ڕۆماوە بۆ پاریس گەڕامەوە، دانیشتم و هەوڵم دا ئەوەندەی لە توانامدابێت مەئساتی ژیانی خۆمی تێ بگەیەنم. بۆم نووسی کە لە کارەکانمدا هیچ پێشکەوتنێکم بەدەست نەهێناوە و نیگارکێشان هونەرێکی گەلێك دژوارە و من تا ئێستا نەمتوانیوە ڕەزامەندیی مامۆستاکانی خۆشم بە چنگ بهێنم و دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ ئێران و ئەو لەو ڕووەوە چی بە باش دەزانێت. هەڵبەتە دیارە نەمتوانیوە هەموو گیروگرفتەکانی ژیانی ناهەمواری خۆمی لە ئەوروپادا بۆ بنووسم، بەڵام باوەڕ بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا تا ئەو ڕادەیەی توانیومە ڕاستگۆ بووم.

"ئەو وەڵامەی کە پێم گەیشتەوە، زۆر هیوابڕ بوو، باوکم لە وەڵامدا نووسیبووی کە ئەو جگە لە بەختەوەری و خۆشگوزەرانیی من هیچی تری لە ژیاندا ناوێت و ئەسڵەن پێی خۆش نییە کە ئەو نەخشە بۆ ئایندەی من دابنێت، جا هەیدێ فەرمانم پێ بدات، بەڵام بیستوویەتی کە سەرهەنگ ئارام لە هەموو ڕوویەکەوە شایستەو ڕێکوپێکە و بێگومان پاشەڕۆژێکی ڕووناکیشی هەیە و، خوازبێنیی منیشی کردووە. جا ئەگەر ئەو بزانێت کە کچە تاقانەکەی نەك لەگەڵ سەرهەنگدا، بەڵکو لەگەڵ هەر پیاوێکی تریشدا بێت ژیانێکی خۆش دەباتە سەر، ئەوا ئیتر ئەم لە ژیاندا هیچ ئارەزوویەکی دیکەی نییە و دەتوانێت بە دڵێکی ئاسوودەوە سەربنێتەوە.

"ئەم نامەیەی باوکم منی لە ژیان بێزار کرد، من بیرم لەچی دەکردەوە و باوکیشم لەچی! من هەوڵم دەدا تێی بگەیەنم کە بێبەهرەم و ئەمەش بووەتە مایەی ئازار بۆم، کەچی ئەو مێردی بۆ دەدۆزیمەوە.

"لەو ژیانە پڕ ئاشووبەمدا بەدوا دالْدەیەکدا دەگەڕام، دەمویست شتێك بدۆزمەوە خۆمی پێوە هەڵبواسم، تا لەو قەیرانە ڕۆحی و ئاکارییە ڕزگارم بێت کە دووچاری بووم. ڕۆیشتم و ئەو لاوەم دۆزییەوە کە ستیڤانۆ لە ڕۆما دەربارەی دوا. ئەمەش کارێکی ئاسان نەبوو، لە ساڵی دووەممدا لە پاریس ئەوم لە قوتابخانەی هونەرە جوانەکانی پاریس بینی بوو. دەمناسی، دەزگیرانێکی ناسکی هەبوو، بەلاّم ماوەیەك دەبوو کە لەبەر چاو ون بووبوو، لەهەر کەسێکیش هەواڵیم دەپرسی وەلاّمی تەواوەتیی نەدەدامێ. بیرمە کاتێك هەواڵیم لە سەرهەنگ ئارام پرسی، وتی: "تۆ ئەمە چۆن دەناسیت؟ ئەمە لەوانەیە کە لە هەزار ئاویان داوە و قولەپێیان تەڕ نەبووە، لە قوتابییەکانی بەرلینیش بەدناوترە، چ کارێکتان لەگەلْ ئەمانەدا هەیە؟" بە زۆری ئەو قوتابییە ئێرانییانەی لە پاریس نیشتەجێ بوون دەیانناسی. بە کورتی نەیاندەزانی لە کوێیە و یاخود حەزیان نەدەکرد پێم بلێن. زۆربەیان سەریان لەو پرسیارکردنەی من سووڕ دەما، چونکە دەیانزانی من خزمی سەرپەرشتیاری قوتابییە سەربازییەکانم. وایاندەزانی من بە نیازێکی خراپەوە هەواڵی ئەو دەپرسم. بەلاّم هەرچۆنێك بێت پاش هەفتەیەك دۆزیمەوە. خانۆچکەیەکی لە Montparnasse rue de Lavin بەکرێ گرتبوو. قوتابییەکانیش باش دەیانناسی، بەلاّم کەس حەزی نەدەکرد شتێك دەربارەی ئەو بدرکێنێت.

"ئەم لاوە بالاّبەرز و سەروسیما شێواوە، تاقە کەسێك بوو کە بە چاوی دڵدارییەوە سەیری منی نەدەکرد، لەوانەیە هۆکەشی ئەوە بووبێت کە کچێکی ڕێکوپێك و ناسك وەکو خوشکێکی میهرەبان چاودێریی دەکرد، یان لەوانەیە لەبەرئەوە بووبێت کە هەمیشە نەخۆش بوو و خۆی لە ئامێزی مەرگدا دەبینییەوە. ئاخ، چەند حەزم دەکرد ئێستا کە دووچاری شکست و شەکەتی بووم ئەوم ببینیایە. دڵنیام سەرلەنوێ ڕۆحی ژیان دەکاتەوە بە بەردەمدا و ڕەنگە دەروویەکی سەرفرازیم پێ نیشان بدات، ئاخ، ئای لەو خەیاڵە خۆشانەی ئەو!

"ئەم کوڕە سەرگەرمی خەبات و تیکۆشان بوو. هەمیشە.. لەو ڕۆژەوە خۆی ناسیوە لە بگرە و بەردەدا بووە. شەپۆلەکانی ژیان ئەویان لەم تاشە بەردەوە دەدا

بەو تاشە بەردەدا و کەچی کۆڵی نەدەدا، لە دوژمنە سەرسەختەکانی ستەمکاری بوو و هێندە باوەڕی پتەو بوو کە هەموو مەسەلەیەکی تری لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕقەی خۆیدا دەبینییەوە. دەزانم "میهربانوو" هاودەم و خۆشەویستە ئەمەکدارەکەی، شەیدای ئەم ئیرادە پتەوە و سەرسەختییەکەی بوو. بەخوداداد بانگیان دەکرد و نازانم چ سیحرێکی لێ کردم وا باسی گیروگرفتەکانی ژیانی خۆم بۆ کرد و توانیی جێی خۆی لە ژیانمدا بکاتەوە.

"ئەم لاوە هێند ڕاشکاوانە ئەدوا کە جاری وا بوو سنووری شەرمی ئەشکاند. بەڵام شێوەی قسەکردنەکەی کاریگەر بوو. چەند زیاتر ڕاستییە شوومەکانی ژیانی خۆمانی بە ڕوومدا دەدایەوە ئەوەندە زیاتر شەیدای دەبووم. کاتێ ئەوەم بۆ باسکرد کە مامۆستا ماکان چۆن ڕەفتاری لەگەڵمدا کردووە و من چۆنم بە باوکم ناساند، بێ سێ و دوو وتی: "ئاخر ئەمە گەورەترین بەڵگەی نەفامیتە" تەماشا بکە، من ڕێم بە هیچ کەس نەدەدا کە بەو جۆرە لەگەڵمدا قسە بکات. ئەوانی تر، ئەو لاوانەی کە هێندەی پووشێك لای من ئەرزشیان نەبوو، هەموویان بە یەك ئیشارەتی من تەقلەیان لێ دەدا، ئەمانە بنیادەم نەبوون و من هەرگیز ڕێم پێنەدەدان لە سنووری خۆیان زیاتر پێ درێژ بکەن. جگە لەوە ڕەفتاری من لەگەڵ ئەوانەدا هاوڕێیانە نەبوو. لە کاتێکدا ئەم لاوە باریکەلە باڵابەرزە هەر لە یەکەم ڕۆژی بینینییەوە دوای گەڕانەوەم لە ئیتالیا بە نەفامی لە قەڵەم دام، من ترسام و پرکێشیم نەکرد تووڕە بم، جا هەیدێ وەڵامی ئەو گوستاخییەی بدەمەوە.

"بە زەحمەت ماڵەکەیم لە Montparnasse دۆزییەوە. لە قاتی شەشەمی ساختوومانەکە؛ واتە لە دواقاتدا بوو. ساپیتەیەکی کەوانی تا نیوەی ژوورەکە و زیاتریش هاتبوو. لە پەنجەرەیەکی بچووکەوە ڕووناکی دەهاتە ژوورێ. تا چاویش هەتەری دەکرد سەربانی چینکۆ و دووکەڵکێش بوو. بە دیوارەکەوە ڕێچکەی باراناوی ڕەش دەبینرا. سەعات یانزدە بوو، چونکە بیستبووم کە لە ماڵەوەش کاردەکات، بەر لە نیوەڕۆ چووم، بەڵام خۆی لە ماڵەوە نەبوو، دەزگیرانەکەی پێشوازیی لێ کردم، یەك جار ئەم کچەم بینی بوو، بەڵام یەکترمان

نەدەناسی. قژ رەش و چاو کەژاڵ بوو، زۆر جوان نەبوو، بەڵام دەموچاوی لە دەموچاوی کوریکی هەژدە ساڵانی زیت و شەیتان دەچوو. گورج وگۆڵییەکەی سەرنجی مرۆڤی رادەکیشا. میهربانوو لەو کچانە بوو کە سەرەتا لەسەر خەرجیی دەولەت بۆ فەرەنسا نیردران. بە دزیی بالیۆزخانە و بەریوەبەریتیی سەرپەرشتییەوە هامشۆی خودادادی دەکرد. لە کۆلیجی پزیشکیی پاریس ناونووسیی کردبوو. دەیویست ببیتە پزیشکی مناڵان. لە یەکەم تەماشاکردنییەوە هەستمکرد بە بینینم خۆشحاڵ نییە، ئەم کیژە هیند دلساف و ساکار بوو کە بچووکترین شت لە روویدا رەنگی دەدایەوە. لەوە دلپاکتر بوو کە دەردەکەوت. منیش لەو کەسانە نەبووم رووی خۆمی لێ وەربگیرم.

"سەری قسەم کردەوە. وتم: "هاتووم خوداداد ببینم. من لە ئیتالیاوە هاتووم و لەوێ ستیڤانۆم بینی، ئیوە ستیڤانۆ دەناسن؟" دەمویست بیهینمە قسە. وەڵامی نەدایەوە، تەنها بەسەری ئاماژەی کرد، من دریژەم بە قسەکانی خۆم دا: "ئەمرۆکە ستیڤانۆ گەورەترین نیگارکیشی جیهانە. هەوالی خودادای پرسی. منیش هاتووم تا کارەکانی ببینم" وەك گولی سەرەتای بەهار خەندەیەك هاتە سەر لیوی و گریکەی دلی کرایەوە.

–خوداداد ئیستا کار ناکات.

–بۆچی؟

"میهربانوو دەنگیکی دلرفینی هەبوو. هەر ئەوەندە بچووکترین شت لە دلی بدایە وەك ژیی سازیك دەنگی دەدایەوە و تا ماوەیەك لەرینەوەی لە گویدا دەزرنگایەوە. چرچییەکی بچووك لە ناوچەوانیدا راستەوخۆ سیمای کراوە و دلنشینی دەگۆری بە سیمایەکی خەمزەدە و سۆز بزوین. سەیریکی سیپایەکەی کرد کە بەرامبەر پەنجەرەکە بوو. مقەبایەکیش بە سیپایەکەوە بوو. بەڵام من هەر سیبەرەکەیم دەبینی، کچە هەستی کرد منیش سەرنجم داوە وتی: "هەموو کارەکەی ئەمەیە"

وتم: "بهیلن با ببینم".

–تەواوی نەکردووە. پیشانتانی دەدەم.

"هەلسا و مینیاتۆرەکەی هەلگرت کە هیشتا رەنگ کردنەکەی تەواو نەبووبوو، دایە دەستم و وتی: "ئا لەمانە دەکیشیت و دەیفرۆشیت و بە پارەکەی دەژی، ئیدی کاتی‌بۆ نیگارکیشان نەماوە".

–بۆ؟ ئیستا دەولەت پارەی ناداتی؟

–نەخیر شەش مانگ دەبیت بریویانە و بە فرۆشتنی ئەم مینیاتۆرانە دەژی.

–بۆ نایدەنێ؟

–نازانم بلیم چی.. لە خۆی بپرسن. بەلاّم هەموو خوداداد دەناسن، دەزانن چۆن بیردەکاتەوە. بیگومان ئیوەشیان ترساندووە. لەمیژە کەسیکی ئیرانی نەهاتووە بۆ لای و ئەمە یەکەم جارە.. دەلیی دەنگی پیی دیت.. وابزانم خۆیەتی. ژیانیکی سەیری هەیە، هیز لە ئەژنۆکانیدا نییە، کەچی هەر دیت و دەچیت. بیر لە تەندروستیی خۆی ناکاتەوە، بەردەوام دەکۆکیت، کەچی بە خەیالیدا نایەت. دەلیت سەرمام بووە. کەست دیوە بیستوچوار سەعات سەرمای بیت؟ هەمیشە ماندووە. وابزانم جارجار تاش دایدەگریت بەلاّم بە من نالیت. ئەو تۆزە کاتەی بە دەستیشییەوە دەمینیت؛ دەبێ خۆی بەم کارانەوە خەریك بكات، ئەوەی کە دەستیشی دەکەویت، دەبێ بیدا بە دەواودەرمان، دەلیی پیرەمیردە بەسەرپیپلیکانەکاندا سەردەکەویت.

"لە دوورەوە دەنگیکی شاد هاتە گویم.

–میهری.. ئەوە لەگەل کیدا قسە دەکەیت؟

"میهربانوو هەلسا، چوو دەرگاکەی کردەوە و بە دەنگیکی بەرز وەلاّمی دایەوە: "وەرە خۆت ببینە. میوانمان هەیە. موهیم بوویت، لە ئیتالیاوە دین بۆ لات تا کارەکانت ببینن، شەرم لە خۆت ناکەیت؛ چیان پیشان دەدەیت؟" خوداداد بە بالاّیەکی بەرزو سنگیکی باریك و قژیکی ئالۆسکاو و چەند تالیکی لوولەوە لەسەر ناوچەوانی لەنیو دەرگای ژوورەکەدا دەرکەوت. بەستەیەکی گەورە لەبن باخەلیدا بوو، پالتۆکەی دابوو بەسەریدا. لە پیشدا رۆژنامەیەك کە فارسی بوو

لەسەر زەوییەکەی دانا و پاشان پالتۆکەشی فریدایە سەر قەراغی قەرەویلەکە. وتی "زۆر خۆشحالم بە هاتنتان. بەڵام پیم بلین، نەترسان؟ چۆن ویراتان بین بۆ لای من" ئینجا رووی کردە میهربانوو و وتی: "چەند بەسزمانانە قسە دەکەیت؟ لە ئیتالیاوە نەهاتوون، ئیوە لە E.D.BA دەخوینن، هەر لەویش یەکترمان ناسیوە".

"ئەو زمانە شاد و راستگۆییەیم بەدڵ چوو. لە ناخی دلەوە بە هەمان ئاوازی خەندە ئامیزانەوە وەڵامم دایەوە و وتم: "بەلێ، هەفتەی پیشوو لە ئیتالیا هاتمەوە، ستیڤانۆ هەوالی ئیوە و نیگارکیشیکی تری لێ پرسیم کە گوایا ئیستا لە تارانە.. بەڵام نازانم.. بۆچی بترسم؟" یەکسەر بەدوا قسەکانمدا هات: "ستیڤانۆتان بینی؟. تا ئێستا منی لەبیر ماوە؟ لەوانەیە ئەوی تر مامۆستا ماکان بووبێت، بەڵێ".

وتم: "بۆچی ئێوەش مامۆستا ماکان دەناسن؟"

وتی: "هەڵبەتە کە دەیناسم. ئەگەر ئەو نەبوایە من تا ئێستا هەزار کفنم ڕزاندبوو، بە ڕاست میهربانوو.. مامۆستا نامەی بۆ نووسیوم. بیگرە بیخوێنەرەوە. بە دەنگێکی بەرز بیخوێنەرەوە. با میوانەکەشمان گوێی لێ بێت. مرۆڤێکی واباش و دلاوەرم لە هەموو ژیانمدا نەدیوە. لە هیچ شتێك سڵ ناکاتەوە". نامەکەی دایە دەست میهربانوو.

"کە ناوی مامۆستای هێنا قێزم هاتەوە، مامۆستا بووبوو بە نیشانەی نائومێدی و بێبەهرەیی من و بێدەسەڵاتی و لاوازیی منی پتر دەکرد. بیرەوەریی یەکەم چاوپێکەوتنیم هاتەوە یاد، کاتێ ئەو لە پشت مێزەکەیەوە دانیشتبوو سەیری کارەکانمی دەکرد، خودادادا ڕووی کردە من و پرسیی: "دەیناسن؟" وتم: "تەنها جارێك یەکترمان بینیوە، بەڵام باش نایناسم". وتم: "میهری، بۆ نامەکە بە دەنگێکی بەرز ناخوێنیتەوە؟ تەنها لە کۆتاییەکەیدا نەبێت چەند شتێکی تایبەتی دەربارەی تۆ تێدایە، نامەوێ ئەوەیان بخوێنیتەوە، ئەمە سەرەتاکەیەتی.."

نامەکەی لەدەست کچەکە سەند و وتی: "وەرە، لێرەوە بیخوێنەرەوە. ئێوەش گوێ

بگرن". هەمدیسان نامەکەی دایەوە دەست کچەکە و ئەویش بەمجۆرە دەستی پێ کرد:

"ئەوەی کە پێویستە من بۆ تۆی بکەم کردوومە و ئومێدم نییە ئەنجامی هەبێت، سەرۆکی ئاسایش زۆر حسابی بۆ تۆ دەکرد، تۆیان ناوناوە جەنابی terrible "6". چیت کردووە وا هێندە بە خراپ ناوت دەهێنن؟ بەڵام نائومێد مەبە، گەر بتەوێ شتێك بە شتێك بکەیت نابێ گۆڕەپانەکە چۆڵ بکەیت. بوون بەمەلا چەند ئاسانە، بوون بە ئینسان ئەوەندە گرانە! چاوەڕێ بە تا ئەم سەرۆکی ئاسایشە دەگۆڕێت، بەڵام بەو مەرجەی کە نابێت ئازایەتیی خۆت لەدەست بدەیت. دەڵێن تەواوی ئەو وێنە و کاریکاتێرانەی کە لە پاریس لە بڵاوکراوە و ڕۆژنامە فارسییەکاندا و بگرە لە گۆڤارە فەرەنساییەکانیشدا دەربارەی بارودۆخی ئێران بڵاودەکرێنەوە کاری تۆن.. خوا نەکات!".

"خوداداد نەیهێشت نامەکە تەواو بکات وتی: "زۆر وەستایە" خوداداد پێکەنی و من لە مانای پێکەنینەکەی نەگەیشتم، میهربانوو دەستی بە خوێندنەوەی نامەکە کردەوە:

"گوێ مەدەرێ! ئیتر ئەمە ژیانە. جاری وایە دەبێ بەرگەی لێدانیش بگریت. ئێستەش نۆرەی کوتەك خواردنی تۆیە. سواریش تا نەگلێ نابێ بە سوار".

"نامەیەکی درێژ بوو. بەڵام خوداداد پەلەی بوو یان لەوانەیە لەبەر بێ کاتیش نەیویستبێت تا کۆتایی گوێ بگرێت، ڕۆیشت و ئەو ڕۆژنامانەی کە بە پەت بەستبوونی کردنییەوە، لەسەر کورسییەکە دانیشت و، دەستی بە خوێندنەوەی ڕۆژنامەیەکیان کرد، میهربانوو نامەکەی دەخوێندەوە و منیش گوێم لێ دەگرت:

"سەرۆکی ئاسایش چیرۆکی سەیری دەربارەی تۆ دەگێڕایەوە. دەیوت هەموو هەفتەیەك ڕۆژنامەیەك بە ناوی "پیکار"ەوە دەگاتە دەستی تەواوی قوتابییە ئێرانییەکان لە فەرەنسەدا. ئەم ڕۆژنامەیە لە "بەرلین" دەردەچێت و دەیوت گوایە تۆ ئەم ڕۆژنامەیە لەنێو قوتابییەکاندا بڵاودەکەیتەوە.."

"خوداداد سەیری سەعاتەکەی کرد و نەیهێشت نامەکە بگاتە کۆتایی. لە میهربانووی پرسی: "بۆ نیوەڕۆ چیمان هەیە؟ ناتوانین بۆ چێشتخانەیەکی دەرەوە بچین، چونکە پارەمان پیّ نییە، دەبیّ لێرە شتێك بخۆین. شتێك میوانەکەشمان لەگەڵماندا بیخوات". منیش سەیرێکی سەعاتەکەی خۆمم کرد. نزیکەی یەکی پاش نیوەڕۆ بوو.

"ئەو پاکییەی زۆر کاری لیّ کردم. بەرلەوەی میهربانوو بیەوێت بەسەر شڵەژاوییەکەی خۆیدا زاڵ بێت کە دووچاری بووبوو و سیمایەکی ئارام بە خۆی بدات و وەڵام بداتەوە، من پێشدەستیم کرد و وتم: "ئەگەر ئیجازە بدەن، من ئێوە دەعوەت دەکەم و دەڕۆین لە چێشتخانەیەك نان دەخۆین.. خوداداد وتی: "شتێکی چاکە.." بەڵام میهربانوو لەگەڵیدا نەبوو و وتی: "نا، تۆ ناتوانیت نانی چێشتخانە بخۆیت. ئەی دکتۆر گۆشتی لیّ قەدەغە نەکردوویت. خانم، ئەمە گویّ بە تەندروستیی خۆی نادات، من نایەڵم بۆ چێشتخانە بچێت" من و خوداداد دەستمان کرد بە پێکەنین.

–باشە میهری گیان، زویر مەبە، ڕاست دەکات، دەبا بزانین چیمان هەیە؟ "ڕۆژنامەکەی لەسەر زەوییەکە دانا، بەرەو جانتایەکی ژێر قەرەوێڵکە چوو. ڕایکێشا، تەماشایەکی کرد و وتی: "نان، کەرە، ئەم بەستەیە چییە؟ پەنیری هۆڵەندیشمان هەیە. مرەبای دەستی دایکی میهری کە لە تاران دروست کراوە و، ئیتر ئاو بێنە و دەست بشۆ. خاوەن خانووەکەش چامان بۆ لیّ دەنێت، من خۆم دەبیّ شیر بخۆم. خۆراکی پاشایانە". ئینجا لە منی پرسی: "ئامادەن لەگەڵ ئەم هەژارانەدا تێهەڵچن؟" منیش بە شادی و خەندەوە وەڵامم دایەوە: "بۆ ئێمە سەرو زیادە، ڕاستییەکەی من نەهاتبووم نانی نیوەڕۆشتان لەگەڵدا بخۆم، بەڵام تازە دەعوەتەکەتان ڕەت ناکەمەوە".

"خوداداد ڕووی کردە میهربانوو وتی: "کەواتە هەڵسە! بە خاوەن خانووەکە بڵیّ شیر و چامان بۆ ساز بکات، جگە لەوە کاریشمان هەیە، دەبیّ تا سەعات سیّ

ناونیشان لەسەر هەموو  ڕۆژنامەکان بنووسین و پۆستیان بکەین، دەبێ ئەوانەی ئێران لە ڕۆژنامە کۆنەکانی "ماتن"ەوە بپێچین".

میهربانوو لە ژوورەکە  چووە دەرێ. هەرکە خۆم و خۆیماینەوە لێم پرسی: "ئەمە چ ڕۆژنامەیەکە بۆ ئێرانی دەنێرن؟" سەری سوڕما و وتی: "گوایە ئێوە تا ئێستا ڕۆژنامەی "پەیکار"تان نەبینیوە؟"

"لە ڕاستیدا من ئەم ڕۆژنامەیەم بینیبوو، هەندێ جار بە ناونیشانی خۆشم دەیاننارد، بیرم دێ جارێکیان لە لایەن  باڵیۆزخانەوە بڵاوکراوەیەك لەنێو تەواوی قوتابییەکاندا بڵاوکرایەوە، گوایە کاتێك ئەو ڕۆژنامەیە گەیشت، کەس نەیکاتەوەو یەکسەر بۆ باڵیۆزخانەی بنێرن. ئەمە بووە جێی گاڵتەو پێکەنینی هەمووان و بە پێچەوانەوە ئەوەی کە تا ئەو ڕۆژەش ڕۆژنامەی "پەیکار"ی نەبینیبوو لە هاوڕێکەی داوا دەکرد. وتم: "نەخێر نەمبینیوە". ئەو چالاکییەی ئەم کوڕە خوێن شیرینە بەلای منەوە تازە بوو.

–ئێوە لە کوێ ژیاون وا لەم ڕۆژنامەیە بێئاگان؟ نزیکەی هەزار دانەی لێ دەچێت بۆ ئێران، بە لایەنی کەمەوە دەیەها هەزار کەس دەیخوێننەوە. دەستاودەست دەڕوات. ئەمە تاقە ڕۆژنامەیەکە کە بە زمانی فارسی دەربچێت و لە ئازارەکانی خەڵکی بکۆڵێتەوە.

"لە دڵی خۆمدا وتم: "ئێستا تێگەیشتم کە بۆچی دەوڵەت خەرجییەکەی بڕیوە". ڕۆژنامەکەی دامێ تا بیخوێنمەوەو لەسەر وتارەکانی کۆمەڵێك شتی دەبارەی ئەو دیکتاتۆریەتەی کە لە ئێراندا فەرمانڕەوایە بۆ ڕوون کردمەوە.

"وەختێ دەدوا تەواوی بەدەنی دەلەرزی، چاوەکانی خڕ دەبوون و دەدرەوشانەوە. زوو زوو دەستی دەبرد و ئەو تاڵە قژانەی کە دەکەوتنە سەر تەوێڵی لایدەدان و دەستێکی دەخستە گیرفانی و بە دەستەکەی تریشی هەولیدەدا قسەکانی خۆی بەرجەستە بکا. پێنج پەنجەکەی دەستی ڕاستی هەمیشە شێوەی سەیر سەیریان لەهەوادا بەخۆوە دەگرت. جاری وابوو لەسەر کورسییەکەی تەکانێکی بۆ دواوە دەدا و دەتگوت لە دوورەوە باشتر دەتوانێت  من

بخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە. قاچی دەخستە سەر قاچ، ئەو وەختە نەرمتر دەبوو، ناکاو هەمدیسان دەجوولایەوە. بە هەردوو دەستی توند فشاری دەخستە سەر هەردوو دەسکی کورسییەکە و قورسایی خۆی لە هەوادا ڕادەگرت و قسەی دەکرد، ئەم لاوە پارچەیەك ئاگر و چەپکێك تووڕەیی بوو، من بەڕادەیەك هەستم بە نزیکی دەکرد لەگەڵیدا کە تا ئەو ڕۆژە ئەمە یەکەمجار بوو هەستیوام لا دروست بێت. دەنگە بڕندە و تیژەکەی لە گوێمدا دەنگی دەدایەوە، وەکو چەکوشێك کە بە ئاسنێکیدا دەدەن. ئەم جۆش و خرۆشەم هەرگیز لە کەسدا نەدیبوو.

کەمێك دەربارەی بارودۆخی ئێران دوا. دەربارەی ئەو تاوانانەی کە ئەکرێن، ئەو بەرەڵایی و بەرتیلکارییەی کە بڵاوبووەتەوە. دەربارەی ئەو پارە و سامانەی کە بە دەستی مناڵە خواپێداوەکانی وەکو منەوە دەبرێتە دەرەوەی وڵات، دەربارەی ئەو بێتاوانانەی لە زیندانەکاندا سەردەنێنەوە. ئەو پیاوماقووڵانەی کە بوونەتە قوربانیی هەواوهەوەسی خۆپەرستیی شاو بڵاوکردنەوەی باوەڕ بەخۆنەکردن و درۆ و دەلەسە و ڕیاکاری. دەربارەی دەسەڵاتی ئەو ئینگلیزانەی وەکو بووکە شووشە یاری بەو پیاوانە دەکەن. ناگەهان دەوەستا و ئاماژەی بۆ ژیانی من دەکرد.

بۆ نموونە دەیگوت: "کاتێ من و ئێوە لە پاریسدا بەرەڵا دەبین، پارەی ئەو خەڵکەیە دەیدزین و بە فیڕۆی دەدەین، تا ئێستا بیرتان لەوە کردووەتەوە کە ژیانی من و ئێوە لە کوێوە دابین دەکرێ؟" من بێدەنگ بووم و ڕاستییەکەی جاری وابوو هەستم بە شەرمەزاریش دەکرد. دەتگوت من دەستم لە تەواوی ئەو تاوانانەدا هەیە و لێیان بەرپرسیارم.

"ئینجا من باسی خۆمم بۆ کرد و وتم کەچۆن لە E.D.B.A و لەنێو قوتابییە ئێرانییەکاندا هەموو یان وەکو مرۆڤێکی لاواز و بێبەهرە سەیرم دەکەن و منیش لەخۆم ناقایلم. باسی مامۆستام کرد و ئەوم بە گوناهبار زانی و وتم ئەو وای لە من کرد بۆ فەرەنگستان بێم، دەیتوانی وانەی نیگارکێشانم پێ بڵێتەوە و بە زمانێك کە پێویستە هەموو مامۆستایەك بیزانێت پێم بڵێت نیگارکێشان بە تەنها

کات بەسەر بردن نییە و یان من نابێ ژیانی خۆم بۆ کارێك تەرخان بکەم کە بۆی نەخولقاوم. بە کورتی پێم وت: "تازە من بە کەڵکی چی دێم؟"

–تۆ.. هەموو شتێك.

"دەرگاکە کرایەوە و میهربانوو بە خۆی و چەند قاپێك و چەقۆ و چەتاڵەوە هاتە ژووری و وتی: "تۆ هیچ ئیشێکت نەکردووە؟ یالاّ، هەڵسە. سفرەکە ڕابخە، سەر مێزەکە وا لە دۆڵابەکەدا، تا من چا و شیرەکە دەهێنم تۆ مێزەکە ئامادە بکە" من هەڵسامە سەرپێ و وتم: "میهری خانم، بیاندەن بە من، من ئامادەی دەکەم. ئێوەش بچن بەلای کارەکانی ترەوە".

ئەم کابرایە منی ترساندبوو. دەترسام. وەك چۆن ئێستا دەترسم سەیری ئێوە بکەم".

ئافرەتە نەناسەکە کتوپڕ وەستا. لە ناخی دڵەوە ئاخێکی هەڵکێشا. ئاوێکی بریقەدار چاوەکانی تەڕ کردبوو. فرمێسك نەبوو. ئەم ئافرەتە جاری وابوو خۆی لەبیر دەچووەوە. نازانم بۆچی کتوپڕ ئەو بێدەنگییەی هەڵبژارد و منیش نەمویست زنجیرەی بیرەوەرییەکانی بپچڕێنم. چەند ساتێك لێم وردبووەوە. بەلاّم من چاوم بڕییە زەوییەکە، ڕاستی دەکرد: نیگاکانی ئەو پڕ بوون لە لاوازی و بێدەسەلاّتی. بەلاّم وێڕای ئەوەش من حەزم نەدەکرد ئەو نیگایانەی ببینم. سەرلەنوێ دەستی پێکردەوە.

"ئێوە کابرایەکی سەیرن! نازانم بۆچی دانیشتووم چیرۆکی ژیانی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە، ئەمانە هەموو بێمانان. تەماشام بکەن! بیر لە چی دەکەنەوە؟ من وا ئەوەی لە دڵمدایە بۆتانی هەڵدەڕێژم. ئاخر تەماشام بکەن، چونکە بە چاوەکانمدا دەزانن من ڕاست دەکەم یان درۆ. ئەو هێزەی واتاندەزانی لە مندا هەیە تیامدا نەماوە. دەزانن من چ جۆرە مرۆڤێکم؟ من ئەو جۆرەم کە خەڵکی عادەتەن بە زاڵم ناوی دەبەن. تەواوی هێزی من ئەو کاتە بڕ دەکات کە بەرامبەرەکەم لە خۆم لاوازترە. کاتێك بەرامبەرەکەم کەسێتییەکی لە خۆم بەهێزتر بێ، ئیدی توانام لەبەر

دەبڕێت و بە ڕادەیەك بەسزمان دەبم کە بەزەییتان پیامدا دێتەوە. مامۆستاکەی ئێوە سەروەختێك گوێڕایەڵی من بوو.. گوێڕایەڵ نا، گوێڕایەڵ وشەیەکی بەجێ نییە، چونکە ئەو هەرگیز گوێڕایەڵی کەس نەبووە. باشتر وایە بڵێم تا ئەو دەمەی من هاوتای مامۆستا بووم، تا ئەو دەمە یاریم بەهەست و سۆزی دەکرد. بەڵام هەر ئەوەندە هێزێکی گەورەتر لە هێزی جوانییەکەم و یان هەرچۆنێك ئێوە ناوی دەنێن، هێزێکی ڕەها، بەسەر تەواوی بوونی مندا زاڵ بوو و ژیان بە دڵڕەقی و بێبەزەییەکەی خۆی منی نوغرۆ کرد، ئیدی من دەسەڵاتم بەسەر خۆمدا نەما. کۆلارەیەك بووم لە ئاسماندا دەهاتم و دەچووم، بێئاگا لەوەی سەری داوەکەم وابەدەست منداڵێکی چەتوونی لاسارەوە. تێدەگەن دەڵێم چی؟ ئەو ڕۆژانە پەیم بەم ڕاستییە تاڵە نەدەبرد و وامدەزانی تەواوی هەڵسوکەوتەکانم لەدەست خۆمدان. ئێستا دەمەوێ ئەو هەستە لاڵ و پەرتەی ئەو ڕۆژانە لە شێوەیەکدا دەرببڕم. خودادادیش لە من بەهێزتر بوو. ئەو دڵە پڕ سۆز و خۆشەویستییەی کە بێئەندازە ئینساندۆست بوو؛ منی شەیدا کردبوو. من نەمدەتوانی لە ئاستیدا بەرهەڵستی بکەم. بۆچی دەڵێم هەستی لاڵ و پەرت؟ چونکە ڕاستە دەسەڵاتی ئەخلاقیی ئەو بەسەر ژیانمەوە کاریگەر بوو. بەڵام هێشتا نەگەیشتبووە کاریگەریی گەورەیی مامۆستا، هێشتا نەسووتا بووم و نەبووبووم بە خۆڵەمێش. خودادادم خۆشدەویست و دەمویست بەهەر نرخێك بووە یارمەتیی بدەم. باوەڕم بەو شتانە نەبوو کە دەیگوتن، بەڵام دەمویست جێی ڕێزی بم، ئینسانێکی بە ئیرادە بوو. مەبەستی نەبوو فریوم بدات. کە ئیشێکی پێ دەسپاردم، لەو مەترسییەش ئاگاداری دەکردمەوە کە ڕەنگە بێتە ڕێم.

"دوای دوو هەفتەیەك بە ڕادەیەك بوومە هاوڕێی کە میهرەبانوو دەهات و سکاڵای دڵی لای من دەکرد، چ ژیانێکی پڕ کێشمەکێشیان هەبوو، بەڵام لە هەمانکاتدا هەمیشە شاد و کامەران بوون. تێکۆشان سوکنایی پێدەبەخشین. چەند ئەفسووس دەخۆم! ئەوەی ئەمڕۆکە دەیزانم گەر ئەوسا دەمزانی، ئەمشەو ئافرەتێکی بەدبەخت لەگەڵ ئێوەدا دانەدەنیشت و تابلۆی "چاوەکانی" نەدەبوو و

لەوانە بوو مامۆستاش زیندوو بووایە. ئەم قسەیەم ئەوە ناگەیەنێت کە من ئەوم کوشت، نەخێر، بەڵکو ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو هەم خۆی بە کوشت داو هەم منیش.

"خوداداد لە ئاست مامۆستا ماکاندا خۆی بە بچووك دەزانی. خۆی بە قەرزارباری ئەو دەزانی. لەو لاوە لەخۆ بوردووانەدا کە لە پاریس ناسیمن ئەو سیفەتانەم دەبینییەوە کە لە کتێبە کۆنەکاندا دەمانخوێندەوە. ئەمانە کاتێك متمانەیان بە یەکێك دەبوو، ئیدی چاویان لە هەموو شتێکی خۆیان دەپۆشی. بە کورتی ڕەنگە لە کۆندا ئەمە وەکو جۆرە پەرستنێك بووبێت و ئەمڕۆ لە هۆشمەندی و تێگەیشتنەوە بێت. ماکان بەهرەکەی خودادادی پەروەردە کردبوو و هەر ئەویش ئەم کوڕە باخەوانە لاوازەی هان دا بچێت بۆ ئەوروپا و لە پاریس خوێندنی بۆ دابین کرد.

"ڕۆژێکیان لە میهربانووم پرسی بۆچی هێندە مامۆستا ماکانی خۆشدەوێت؟ وتی: "من خۆم ماکانم نەدیوە. بەڵام لە قسەکانی خودادادەوە مامۆستا لە خۆم باشتر دەناسم.."

–چۆن دەیناسن؟ مرۆڤێکی چۆنە؟

"وتی: "ئەی ئێوە نەتاندیوە!" وتم: "من تەنها جارێك بینیومە، مرۆڤێکی خۆپەرست و دڵڕەق هاتە پێشچاوم" وتی: "نا.. وانییە" وتم: "دەبڵێن.. چۆنە!" وتی: "من پێتان دەڵێم، بەڵام خوداداد حەزناکات باسی ئەم شتانە بکات، چونکە مەترسیدارە و ڕەنگە ببێتە هۆی گرتنی مامۆستا لە تاران. بەڵام ئێوە بە کەس مەڵێن، گەرچی منیش ئاگاداری هەموو شتێك نیم. بیرتانە چەند ساڵێك لەمەوبەر دوو سەد قوتابی و مامۆستا و دکتۆریان لە تاران و هەندێ لە شارەکانی تر گرت؟ یەکێك لەو کەسانەی کە دەبووایە بگیرایە و تا ئێستاش بەدوایەوەن ئەم خودادادەیە. ماکان ڕزگاری کرد، هەفتەیەك لای خۆی لەماڵەوە شاردییەوە، پاشان بۆ یەکێك لە دێهاتەکانی دەوروپشتی تارانی نارد کە دێی دۆست و ناسیاوی بوو، ئینجا ناسنامەیەکی ساختەی بۆ دروست کرد. هەر ئەوەندەی

سـەرۆکی ئاسـایش گـۆڕا و ئاشـەکان کەوتنـەوە گـەڕ، بلیتـی بـۆ بـڕی و بـۆ فەرەنگستانی ڕەوانە کرد. خودادار ناوی ڕاستەقینەی نییە، ناوی ڕاستەقینەی خۆی بە منیش نەوتووە. ئیتر ماوەیەك ئەو مەسرەفی دەکرد تا ئەوە بوو بە هۆی ستیڤانۆی نیگارکێشی ئیتالیاییەوە هات و لە E.D.B.A گەواهییان بۆ دا و لەوێ وەرگیرا، ئەم گەواهیدانە بووە هۆی ئەوەی لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە بە یـەکێك لـە قوتابییـانی دەوڵـەت لـە قەڵـەم بـدرێ. بـە ڕێکـی پـارەی خوێندنـی وەردەگرت و ژیانێکی خراپی نەبوو. دەیشیتوانی ژیانێکی باشتریشی هەبێت، بەڵام ئەو زۆربەی پارەکەی لە ڕێی ئەم ڕۆژنامە و بڵاوکراوانەدا خەرج دەکرد".

"وتم: من هیچ لەو بڕوایەدا نەبووم کە مامۆستا مرۆڤێکی وەها زیرەك و ئازا بێت، بەڵام کابرایەکی مۆنە!" میهربانوو وتی: "بە پێچەوانەوە، مامۆستا ماکان کابرایەکی زۆر سەیرە. با خودادار بۆتان باس بکات". وتم: "باشە ئاخر لەگەڵ ئەو هەموو فشارەدا لە ئێران.. مەگەر لە گیانی خۆی بێزارە؟" وتی: "ئەی خوداداریش هەر وانییە؟ ڕاستە لێرە لە فەرەنگستان مرۆڤ ئازاتر دەبێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا؛ ئەو ئینسانانە سەیرن. بیر لە ژیانی هەموو کەسێك دەکەنەوە تەنها خۆیان نەبێت، هەمیشە ئەو مەترسییەی کە هەڕەشەم لێ دەکات لێم ئاگادار دەکاتەوە و چاودێریم دەکات. کەچی بیر لە سەلامەتیی خۆی ناکاتەوە. لە شەقامەکانی پاریسدا زۆر لەگەڵمدا ناگەڕێت، نەبادا یەکێکی سەر بە باڵیۆزخانە پێکەوە بمانبینێت و بۆ تاران بمانگێڕنەوە و خەرجییەکەم بڕن. باڵیۆزخانە هەموو قوتابییە ئێرانییەکانی ئاگادار کردووەتەوە کە هامشۆی نەکەن. هەموو کاربەدەستەکانی باڵیۆزخانە لەو باوەڕەدان کە تەنها ئەوە کە قوتابییە ئێرانییەکان لە ڕێ لادەدات و مێشکیان بە سیاسەتەوە خەریکدەکات".

پرسیم: "ئەی چۆن خەرجیی خوێندنەکەیان بڕی؟" وتی: "لەسەر ئەو وتارانەی کە لە ڕۆژنامە فەرەنسابییەکاندا دەنووسران". وتم: "بۆچی ئەو وتارانە خودادار دەینووسین؟" وتی: "نەخێر.. وتارەکان ئەو نەیدەنووسین، بەڵکو کوڕێك کە ناوی -غیرەت-بوو. ئەم کوڕە خۆی سیخوڕی باڵیۆزخانەش بوو. دەهات و لە

بەردەمی خەڵکدا جنێوی بە شاو دەوڵەت دەداو وەختێ یەکێکیش قسەیەکی دەکرد، ئەوەندەی تری دەخستە سەر و دەیکرد بە ڕاپۆرت و دەیدا بە باڵیۆزخانە. لە بۆردۆ سندووقێکی کامێرای دزی و لەسەر ئەوە سێ مانگ گرتیان و ڕۆژنامەکانی بۆردۆ لە سەریان نووسی. ڕۆژنامەی "پەیکار" هەواڵی ڕۆژنامەکانی بۆردۆی لەژێر ناونیشانی "سیخوڕەکانی باڵیۆزخانە بناسن"دا بڵاوکردەوە. ئەم مەسەلەیە بووە مایەی (مشتومڕ) لە نێوان قوتابییە ئێرانییەکاندا. زۆریان باوەڕیان نەدەکرد، بۆیە خودادادچوو ژمارەیەکی لەو ڕۆژنامەیەی بۆردۆ هێنا کە ناوی La viox de Bordeaux بوو، کە تیایدا چیرۆکی دزینەکەی غیرەتی بە وردی تێدا بڵاوکرابووەوە و پیشانی هەموویانیدا. ئیتر ئەو کوڕە لەوەوە ڕقی لە خوداداد هەڵگرت. ئاخرییەکەی غیرەت ناچار بوو خوێندن تەواو نەکات و بۆ ئێران بگەڕێتەوە و لە پاداشتی خزمەتی ئەو پاسەوانییەی سەبارەت بە ئابڕووی ئێران لە فەڕەنسەدا پێی هەڵسابوو، کردیان بە سەرۆکی کاروباری خوێندنی باڵا لە وەزارەتی ڕۆشنبیریدا و لەوێ ڕاپۆرتی نهێنی و ڕاستەوخۆی بەدەربار داو سەرئەنجام خەرجیی خوێندنەکەی خودادادیان بڕی".

"من لە ناخی دڵەوە ئەم کوڕ و کچەم خۆشدەویست، چەند ئازایانە پێکەوە کاریان دەکرد. هیچیان بیریان لەوە نەدەکردەوە کە تا سەر ناتوانن ئاوەها پێکەوە بژین، میهربانوو دەیوت: "کە خوێندنم تەواو کرد بۆ ئێران دەگەڕێمەوە" لێم دەپرسی: "لەگەڵ خوداداد چی دەکەیت؟" دەیوت: "ئەویش دێت". دەمەوت: "ئاخر ئەگەر بێتەوە دەیگرن" دەیوت: "قابیلە بارودۆخ هەروا بمێنێتەوە؟"

ئومێد بە پاشەڕۆژ گەورەترین دڵدەرەوەی ئەوان بوو.

"بە لایەنی کەمەوە هەفتەی دوو سێ جار سەرم لێ دەدان، جاری وابوو یارمەتیم دەدا، نەخشونیگاری دەوری مینیاتۆرەکانم بۆ دەکرد، ئەو ڕۆژنامانەی کە دەیویست بۆ ئێرانیان بنێرێت، دەمپێچانەوەو پۆستم دەکردن. کاتێك هەستم کرد لە رووی پارەوە کەوتۆتە کزی و ژیانی بە فرۆشتنی مینیاتۆر ناچێتە سەر، دوو جار هەر جارەی دوو سەد فرانکم بە پۆستەدا بۆ نارد. ڕۆژێکیان چووم بۆ

لای، سەیرم کرد لەسەر قەرەوێڵەکە کەتووە و تەواوی لەشی ئاوساوە، دیاربوو کە جگەری ناساغە، پارەی نەبوو تا بچێت بۆ لای دکتۆر. هەر ئەوەندە خۆم کرد بە ژوورا بە میهربانووی وت: "زۆر چاکە، میهری، ئێستا ئەگەر دەتەوێ بڕۆیت بڕۆ، ئێوە دەتوانن دوو سەعاتێك لێرە بمێننەوە؟" وتم: "من هیچ ئیشێکم نییە و تەنانەت هەشمبوایە هەر ئامادە بووم تا بەیانی لێرە بمێنمەوە".

–تۆ، میهری، دەبینی چی دەڵێت؟.. غیرە ناکەیت؟

"میهربانوو وتی: "مەرایی مەکە، سەیرکە حاڵت چەند خراپە!" هەر کە کچە ڕۆیشت، وتی: "پارەم لێ براوە، دەتوانن شتێك قەرزم بدەنێ؟" وتم: "چەندم هەیە دەتاندەمێ".

پرسیی: "چەندتان هەیە؟" وتم: "شتێك پارەم لە بانقدایە، ئێستاش دوو سەد سێ سەد فرانکم پێیە".

وتی: "بزانە ڕێك چەندت پێیە؟".

"ژماردم، دو سەدو حەفتا و پێنج فرانکم پێ بوو، دەرمهێنا و پیشانمداو وتم: "هەمووی هەڵگرن" سیمای تاریك بوو. برۆکانی لێکناو وتی: "هەڵسە، ئەو جانتایە لەژێر قەرەوێڵەکەدایە بیکەرەوە! دوو نامەی تێدایە دەریانبهێنە و بیاندە بە من" بە قسەم کرد. یەکسەر خەتی خۆم بە نامەکانەوە ناسییەوە. ئەو دوو نامەیە بوو کە بە پۆستەدا بۆم ناردبوو، کردنییەوە و چوار سەد فرانکەکەی دەرهێنا و وتی: "فەرموو! ئەم پارانە هی ئێوەیە. لە مەودواش پارەم بۆ نەنێرن".

–ئەمانە پارەی من نین.

–درۆ مەکەن. حەز دەکەم بە جیددی قسەتان لەگەڵ بکەم.

"بە ڕادەیەك بە تووڕەیی و فەرماندانەوە ئەم قسەیەی کرد کە من سەرم سوڕما! چۆن پرکێشی دەکات بەو جۆرە قسەم لەگەڵدا بکات. بەڵام من بە ئێوەم وت، من ترسابووم. یەکەم جار بوو ڕووبەڕووی پیاوێك ببمەوە کە لە من بەهێزتر بێت و جوانییەکەم هیچ کارێکی لێ نەکات. ئاغای چاودێر، من تەواوی قسەکانی ئەو ڕۆژەم نایەتەوە یاد، چونکە سەعات و نیوێك و بگرە زیاتریش قسەی بۆ

کردم، بەڵام ئەوەندە دەزانم کە جێم هێشت دوا بڕیاری خۆم دابوو. ئێستەش هەوڵدەدەم پێتان بڵێم چیی پێوتم و چۆن ژیانی منی تێکوپێکدا. من ئەو ڕۆژە دیوە ڕاستەقینەکەی خۆمم پیشاندا!. تەواوی ئەو گرێ و گۆڵانەی لە کونجەکانی دڵمدا بوون کرانەوە. بێ پێچوپەنا پێتان دەڵێم: دوای ئەو ڕۆژە ئەمە دووەم جارە بێپەردە دڵی خۆم پیشانی کەسێك دەدەم، بەدبەختییەکەی منیش لەمەدایە. مامۆستا ماکان، ئەو پیاوە ئازاو قوربانیدەرەی کە جڵەوی دڵی زۆر خەڵکی لە دەستدا بوو، نەیویست و یان نەیتوانی پەی بەوە بەرێت کە لە قووڵایی ڕۆحی مندا چ هێزێکی ئەهریمەنی لە کێشمەکێشدایە لەگەڵ کۆمەڵێك هێزی ئینسانیدا. کەچی ئەو کوڕە بزێوە کە تەنها دوو سێ ساڵێك لە من گەورەتر بوو، وەك جووجەڵەیەك منی دەخستە دەستی خۆیەوە، هەناسەمی توند دەکرد، بەڵام کاتێك دەستی دەکردەوە و دەمتوانی هەوای ئازاد هەڵمژم، ئەو دەمە تەواوی ئەو نەوازشەی کە لە دەستی ئەو و مشتیدا بوو چێژم دەکرد. پێم نەوتن کە من دوو ڕۆحم لە جەستەیەکدا؟ ئەو دەیتوانی فریشتەکەی ناوەوەم پەروەردە بکات، بەڵام مامۆستاکەی ئێوە تەنها ئەژدیهاکەی نێو ناخی منی پەروەردە کرد.

"پێی وتم: "دڵت پێم سووتاوە وا پارەت بۆ داناوم؟ ئەگەر ڕاست دەکەیت ئەی بۆچی دڵت بە حاڵی ئەو لادێییانە ناسووتێ کە باوکت لە تاران پاروو لە دەمی خۆیان و دەمی مناڵە برسییەکانیان دەرفێنێت؟"

ماوەیەك قسەی لەگەڵمدا کرد، قسەکانی لە دڵمدا دەنیشتن و من باش هەستم بەوە دەکرد کە وەکو برایەك و وەکو هاوڕێیەك دەیویست من لەو گێژاوە دەربهێنێت کە تیایدا گیرم خواردبوو. سەرەتا دەربارەی نیگارکێشانەکەم قسەی کرد، پێی وتم: "تۆ ناتوانیت ببیتە هونەرمەندێکی بەتوانا، ئەمە بەردەلانێکی ترسناکە و تۆ لە هەموو ژیانتدا ئازاری ناکامیت نەچەشتووە. لەو ژینگەیەی کە لە تاراندا تیایدا پەروەردە بوویت، لەو بازنانەدا کە لێرە بە دەوری خۆتدا کێشاوتن، ناتوانیت ببیتە هونەرمەند. کەسیك لە هەموو تەمەنیدا برسیتیی نەچەشتبیت، کەسێ لە سەرمادا هەڵنەلەرزیبیت، کەسێ شەو تا سەحەر بیداریی نەکیشابیت،

چۆن دەتوانیت هەست بە لەزەتی تیری‌و، گەرما و، تیشکی هەتاوی بەیانیان بکات؟! تاقە جاریك چوویتەتە لای مامۆستا ماکان، ریزی لی نەگرتوویت، زۆر چاکە، ئەی چاوەریی چیت دەکرد؟ ئەو دیارییانەی دەستت چی بوون کە بۆت بردبوون؟ دەتویست ماچت بکات؟ چمکی کراسەکەت بگریێ؟ دەتویست برۆیتەوە بۆ لای! نە جاریك و نە دووان و سیان؟ دەتویست داوای شتی لی بکەیت؟ ئەو شتەی لە دەستی ئەودایە لە دەستی هەموو کەسیکدا نییە. ئەو هونەرمەندە و، دەسەڵاتی بەسەر رۆحی خەلکیدا هەیە. دەتوانیت خەلکی خەمبار بکات، بیانهینیتە پیکەنین، بیانگرینیت، هانیان بدات، ژیانیان لا خۆشەویست بکات، ئەو شتەی ئەو شکی دەبات نە بە پارە و تەنانەت بە رۆحیش ناکرریێ. بەڵام تۆ چونکە بە جوانییەکەی خۆتەوە دەنازیت و ئەو گەجەروگوجەرانەی دەوروپشتت مەراییت بۆ دەکەن، وات دەزانی ئیتر مامۆستاش دەبیێ بکەویتە سەرچۆك بۆت و تۆش خۆتی بەسەردا بفرۆشیت. تاقە جاریك چوویتەتە لای مامۆستا، نە ئەوەندە دیوتە و نەناسیوتە، کەچی حوکمی خۆشت بەسەردا داو رییەکی ئاسانترت هەلبژارد. لە دلی خۆتدا وتووتە: "پارەم هەیە و بۆ خۆم بۆ فەرەنسا دەچم، لەویێ هەزارانی وەکو ئەم نیگارکیشە هەن و بەو پارەیەی کە هەمە فیری نیگارکیشان دەبم لایان". ئەوەی باوکت بۆی نووسیویت، گەر برات هەبووایە یا مام یا هەر یەکێکی سەر بە چینەکەی خۆت هەر ئەوەی پیێ دەوتیت: شوو بکە و بگەڕێوە! ئەگەر کوڕیش بوویتایە دەزانیت باوکت چیی پیێ دەوتیت؟ دەیوت: شەهادەیەك بپچرە و بگەڕێرەوە! زۆربەی ئەوانەی کە ئێستا لە تاراندن لەم جۆرە شەهادانەیان پێیە و دەژین، بەڵێ دەژین بەڵام هونەرمەند نین. تا پەنجا ساڵی تر، تا سەد ساڵی تر و بگرە زیاتریش، خەڵکی هەر دەربارەی مامۆستا ماکان دەدوێن، بەڵام ئەم پاشا و وەزیرانەی دەیانبینیت، هەر ئەوەندەی مردن ئیدی لەبیر دەچنەوە. ئەمانە بەلای تۆوە گرنگ نین، تۆ بەدوا ناوبانگدا ناگەرێی، تۆ بە دوا پارەدا هەڵپە ناکەیت، تۆ بە شوێن بەختەوەریدا وێڵیت، بەڵام شەهادە و پارە و، شووکردن، مرۆڤ بەختەوەر ناکەن. دەبیێ ئازاری ژیان گینگڵی پیێ دابیت ئینجا لە دوورەوە

بەختەوەری چاوت لیٚ دادەگریٚت. تەماشەکە من نەخۆشم، ڕەنگە سیلیشم هەبیٚت، نازانم، ڕەنگە واش نەبیٚت. بەلاّم بەهەر حالٚ بیمار و ناساغم. دایکم منی لە ژووریٚکی بچووکی ناو باخیٚکدا بووە، بە جۆریٚك کە خاوەن خانووەکە گویٚی لە ناڵە و هاواری نەبیٚت، لەو ژوورە شیٚدارەدا من بە نەخۆشی پەروەردە بووم، خۆشم دەزانم کە زۆر ناژیم، ئەوپەڕی چەند سالٚیٚکی تر بژیم. بەلاّم بەختەوەرم، چونکە دلٚنیام کە خەریکی ئەنجامدانی کاریٚکم. دە سالٚی دیکە سەدان منالٚی سیلگرتوو چار دەکریٚن، ئەمە من بەختەوەر دەکات، ئەمە لەزەتیٚکە کە من لە تیٚکۆشانی دەبینم، لە کەسیش سلٚ ناکەمەوە. نە لە سەرۆکی ئاسایش و نە لە بلاّوکراوەکانی بالیٚۆزخانە! بگرە ئەوان لە من دەترسن، کاتیٚك یەکیٚك لە تابلۆکانم لە پیٚشانگایەکی پاریسدا پیشان دەدریٚ و سەفیری ئیٚران کتوپڕ تیلیگراف بۆ تاران دەکات و ڕاپۆرتم لیٚ دەدات، من لە خۆشیاندا خەریکم دەفڕم، بەلاّم نائومیٚد مەبە! هیٚشتا درەنگ نییە! دەتوانیت بەختەوەربیت، ڕیٚی هونەر هیٚشتا لەبەردەمتدا والاّیە، دەس لەو بەرەلاّیی و سەرە ڕۆییەت هەلٚگرە! کار بکە! ئازار بچیٚژە، ئەو پارە زۆرەی کە هەتە لە پیٚناوی شتی تردا خەرجی بکە. لە مالٚەوە شەونخوونی بکیٚشە، لە قوتابخانە ماندوو بە. بەرگەی ئازاری ناکامی بگرە، تا ببیتە نیگارکیٚشیٚك..".

"قسەی سووکی پیٚ وتم، بە خۆم، بە خانەوادەکەم، بە باوکم، بە هەمووان. بەلاّم هەرچییەکی دەوت ڕاست بوو، چزەی لە ناخی دلٚم هەلٚساند. کاتیٚك کۆکە گرتی و چەند ساتیٚك بیٚدەنگ بوو تا هەناسەی تازە هەلٚکیٚشیٚتەوە وتم: "خوداداد، تازە بۆ من درەنگە، تازە من بۆم دەرکەوتووە کە بیٚ بەهرەم". قوڕگم پڕبوو و دەستم کرد بە گریان. ئەمە یەکەم جار بوو لە بەردەمی پیاویٚکدا خۆم لاواز و زەبوون ببینم. خوداداد وتی: "بگری! خراپ نییە. بەلاّم نەك لەبەردەمی مندا، من بەرگەی گریانی ئافرەت ناگرم، بۆچی درەنگە؟ بۆچی وا دەزانیت تەمەنت چەندە؟ بۆ ئەوەندە بە هەلپەیت؟ هەن عومریکی تەواو ئازار دەچیژن و بەری ئەو عومرە ئازارەیان لە پیریدا دەخۆن. تۆ هەمووی پینج سال نابیت خەریکی نیگارکیشانیت

و هیشتا هیچت نەکردووە و دەتەوێ شاکار بخولقینیت" وتم: "نا، من مەبەستم شاکار خولقاندن نییە، من تەمەلم. ناتوانم خۆم بە تەنیا هیچ بکەم، سەیرکە ئیستا لەژیر دەستی تۆدا هەر کاریك بلییت دەیکەم، بەڵام خۆم ناتوانم بە تەنیا کار بکەم، بۆیە هیوابراو بووم. هەموو جارێ بریارم داوە کە ئیتر خۆم ماندوو بکەم، کەچی نەمتوانیوە، فیکەی هەتیویکی بەرەڵا کە بە ژیر پەنجەرەکەمدا رەت بووە منی بۆ دنیای رابواردن راکیشاوەتەوە، لای کێ ئەم قسانە لای بکەم؟" وتی: "باشە، بوون بە نیگارکیش و هونەرمەند تاقە ریگای بەختەوەری نییە، قەیدی چییە؟ وەك چۆن هەزاران ری هەن کە نازانیت بۆ کویت دەبەن، ئاوەهاش مەرج نییە بە تەنها هونەر ریی باڵا رۆیشتن بیت. مادامەکی وا هەست دەکەیت کە خۆت ناتوانیت بە تەنیا کاربکەیت، برۆ تا کەسانی دی یارمەتیت بدەن، تا بتوانیت ئەو پیستە فرێ بدەیت کە چینەکەت پیوەی نووساندوویت، برۆرەوە بۆ ئیران! برۆ بۆ لای مامۆستا ماکان و لەژیر دەستی ئەودا کاربکە. بەڵام بە لەخۆبوردنەوە لیی نزیك بەرەوە. خەلکی وڵاتەکەمان هیندە بەدبەخت و کلۆلن. پیویستییان بە یارمەتی هەیە و، تۆیەك دەتوانیت بە هەزار شیوە سوودمەند بیت. رەنگە ئەم ئازارەی کە ئەمرۆ دەیچیژیت؛ هەر ئەمە ریی رزگاریت بیت. بۆ ئەوەی ببیتە هونەرمەند، دەبێ لە پیشدا ئینسان بیت، تۆ تا ئیستاش نازانیت خەلکی نیشتمانەکەت لە چ ئاست و قۆناغیکدا ژیان دەبەنە سەر. برۆرەوە بۆ ئیران و ببە بە ئینسان! بەلکو ریی سەرکەوتنیش بە چنگ بهینیت! ئاخر خۆ ژیانیش بە تەنها بوونی خۆت نییە. ئیستا کە نەتتوانیوە ئەو ئەژدیهایەی کە ناخت دەخوات لە تابلۆیەکدا بیخەیتە روو، وەرە و ئەژدیهای ناو ژیانی کۆمەڵایەتیی خەلکی ئیران بکوژە و سەرکەوتوویی تۆش لەو کارەدا کە بە ئەنجامدانی هەزاران کەس سەرفراز دەبن، بەختەوەریت بۆ دابین دەکات. برۆ بۆ ئیران! لەوێ هەندیك لەو لاوانەی ئیران کە لە ئەورووپادا خویندنیان تەواو کردووە ریکخراویکی نهینییان هەیە، هێشتا شتێکی وایان دیار نییە. بەڵام رۆژێك لە رۆژان خزمەتێکی گەورەی ئەم وڵاتە دەکەن. ئەوان پێویستییان بە یارمەتیی کەسانی وەکو تۆ هەیە. هەر ئەم

جوانییەت کە بۆتە بەڵای گیانت دەشێ لە ئەنجامدانی هەندێ لە کارە دژوارەکانی ئەواندا سوودبەخش بێت. بڕۆ بۆ لای مامۆستا! داوای لێ بکە لەگەڵیدا کاربکەیت. بڕۆرەوە بۆ ئێران و بەخۆ بوردووییەوە بچۆرە لای ئەو، نەك بە لەخۆبایی بوونەوە، بەڵکو بە لەخۆبوردووییەوە پێی بڵێ کە چوار پێنج مانگ لەگەڵ مندا کارت کردووە.. پێی بڵێ.. کە..".

"هەر دوو ڕۆژ دوای ئەوە بڕیاری خۆم دا. ئاغای چاودێر، ئەو نهێنییەی مامۆستا لەم تابلۆیەدا بەم دەموچاوەی بەخشیوە، لەم بڕیارەدا خۆی حەشار داوە. هەر لێرەشدا بە هەڵەدا چووە. خۆشم نازانم، ئێستاش لەوە تێنەگەیشتووم. نازانم هاتمەوە تا بچمە لای مامۆستا و خۆم بەسەر دەست وپێیدا بدەم و داوای خۆشەویستیی لێ بکەم. یاخود بۆ ئێران گەڕامەوە تا ڕاسپاردەکەی خوداداد بەجێ بهێنم و بە هۆیەوە خۆم لە ماکان نزیك بکەمەوە و لەگەڵیدا ببمە ئاشنا و تۆڵەی خۆم لەو پیاوە بکەمەوە کە منی بەو ڕۆژە ڕەشە گەیاند و، یان هاتمەوە تا ژیانێکی شەرەفمەندانە هەڵبژێرم و ببمە مرۆڤێکی سوودمەند. نازانم. ئەویش، ئەو پیاوەی کە دەیتوانی مانایەك بە ژیانم ببەخشێ، سەرەتا دوودڵ بوو. بەڵام بەم چاوە هەرزەیەوە کە لەم وێنەیەدا کێشاونی، گەورەترین سووکایەتیی بە من ڕەوا بینیوە. ئەو وایزانی من بۆ بەدبەختکردنی ئەو و بە مەبەستی تۆڵە سەندنەوە بۆ ئێران هاتوومەتەوە..".

ئافرەتە نەناسەکە، خەریکبوو قوڕگی پڕ دەبوو لە گریان. بەڵام لە جێیەکەی خۆی هەڵسا. سەعات دەی شەو بوو. سەکینەی بانگ کرد و پرسیی: "شێو ئامادەیە؟"

سەکینە وتی: "بەڵێ خانم، ماوەیەك دەبێت شێو ئامادەیە".

-ئاغای چاودێر فەرموون.

لەسەر نانخواردنەکە هیچ قسەمان نەکرد. سەکینە لە پشتی کورسییەکەوە وەستابوو و بە فەرمانی خانمەکەی قاپەکانی دابەش دەکرد. فەرەنگیس چاوی بڕیبووە سەر سفرەکە و بێ ئیشتیهایانە پارووی بچووکی دەخستە دەمییەوە. دیاربوو بۆ ئەوەی من شەرم نەکەم هاتبووە سەر سفرەکە. من هەر چاوم لەسەر ئەو بوو، ئافرەتێکی بەدبەختم دەبینی بەرامبەرم دانیشتبوو، ئافرەتێك کە بەختەوەریی لە ژیاندا لەدەست دابوو و بێهوودە بەدوایدا دەگەڕا. ئەو کینەیەی یەکەم شەو لەگەڵیدا گرتمە دڵ لام نەمابوو. تەنانەت جارێك وای بۆ چووم کە ڕەنگە مامۆستا بووبێتە هۆی ئەم زەبوونییەی ئێستای ئەم ئافرەتە. ئەم ئافرەتە تلّپەی کۆمەڵگایەك بوو کە لە ناویدا نەشونمای دەکرد.

هەوڵم دەدا تەماشای چاوەکانی بکەم، بەڵام برژانگە گەورەکانی نەیاندەهێشت. کاتێك سەری بەرز دەکردەوە و دەمتوانی چاوە بادامییەکانی ببینم، هیچ ئاسەوارێکی بەدیم تیایاندا نەدەبینییەوە.ئەودەمە لە خۆم دەپرسی کە بۆچی مامۆستا نەیتوانیوە ئەم ئافرەتە ئارام بکات و بۆ ژیانێکی شەرەفمەندانە دەستی بگرێت.

بەر لەوەی پاشماوەی چیرۆکەکەی بگێریتەوە، من زیاتر دلـم بـە حـالی ئـەو دەسـووتا وەك بـە حـالی مامۆسـتا، بەهـەرحال ئینسـانیکی زینـدوو بەرامبـەرم دانیشتبوو. ئایا دەمتوانی یارمەتیی بدەم؟

ورده ورده هەستمکرد کە پێویستە حوکمی خۆمی بەسەردا بدەم، ئافرەتیکی پـاك بـوو. بـۆ سـەلماندنی ئەمـەش رەنگـە هـەر ئـەوە بـەس بێـت کـە بەرامبـەرم دانشتبوو و دانی بە گوناهەکانی خۆیدا دەنا، بەوپەری ئازایەتییەوە گشت لایەنـە لاوازەکانی کەسیتیی خـۆی شـی دەکردەوە، ئایا ئەمە بەلگە نـەبوو بـۆ پـاکیتیی ئەو؟

ریـی تیـنـەدەچوو ئـەم ئافرەتـە گوناهبـار بێـت. بـە کورتـی بێئـیرادە بـووە و رووداوەکـان بـە ئـارەزووی خۆیـان یارییـان پـی کـردووە. وەك پووشـێك بـەدەم گەردەلوولـەوە گەیشتۆتە کەشکەلانی فەلەك و پاشان کەوتۆتـەوە خـوارەوە. ئـەم ئافرەتە بێ ریا رووداوەکانی ژیانی خۆی دەگێرایەوە.

هەموو ئەو ئافرەتانەی تر کە هاوچینی ئەمن، وەکو ئەم چەندەها رووداویـان بینیوە و بەسەریاندا هاتووە، بەلام زۆر بە ئاسایی وەریانگرتووە و هیچ کـاتیك ویژدانیانی ئازار نەداوە. بەلام ئەم دەیویست بە گیرانەوەی هەموو ئەو رووداوە خۆش و ناخۆشانەی بەسەریهاتوون، ئەو خۆرەیە بکوژێت کە لە ناوەوە تارەکانی رۆحـی دەکرۆژێـت. تـا هیـچ نـەبێت ئەگـەر بـۆ یـەك سـاتیش بێـت هەسـت بـە ئاسوودەیی بکات. بەلام ناگەهان ئەوە بە خەیاڵمدا هات، کێ ناڵێت ئەم ئافرەتە بەهەڵـەدا نـەچووە و کـێ دەڵێـت مامۆسـتا ئـەم ئافرەتـەی بـە هەوەسـباز و ڕاڕا ناسیوە. من سالانێکە ئەم تابلۆیە دەبینم و هیچ کاتێك ئەو تەسەورە ناشرینەی لام دروست نەکردووە. چەندەها جار بە خۆم گوتووە کە ئەم چاوانە دڵڕفێنن و ناشزانرێ مامۆستا ویستوویەتی لە میانیانەوە چ جۆرە بیرو هەستێك بوروژێنێت.

بە چەندەها سەعات دانیشتووم و تەماشای ئەو چاوانەم کردووە، جاری وابوو بە خۆم دەوت ئەم چاوانـە هـی ئـافرەتێکی عاشـقن، ئـافرەتێك کـە پرکێشـی ناکـات عیشقەکەی خۆی دەربڕێت، ئافرەتێك کە مەزنیی خۆشەویستەکەی ئەمی ئەنجن

ئەنجن کردووە و ئێستاش هەر دەیجنێت و بینەر دەبێ لەو نیگایەیدا هەست بەو جۆش و خرۆشەی بکات. هەندێ جاریش بە پێچەوانەوە دەموت: "نەخێر، خاوەنی چاوەکان دەیەوێت پیاوێك بخاتە داوی خۆیەوە، پاش تاوێکی دی نێچیرەکەی ڕاو دەکات و ئەم ئافرەتە بەو خەندە فریودەرەی چاوەکانی کەیفی بە حاڵی قوربانییەکەی دێت". من نەمدەزانی کە ئەو چاوانە هی ئافرەتێکی عاشقی پاکیزەن، یان ئافرەتێکی هەوەسبازی بەرەڵڵا!! کاتێك چەقۆ و چەتاڵەکەم لەولاوە داناو وەکو ئەو چاوم بڕییە سفرە سپی و قاپە ئاڵتوونییەکان؛ سەیرم کرد ئەسڵەن چاوەکانی تابلۆکەم لەبیر چووەتەوە و حەزێکی سەیر دایگرتم بچم و سەرلەنوێ تەماشای تابلۆکە بکەمەوە. لەسەر سفرەکە هەڵسام و بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بڵێم، گەڕامەوە ئەو ژوورەی کە لە پێشدا لێی دانیشتبووین. خێرا کاغەز و جانتاکەم کردەوە و تابلۆکەم لەبەردەم مێزەکەدا دانا و دانیشتم و لێی وردبوومەوە. لە چاوەکاندا شتێکی تازەی وەهام نەبینییەوە کە تا ئەو دەمە پەیم پێ نەبردبێت. بەڵام هەستم کرد مامۆستا جۆرە زیرەکییەکی سەیری لەم تابلۆیەدا بەکاربردووە. دڵم بە حاڵی ئافرەتە نەناسەکە سووتا.

تابلۆکەم لە شوێنێکدا دانا کە خۆم بتوانم بەردەوام تەماشای بکەم، بەڵام ئافرەتە نەناسەکە ناچار بێت بۆ تەماشاکردنی ڕووی وەربگێڕێت. چەند دەقیقەیەکی زیاتر نەخایاند، دەرگاکە کرایەوە و ئافرەتەکە هاتە ژوورێ. هەر کە چاوی بە تابلۆکە کەوت، سەری سووڕما، دەتوت بە بینینی تابلۆکە وشك بووە. بەڵام ئەم سەرسوڕمانەی ئەوەندەی نەخایاند. تەنانەت هەنگاوەکانیشی سست نەبوون. دەرگاکەی داخستەوە و یەکڕاست چووەوە جێگاکەی خۆی و دانیشت. هیچی نەوت، شتێکی وەهاشی نەدرکاند کە بۆچی بەبێ ئیجازەی ئەو تابلۆکەم کردۆتەوە.

من تەماشای تابلۆکەم دەکرد و ئافرەتە نەناسەکەش سەیری منی دەکرد، لەوانەیە ویستبێتی بزانێت ئاخۆ من دوای ئەوەی کە لە نیوەی بەسەرهاتی ئەو لەگەڵ مامۆستادا ئاگادار بووم، دەبێ سەبارەت بەم تابلۆیە چۆن حوکم بدەم.

چەند دەقیقەیەك بێدەنگی بەرقەرار بوو. تا من كەوتمە قسەو پرسیم: "هاتن بۆ تاران و ڕۆیشتن و ماموستاتان دۆزییەوە؟".

وەڵامی نەدایەوە. جگەرەیەكی لەناو پاكەتێكی گوڵگوڵیدا دەرهێنا كە لەسەر مێزەكە بوو. كردی بەدار جگەرەكەدا كە هەر لەناو پاكەتەكەدا بوو، دایگیرساند و لە لێوە ناسكەكانییەوە دووكەڵی دا بە هەوادا و وتی: "بەو ئاسانییە نا كە ئێوە تەسەوری دەكەن، من ناوم فەرەنگیس نییە. فەرەنگیس ناوێكی خوازراوە كە خوداداد بەسەریدا دابڕیم و هەمیشە بەو ناوەوە بانگی دەكردم. واش بڕیار بوو لەو نامەیەدا كە بۆ ماموستای دەنووسێت بەو ناوە ناوی من بهێنێت، ئەگەر نامەكەشیان سانسۆر كرد كەس من نەناسێت. بۆ نامەنووسین ڕەمزێكی تایبەتییان هەبوو و هەمیشە ناوی ڕاستەقینەی كەسەكانیان دەگۆڕی. لە پاریس بڕیارمدا كە ڕۆژی دەی مانگی جۆزەردان من لەبەر دەرگای سینەماكەدا چاوەڕێی بكەم. بۆی نوسیبوو كە من جلوبەرگێكی سپی دەپۆشم و جانتایەكی سوورم لەدەستدا دەبێت. وامان دانابوو كە سەعات حەوتی ڕێك، هەركە من ئەوم دی، دوو بلیت بكڕم و دوو بلیتەكە بە دەستی ڕاستمەوە بگرم و بێئەوەی هیچ بەو بڵێم خۆم بە سینەماكەدا بكەم و ئەویش بەدوامدا بێت و پاشان لە تاریكییەكەدا قسە بكەین.

"ئەو دیمەنەم تەواو لە یادە، بەڵام خوداداد ئەوەی لەبیر چووبوو كە لە مانگی جۆزەرداندا سینەماكان لە هەوای ئازاددا درەنگتر دەست پێ دەكەن و بەڕێكەوت ئەو ڕۆژەش شەقامەكە زۆر قەرەباڵغ بوو و من نەمتوانی دەستوورەكەی خوداداد وەكو خۆی بەجێ بهێنم. چەند دەقیقەیەكیش لە حەوت تێپەڕیبوو كە هێشتا من ئەوم نەدۆزیبووەوە و سەرئەنجام ئەوە بوو بەرلەوەی بچینە سینەماكەوە لەگەڵ یەكدا كەوتینە قسە. بەم جۆرە، من دوای گەڕانەوەم لە ئەورووپا ئەوم بینی، بەڵام ئەمە بە دەم چەند ئاسانە. تەماشاكەن، بیهێننە پێشچاوی خۆتان، ئەو دەمە دەبێ بە چ جۆش و خرۆش و دڵەلەرزەیەكەوە خۆم بۆ ئەو یەكەم دیدارە ئامادە كردبێت. ئەو ڕۆژانە ئافرەتێك بووم تێگەیشتوو، پێنج ساڵ ژیانی بێ بەند و بارم لە

ئەوروپادا بەسەر بردبوو. زۆربەی شارەکانی ئەوروپام بینیبوو و لەگەڵ جۆرەها خەڵکدا تێکەڵ بووبووم. هەمووش خۆشیاندەویستم، بەڵام لە هەمانکاتدا من ئافرەتێك بووم تەنیا و نامۆ.

"هەموو شاری تاران خۆم و بنەماڵەکەمیان دەناسی، بەڵام من لە نێویاندا هەستم بە غەریبی و تەنیایی دەکرد، نەمدەتوانی هۆگریان بم، ئەوانە لە زمانی من حاڵی نەدەبوون و هەست و بیروباوەڕیان بۆ من سەرچاوەی جاڕسی بوو. هیچ جۆرە پەیوەندییەك لە نێوان من و خەڵکیدا نەبوو و ئەوانەی ئەو ڕۆژە بە "خەڵك" ناودەبران، واتە ئەوانەی کە قسەکانیان دوو دیوی هەبوو وەختێ لە باوکمیان بیستبوو کە کچێکی هونەرمەندی لە ئەوروپایە، کۆمەڵێك تەسەوریان سەبارەت بە من لا خولقابوو، کە من دڵم پێیان تێکەڵ دەهات. ئەو باوکە بەسزمانەشم کە چەند منی خۆشدەویست، کەچی هەستم دەکرد لە هەموو ئەوانی تر زیاتر بە من غەریبە. شەوانە کە دەمانتوانی دوو سێ سەعات پێکەوە دابنیشین و قسە بکەین، تەواوی وەختەکەی بۆ ئامادەکردنی سینیی مەشروب و عەرەقەکەی تەرخان دەکرد. جاری وابوو بە سەعات لەسەر ئەو گۆشتەی کە باش بۆیان نەبرژاندووە یا ئەو دوومەڵانەی باش بۆیان سوور نەکردووەتەوە دەڕۆیشت. بەڵام هەر ئەوەندە دوو سێ پێکی فڕ دەکرد، ئیدی مەست دەبوو و دەکەوتە گاڵتە و گەپ و لاساییکردنەوەی دایکم، جگە لەوە حەزی دەکرد باسی ئەو خوازبێنیکەرانەی من بکات کە بەردەوام ڕێیان بە ڕێی ماڵمانەوە بوو. دایکم ئەوەی لێکنەدەدایەوە کە من پێنج ساڵی تەواو لە پاریس ئازاد بووم و هەر بە چاوی جارانەوە سەیری دەکردم، کە من ئەو کچە هەڤدە هەژدە ساڵانە چاو و گوێ بەستراوەم و، دەبووە مووی لووتم و لێمی دەپرسییەوە کە سەعات ئەوەندە بۆ کوێ چووم و کێم دی، فلان پیاو کە فلانە ڕۆژ هاتبوو بۆ لام و کارتێکی بۆ ناردبووم کێیە و، فلانە نامە لە کوێوە بۆم هاتووە و فلانە شەو لە کوێ دەعوەت بووم و منیش نەمدەویست ئەم دوو مرۆڤە میهرەبانەی کە زۆر خۆشیاندەویستم لە خۆمیان بڕەنجێنم.

"ئەوەشتان لەیاد نەچێت کە من بە چ جۆش و خرۆشێکەوە چاوەڕێی ئەو یەکەم چاوپێکەوتنە بووم، من دەسبەرداری خۆشەویستترین شت بووم لە ژیانمدا، وازم لە هونەر هێنا و ئەفەرۆزم کرد، چونکە خودادادا تێیگەیاندبووم و ئەو بیرەی تیامدا پەروەردە کردبوو کە من دەمتوانی ببمە ئەڵقەیەکی زۆر گرنگ و پتەو لەو بزووتنەوە نوێیەی کە خەریکە لە تاراندا دژ بە دیکتاتۆریەت ڕەگ دادەکوتێ. هەروەها ئەوەم لە بیرمدا چاندبوو کە کەسێتیی هەر مرۆڤێك تەنانەت چەند لاواز و بچووکیش بێت، لە کاتی تایبەتیدا و، لە هەلی نائاساییدا دەشێ ڕۆڵێکی زۆر گەورە بگێڕێت. دەشێ چارەنووسی وڵاتێك هەندێ کات بە فیداکاریی کەسێکی ئاساییەوە بەند بێت.. تەنانەت نەك فیداکاریش، بەڵکو دەشێ بەند بێت بە سەرچڵی و دلاوەریی کەسێکی لاوازەوە کە وەکو برغویەك جێیەکی بچووکی لە دەزگایەکی گەورەدا داگیر کردووە. منیش لای خۆمەوە ئەوەم بۆ خۆم دانا و چاوەڕێی ئەنجامێکی باش و پڕ بەها بووم، بەخۆم دەوت: "وا خەریکە بزووتنەوەیەك دژ بە دیکتاتۆریەت لە ئێراندا ڕەگ دادەکوتێ و مەڵبەندی ئەم بزووتنەوەیەش هەروەکو خودادادا پێی وتم لە ئەوروپایە و من لە ڕێکخستنەکانی ئێراندا کاردەکەم و ئەو کەسەی کە لە ئێرانیش بزووتنەوەکە بەڕێوە دەبات ماکانە و بە کورتی منیش ئەو برغووە بچووکەم کە لە دەزگایەکی گەورەدا شوێنێکی بچووکم داگیر کردووە. من دەبێ فەرمانەکان بەو بگەیەنم و هێندەشی پێ ناچێت کە من خۆم دەبمە هەمەکارەی ئەم بزووتنەوە بەرەنگارە و ئەو دەمە تەنانەت ماکانیش دەبێ بچێتە ژێر ڕکێف و دەسەڵاتی منەوە".

ئۆه. ئای لەو خەونە سامناك و خۆشانە! سەرنج دەفەرموون: من چارەنووسی خەڵکی وڵاتم بەلاوە مەبەست نەبوو، ئازارەکانی ئەوان دڵی منی نەدەسووتاند. هاوخەمییانم نەدەکرد، هەرچییەك ڕووی بدایە من خۆم سەلامەت دەبووم، چ پەیوەندییەك منی بەو گەجەروگوجەرانەوە دەبەستەوە کە پڕی ئەم وڵاتە بوون؟ من چیم داوە بە سەریانەوە؟ بۆ بیریان لێ بکەمەوە؟ تەنانەت کاتێك بەرەوپیری مەترسییەکیش دەچووم، دیسان هەر بیرم لە خۆم دەکردەوە. ئەمانە هەموو

ڕاستن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خاڵێك هەیە حەز دەکەم بیڵێم. ڕەنگە ئێوە قبووڵی بکەن، وەڵێ ئەو هەرگیز قبووڵی نەکرد. گەر قبووڵی بووایە هەرگیز وێنەی منی بەو جۆرە نەدەکێشا.

"ئاغای چاودێر.. حەز دەکەن باوەڕم پێ بکەن، حەزیش دەکەن مەیکەن. بەڵام من دەمەوێ تەواوی کونجوکەلەبەرەکانی ڕۆحی عەزابدیدەی خۆمتان پێ پیشان بدەم. مامۆستاکەی ئێوە وایزانی من بە نیازی تۆڵەسەندنەوە لەو ئیهانەیەی پێنج ساڵ لەوەوبەر واتە بەر لە ڕۆیشتنم بۆ فەرەنگستان کردبوومی، هاتوومەتەوە و دەمەوێ ببینم. لە کاتێکدا من ئەو ڕۆژانە، واتە لە یەکی جۆزەردانەوە کە گەیشتمەوە تاران تا دەی جۆزەردان، بە هیچ جۆرێك ئەو چاوپێکەتنە کۆنەم لەیاد نەمابوو. دونیایەکی دیکە بە ڕوومدا کرابووەوە. حەز بە پلەوپایە چووبووە بن کلێشەمەوە. من دەمویست لەو چالاکییە کۆمەڵایەتییانەدا کە بێگومان مەبەستێکی تایبەتی خۆمم تێدا دەبینییەوە بەختەوەری وەچنگ بهێنم، ئەو قینەی بەرامبەر ئەو پیاوە لە دڵم گرتبوو، لەبیرم چووبۆوە.

"هەر لە دووەم ڕۆژی هاتنەوەکەمەوە بۆ ئێران کەوتمە سووسە کردنی ژیانی ئەو، تا بۆم ڕوون بۆوە کە هەموو ڕۆژێك بۆ ئەو قوتابخانەیە دەچێت کە ئێستا ئێوە چاودێرین و عەسرانیش سەعات پێنج و شەش لێی دێتە دەرێ. ئاخرییەکەی بە هۆی ئەو ناونیشانەوە کە وەرم گرتبوو، هەروەها بە یارمەتیی زەینی خۆشم، ڕۆژی پێنجەمی جۆزەردان دۆزیمەوە و تا ماوەیەك لە شەقامەکەدا لە نزیکییەوە شان بە شانی هەنگاوم ناو دەمویست بە چاوی ئەو هونەرمەندەوە کە هێشتا تیامدا نەمردبوو لێی وردببمەوە و سەروسیمای بە یادم بسپێرم. ئەو ڕۆژە بە چاوی ئافرەتەوە، ئافرەتێکی هەوەسباز و تینووەوە تەماشام نەدەکرد، بەڵام نازانم بۆچی دڵم تەپەتەپ لێی دەدا. دەمویست ئەم کابرا دلاوەرە بناسم کە گیان لەسەردەستانە خەباتی دەکرد و، لە ناخی دڵەوە پێکەنینی بە دەزگا تۆقێنەرەکانی ڕژێم دەهات و، ڕۆژی دەیەمی جۆزەردان لە یەکەم دیدارم لەگەڵیدا بە جۆرێك ڕەفتار بکەم کە جێی ڕێزی بم. بەو جۆش و خرۆش و بەو پەرۆشی و

بەو چاوەنۆڕی و ئومێدەوە، چەند دەقیقەیەك پاش سەعات حەوت لە ڕۆژی دەیەمی جۆزەردانی ساڵی 1935دا چاوم بە ماکان کەوت.

"بەڵام ئێستا دەبێ ئەوەتان پێ بڵێم کەهەر ئەوەندە تەماشایەکی دەموچاویم کردو چەند قسەیەکم لەگەڵدا کرد، ئیتر تەواو حاڵی من گۆڕا و هەمدیسان بوومەوە بەو ئافرەتەی جاران کە هەست دەکات لەگەڵ پیاوێکدایە کە لە خۆی گەورەترە و لە خۆی بەهێزترە. دەزانن ئەگەر مامۆستاش وەك پیاوانی دی دڵی خۆی پێم بدایە، لەوانە بوو برووسکەی ئارەزوویەك پێکەوە کۆی بکردینایەتەوە و بە هەمان هێز ئەو برووسکەیە بکوژایەتەوە، بیرەوەریی مامۆستاش وەکو بیرەوەریی پیاوەکانی دی لە فەرامۆشخانەی دڵمدا ون ببوایە. هەستێکی پەرت و پەنهان گینگڵی بە دەروونم داو وا هاتە پێشچاوم بەرامبەر پیاوێکم کە پێویستی بە منە، پێویستیی بە ڕۆح و لەشی منە. نا.. بەرامبەر پیاوێکم کە دەمپەرست و دەمویست بەختەوەری بکەم و خۆشم لە ئامێزیدا تامی ئەو بەختەوەرییە بکەم کە بەدوویدا وێڵم.

"زۆربەی ئەو شتانەی کە تا ئێستا بە ئێوەم گوتوون و ئەوانەش کە ئێستاو دوایی دەیانڵێم دژ بە یەکن. جاری وایە ئەوەی دەیڵێم لەگەڵ ئەوەدا کە دوای ئەو بە تۆزێك دەیڵێم ناکۆکە و ئێوە چۆنی لێك دەدەنەوە سەربەستن. بەڵام بەهەر حاڵ من هەر ئەوەم کە ئێستا دەمبینن، من خۆم چۆنم ئاوەها خودی خۆمتان بێ ڕتووش پیشان دەدەم. ئەو دژایەتی و کێشمەکێشە لە قسەکانمدا نییە، بەڵکو لە بوونمدایە. دەزانن ژیانی من دەبێ بەچی بشوبهێنرێ؟ بە کانیاوێکی ڕوون کە لە گۆشەی کوێستانێکدا و لە زەمینەوە هەڵدەقوڵێت، ئاوەکە بێگەرد و فێنکە، ژیانبەخشە و خرۆشێنەری ڕۆحە، ئەم ئاوە کە لە کێوەکانەوە بەرەو خوار دێت بە هاژە و تافە تافە.دەدات لە تاشە بەردەکان، گژوگیاکان هەڵدەکەنێت، لم و زیخەکان لەگەڵ خۆیدا ڕادەماڵێت، وەختێ گەیشتە تەختایی، ئارام و هێمنە. چیمەنەکان پاراو دەکات و تەڕ و تازەیی بە گوڵەکان دەبەخشێت و دەبێتە سەرچاوەی پیت و فەڕ. هەمان ئاو کاتێك دەگاتە زۆنگاوێك یان زەلکاوێك؛ بۆگەن

دەکات. کاتێك دەگاتە خاکێکی نەرمیش ڕۆدەنیشێتە قوولایی و بەسەر ڕووی زەوییەکەوە ئاسەواری نامێنێت. بەلام هەمدیسان کاتێك لە بنی زەمیندا دەنیشێت بێگەرد و پاك دەبێتەوە، ئەمەیە ژیانی من. هەمان ئاوی ساف و ڕۆحبەخشە کە ئەو شێوە جیاجیایانە بە خۆیەوە دەگرێت. ئیدی ئێمە لەمەڕ چ دژایەتییەکەوە دەدوێین؟

"بە پێچەوانەی تەواو ئەوەوە شتانەی کە وای بۆ دەچووم چیتر ئەو ناتوانێت کارم لێ بکات، تەوێڵی بڵندی و، چاوە گەورە و تیژەکانی و، جلوبەرگی شیکی و هەڵسوکەوتی قورس و سەنگینی و، شێوازی وردی قسەکردن و فشاری دەستە قورسەکەی، ئەمانە هەموو پێکەوە بە جارێك منیان سووتاند و جگە لە کەوەیەك هیچ شتێکی دی لە بوون و کەسێتیی ساختەی من نەمایەوە. من بە ڕادەیەك هەستم بە لاوازی و بوودەڵەیی خۆم کرد کە بڕوام نەدەکرد. ئەمە هەستێکی تازە بوو و لەوەوبەر هەرگیز هەستی وەها داینەگرتبووم. هەر ئەوەندە قسەیەکی دەکرد من سەراپا سوور هەڵدەگەڕام و ئیدی ئەو ئازایەتی و جەسوورییەی جارانم لانەمابوو. شەرمم دەکرد، هەروەکو ڕۆژانی پانزە سالیم. وەختێ لەشم بەر لەشی دەکەوت گشت بەدەنم گرژ دەبۆوە، من ڕێزی خودادام دەگرت، ئەو منی ترساندبوو، بەلام لەوێ ئەو ئافرەتە جوانەی کە لە بوونی مندا پەنهان بوو، داوای هیچی نەدەکرد و چاوەڕێی هیچ نەبوو. لێرە ئافرەتێکی هەڵوەدا، ئافرەتێکی عاشق، ئافرەتێك کە بۆ تاقە جارێك لەسەر دەستی پیاوێك چێژی ئیهانەی کردبوو، ئالاکەی خۆ نوشتاندەوە و، هەستمکرد چیتر دەسەلاتم بەسەر خۆمدا نەماوە.

کاتێك سینەماکە تاریك بوو، لێی پرسیم: "ناوت چییە؟" وتم: فەرەنگیس" هەر ئەوەندە دەنگمی بیست، بە چاوە گەورەکانی کە لە تاریکییەکەدا وەکو چاوی پشیلەی ڕەش دەبریسکانەوە سەیرێکی کردم و، منیش وەکو ئافرەتێکی بەسزمانی دیلی دەست پیاوێکی بەتوانا، ڕووم وەرگێڕا و نیگایەکی ئەوم کرد، بەلام نیگایەکی پڕ لە بێدەسەلاتی، پڕ لە تکا و پاڕانەوە. وتی: "لەوە دەچێت

پێشتر ئێوەم لە شوێنێك بینیبێت!!" وتم: "من قەت ئێوەم نەبینیوە". وتی: "دەنگتان بە گوێم ئاشنایە". وتم: "خەیاڵی خۆتانە" بۆچی درۆم کرد؟ لەبەرئەوەی دەمویست ئەو پەیوەندییەی کە لە ڕابردوودا ژیانی منی بە ژیان و بوونی ئەوەوە بەستبۆوە بپسێت. نەمدەویست بزانێت کە من هەمان ئەو کچە ڕاڕا و بێشەرمەی کارگەی نیگارکێشانەکەیم لە شەقامی لالەزار، دەمویست بە سووکییەوە نەڕوانێتە کەسێتیم.

"فیلمێکی تازە بۆ تاران هاتبوو. ئەو شەوە حەشاماتێکی زۆر ڕژابوونە سینەماکەوە، بۆیە تەنانەت لە ڕاڕەوەکانیشدا کورسیی درێژی تەختەیان هێنابوو خەڵکیان لەسەر دادەنیشاند. ئەوەی دەست ئێمەش کەوت تەنها جێی تاقە کەسێك بوو لەسەر یەکێك لەو کورسییانە. بەڵام من خۆم کۆکردەوە و جێی ئەویشم کردەوە. دەستی لەسەر قەراغی پشتەوەی کورسییەکە دانابوو، تا لەسەر کورسییەکە نەکەوێت. من تۆزێك پاڵەپەستۆم خستە سەر ئەو کەسەی ئەولاوە، بە مامۆستام وت: "وەرنە ئەملاترەوە تا بتوانن باش دابنیشن" بەڵام ئەو نەیهێشت لەشی بەر لەشم بکەوێت. من حەزمدەکرد دەستی بخاتە سەر شانم و توند لەشی بە لەشمەوە بنووسێنێت. حەزمدەکرد هەست بە گەرمای بەدەنی بکەم، حەزمدەکرد توند دەستی بگرم و بینێم بە سنگمەوە تا بزانێت دڵم چۆن لێ دەدات، تا بزانێت دووچاری چ پەشۆکان و شڵەژانێك بووم، ئاخ.. دەمویست خۆم بچووك و لاواز پیشان بدەم، تا دڵی پێم بسووتێ.

"چیرۆکی تابلۆی "چاوەکانی" لەوێوە دەستیپێکرد. باوەڕم نەدەکرد مامۆستا ماکان، ئەو نیگارکێشە مەزنەی کە بە یەك نیگا پەی بە گشت نهێنییەکان دەبرد، تەماشای من بکات و هەست بەو شۆڕشەی نێو ڕۆحی من نەکات. هەر لەو یەکەم شەوەوە شەیدای چاوەکانی من بوو، هەمیشە لە خۆی دەپرسی ئاخۆ دەبێ چ نهێنییەك خۆی لەم چاوانەدا حەشار دابێت، ئەم چاوانە چییان لە گیانی من دەویت؟ چەند سال پەی دەرپەی بەدوا وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەگەرا. تا دەبینیت لە کۆتاییدا بەم جۆرە وەڵامەکەی دایەوە کە ئیستا ئیوە لەم تابلۆیەدا دەیبینن.

وەلێ ئەو ڕۆژانە من خۆشم نەمدەزانی چیم دەوێت، سڵم لەم پیاوە بە ئەزموون و شەرمن و گۆشەگیرە و لە هەمان کاتدا ئاگرین و پۆڵایینە دەکردەوە، کە لە بیری هەموو شتێکدا بوو تەنها دڵداری نەبێت، لەگەڵ کچێکی لاوی وەکو مندا. هەر لە یەکەم ساتەوە لەگەڵیدا هەستمکرد ئەگەر نەیخەمە ژێر کاریگەریی خۆمەوە، ئەوا ئەنجن ئەنجنم دەکات، ڕەنگە ئەو دەمە بە درۆ و بە چاوێکی عاشقئاساوە نیگام کردبێت، بەڵام مەبەستم ئازاردانی نەبووە، مەبەستم فریودانی نەبووە، دەمویست لە بەرچاوی ئەو خۆم وەك ئافرەتێکی تێگەیشتوو و دنیادیدە بناسێم. ئاخ، نازانم ئەو هەست و سۆزەی ئەوسام، تەعبیری لە پاکی و لەخۆبوردوویی من دەکرد یان لە ساختەیی و هەوەسبازیم. کە شتێکی لێ دەپرسیم من وەڵامێکی دوو لایەنەم دەدایەوە، ئەمە لە کاتێکدا نەمدەوێرا لەگەڵ خودادادا درۆیەك چییە بیکەم. دەربارەی پاریس پرسیاری لێ کردم، دەربارەی خوداداد. حەزی دەکرد ورد و درشتی ژیان و تەندروستیی ئەو بزانێت، سەبارەت بە قوتابییەکان، ژمارەیان و کاریگەریی خوداداد لەسەریان لێی دەپرسیم. ئایا من لەگەڵ قوتابییەکانی تریشدا پەیوەندیی ڕامیاریم هەبووە یان نەء؟ کەی خوێندن تەواو دەکەن و کەی بۆ ئێران دەگەڕێنەوە؟ ئایا خوداداد لە چالاکییەکانیان قایلە؟ ئینجا هاتە سەر ئامۆژگاریکردنی من. لەم قۆناغەدا کاری ڕامیاری شتێکی خەتەرناکە، بە ئاگر یاریکردنە، وا نەزانم ئێرەش پاریسە و دەوڵەت دەستی بە دوژمنەکانی ناگات، ئایا ئاگادارم کە دەوڵەتی ئێران پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی فەرەنسادا پچڕاندووە و بڕیارە هەموو قوتابییە ئێرانییەکان بۆ سویسرا و بەلجیکا بنێردرێن؟ نابێ وا بزانم لەبەرئەوەی ئافرەتم ئیتر جێی گومان و مەترسی نابم، ئەوەندە نابێت چەند ئافرەتێکیان لە ڕەشت و تەورێز گرتووە و، نزیکەی دوو ساڵیش دەبێت دوو ئافرەتی تر گیراون و وان لە زینداندا. دائیرەی ئاسایش بەزەیی بەکەسدا نایەتەوە، گەر بمەوێ ببمە کەسێك خزمەتی کۆمەڵەکەم بکەم، دەبێ زیاد لە ڕادەی پێویست ئاگام لە خۆم بێت. گفتوگۆی ڕامیاری لەگەڵ کەسانێکدا کە شایستەی ئەوە نین، جگە لە زیان هیچی تری لێ چاوەڕێ ناکرێ. هەندێ جار وا

چاکە بە شانوباڵی ڕژێم و دیکتاتۆردا هەڵبدەیت و ئەمە بە گوناه ناژمێردرێ. ئینجا لەبەرئەوەی من لە فەرەنگەوە گەڕاومەتەوە، گومانی تێدا نییە کە دەخرێمە ژێر چاودێرییەوە و بۆیە وا چاکە تا ماوەیەك هامشۆی یەك نەکەین.

ئایا هیچ نامەیەکم لەگەڵ خۆمدا هێناوە؟ پرسیاری دەکرد و وەڵامی ڕوون و ڕاستەوخۆی لێم دەویست. هەندێ جار قەناعەتی بەوەڵامەکانم نەدەکرد، بۆیە هەمدیسان وردتر پرسیارەکەی دووپات دەکردەوە، یان پرسیارەکەی بەش بەش دەکرد و سەرنجی منی بۆ خاڵە گرنگەکانی ڕادەکێشا.

"بەڵام من لەو شتانەی ئەو دەیوتن دابڕابووم، وا نەزانن ترس دایگرتبووم. ڕاستە ئەو ڕۆژانەی تاران ڕۆژانی ترس گومان و نائومێدی بوو، هەموو لە یەکتر دەترسان، ترسی منیش نە زیاتر و نە کەمتر بوو لە ترسی ئەوانی دی. بەڵام سەرباری ئەوە، من هەستم بە مەترسی نەدەکرد، دائیرەی ئاسایش دەیتوانی کەسێکیوەکو خواداداد وەیلان و سەرگەردان بکات، وەلێ خانەوادەکەی ئێمە لە دەزگاکانی ڕژێمدا دەستی دەڕۆیشت و لەوەوبەریش نەمبیستبوو دەوڵەت خانەدانی وەکو خانەوادەکەی ئێمەی گرتبێت. گرتنی وەزیری جەنگ و کۆمەڵێك پیاوی تری وەکو ئەو مەسەلەیەکی تر بوو. ئەوانە دەستیان لە سیاسەتی دەوڵەت وەردابوو، ئەگینا کەسێك هەقی بەسەر منەوە نەبوو، من بەمجۆرە بیرم دەکردەوە، لە سەرێکی تریشەوە ژیانی من هێند شووم و بێزراو بوو کە پەیوەندیم لەگەڵ کاربەدەستانی ئاسایشدا تەنها لە ڕووی کات بەسەر بردنەوە بوو.

"ئیدی من لە ئامانجێك زیاتر هیچی ترم لە ژیاندا شك نەدەبرد، ڕۆژگار خەریکبوو بە دەممەوە پێدەکەنی. من ئەو کابرایەم دۆزیبوٚوە کە ساڵانێك بە بێئەوەی بیبینم یا بیناسم خۆشمدەویست و، کارکردنە سەر هەست و سۆزی بەهەر ڕێگایەك بێت پیرۆزترین مەبەستی من بوو. لای من ئەوە مەترسیی گەورە بوو کە ئەو هەمیشە سارد بێت لەگەڵمدا و بە زمانێکی ڕەسمی لەگەڵمدا قسە بکات، من دڵم پەلەپەل بکات و ئەویش بێباکانە خەریکی ئەنجامدانی کاری خۆی بێت و منیش ناچار بم درۆ بکەم. من گەر دەمزانی دەتوانم پەیوەندییەکی

مانەویی قووڵتر لە پەیوەندیی رامیاری بە مەبەستی ئەنجامدانی ئەو چالاکییە نهێنییانە لەگەڵدا ببەستم، ئامادە بووم خۆم فرێدەمە بەرپێی، دەست لە هەموو شتێکی خۆم هەڵگرم، کەسێتیی خۆم پێشێل بکەم، بەڵام دڵم وای پێ دەوتم کە ناتوانم لەم رێیەوە لەگەڵیدا تێبکەوم، دەبێ دەست و پەنجەی لەگەڵدا نەرم بکەم و لە کێشمەکێشدا شکستی پێ بهێنم.

"باسی ژیانی خۆمم بۆ کرد، باسی سەفەرەکەی ئیتالیام، وەسفەکەی ستیڤانۆو چۆنێتیی یەکترناسینم لەگەڵ خودادادا، لە تەواوی قسەکاندا خۆم ئازاو وردبین لەقەڵەم دەدا. کاتێ پێیدەوتم کە دەبێ وریابم و ئاگام لە خۆم بێت، لە وەڵامدا دەموت: "بیر لە من مەکەنەوە، تازە کار لەکار ترازاوە و، من رێ و رەوشی خۆم باش دەزانم.." بە جۆرێك باسی لاوە پاریسییەکانم بۆ کرد، وەك ئەوەی هەموویان بێ ئەزموون و هیچ لەباردا نەبووبن. هەر لە یەکەم ساتی گفتوگۆکردنمەوە لەگەڵیدا دەمامکێکم پۆشی و بریارم دا کە ئەم پیاوە نابێ سیمای راستەقینەی من ببینێت. چونکە گەر دەرك بە لاوازی و خەوشەکانم بکات، ئیدی کەسێتیی من بەلای ئەوەوە هیچ نرخێکی نابێت، ئەو ئیشە بچووکانەی کە بە دەستووری خوداداد ئەنجامم دابوون، سەد ئەوەندەی قەوارەی خۆیان گەورەتر پیشانم دەدان. مەسەلەی وەهام دەهێنایە ئاراوە کە ئەو رۆژانە تەقەی سەرم دەهات لێیان. ئەوەی کە لەم و لەوم بیستبوو یان رۆژێك لە رۆژان لە رۆژنامەیەکدا خوێندبوومەوە وام لە قاڵب دەدا هی خۆم بێت. هەندێ جار دەقاودەق قسەکانی خودادادم دەوتەوە. زەردەخە دەوری چاو و لێوەکانمی جێ نەدەهێشت. تەواوی هونەری دڵرفاندنی خۆمم خستبووە گەڕ. ئەو شەوی یەکەمە من مەبەستێکم لەو خستنە گەڕی هونەری دڵرفاندنە هەبوو. ئەو لە قسەکانیدا پێی وتم کە دەبێ تا ماوەیەك یەکتر نەبینین. تەنانەت نەیدەیویست ناونیشانی مامەڵەکەشیم بداتێ. لە کاتێکدا من ئیتر بریاری چارەنووسی خۆم دابوو و دەمویست تا کۆتایی لەگەڵیدا برۆم. ئەو نابێ بتوانێت ماوەیەکی زۆر من نەبینێت. ئەو دەبێ هەر لە یەکەم شەوەوە ئەوە بزانێت کە لەگەڵ ئافرەتێکدا کە هاوشانی ئەو نییە رووبەروو

بووەتەوە. نابێ وا بزانیت کە لەگەل کەسیکی سیاسیی ئاسـاییدا هەلسـوکەوت دەکات، ئەو دەبێ لە بیری منـدا بیت و ئەمەش کاتیك دیتە دی کە ئیمە زوو زوو یەکتر ببینین و لە هەلسوکەوتی لەگەلمدا، لە قسە خۆشەکانی من، بە دەموچاوە جوانەکەم، لە خەندە شادیهینەرەکانم، لە چاوە پر ئەفسـوون و سـیحراوییەکانم چیژ ببینیت.

"لە پاریس کە کەوتبوومە ژیر کاریگەریی خودادادەوە و هەرچییەکی دەوت بە قسەم دەکرد، هۆیەك لە پشت ئەمەوە هەبوو. لەوێ ئامادە بووم گیانی خۆشـم ببەخشـم. جگـە لـەوە لـە پـاریس هـەر مرۆڤیـك بـە چـاویکی تـرەوە دەروانیتـە هاونیشتمانانی خۆی. بەلام کاتیك هاتمەوە بۆ ئیران و لەگـەل خـەلکیدا تیکـەل بووم، نائومید بووم. من ئەو خەلکە رەمەکیـەم بـە هۆشـیارتر و ئـازاتر دەزانـی، کەچی لە تارانی مەرگباری ئەو رۆژەدا بە چاوی خۆم دەمبینی ئەو خەلکە چۆن مەرایی بۆ پیاوانی رژیم دەکەن. لـەوێ لـە پاریس ئامادە بووم ژیانی خۆم بکەمە قوربانی خەلکانیك کە لە تەسەوری خۆمدا هەبوون. جگە لەوەی هەستم دەکرد بۆ منیکی شکستخواردوو لە ژیاندا، جگە لەم رییە رییەکی دیکە نەبوو. یان دەبووایە لەگەل یەکیك لەو بابا بیشەرمانەدا بژیمایە، یان خویناوی دلی خۆم بخۆمـەوە و کۆتایی بـە ژیـانی خـۆم بـهێنم. رێـی سـێیەمیش ئـەو رێـی تێکۆشـانە بـوو. ئـەم تێکۆشانە منی هان دا، ئومێدی پێ بەخشیم، بەلام تا ماوەیەك، تا ئەو دەمەی کە ئەوم تێدا بینی. لە پاریس منی بێبەهرە بە شوێن شتێکدا چووم کە زۆر لە خۆم گەورەتر بوو، دەرۆستی نەهاتم. لەوێ گرفتاری نائومێدییەکی کوشندە بووم، ئەو دەمە ئامادە بووم ئەم رێی سێیەمە بگرمە بەر. وامدەزانی مانایەکم لە ژیـانمدا دۆزیوەتەوە. لەو هۆکارە تایبەتییانـەی خۆشـم بـەولاوە، ژیـانی سـادە و پـاکژی خوداداد و میهربانوو، بە تایبەتیش لە خۆبوردنی ئەم کیژە ناسکە، بۆ من بوو بوو بە نموونەیەکی جوان. رۆژێکیان (میهربانوو) دەردی دلی خۆی بۆ کردم و وتی: "گـەر دەزانـن مـن چـەند خـوداداد خۆشـدەوێت، خۆشـم دەزانم ئـەم

خۆشەویستیەمان ناگاتە ئەنجام و بە ناکامی کۆتایی دێت، خوداداد یان دەکوژرێ یان ماندوویی و شەکەتی گیانی لێ دەسەنێت، نەخۆشیشە".

قسەکانی ئەو کیژە پاکیزەیە چۆن کارم لێ ناکات؟ دەسبەرداری تەواوی ڕابواردن و خۆشییەکانی پاریس بووم و هاتمەوە بۆ تاران و باش دەمزانی چ بەدبەختییەك لێرە چاوەڕێمە. بەڵام کاتێك ئەوم ناسی، هەر لە مانگی یەکەمدا، لە بەیەکەوە چوونەکانمانا بۆ سینەما و پیاسە و گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ڕابردووی خۆم لە پاریسدا، ڕاستییەکی گەورەترم بۆ ڕوون بۆوە. ڕۆح و جەستەم داوای شتێکی دیکەی دەکرد. لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا کە لە پاریس بووم تاقە جارێك چییە پیاوێکم نەناسی خۆشم بوێت، تاقە جارێك چییە ڕۆحی شەکەتم ئامادە نەبوو تکا لە پیاوێك بکات..

"ڕاستە من خەڵکی وڵاتەکەی خۆمم خۆش نەدەویست، هاوڕێیەتیانم نەدەکرد، لای من فزە سوڵتان نموونەی خەڵکی نیشتمانەکەم بوو. هێندە بەس بوو من لێو هەڵبێنمەوە و ئەو وەکو سەگێکی ماڵی بکەوێتە کلکەلەقێ. گەرچی ئەمە هەستی من بوو، بەڵام کە یەکێکی وەکو مامۆستام دەبینی، هەموو شتێکی خۆی، تەنانەت هونەرەکەشی کردبووە قوربانی ئەو خەڵکە بەدبەخت و بەسزمانە، لەم ڕووەوە دەبووە جێی ڕێز و ستایشم. چۆن دەمتوانی ئەم پیاوە شەنگ و ئازموودە و عەزابدیدەیە بەو منداڵە وردکە ئێرانییانەی پاریس بەراورد بکەم؟ هەستە درۆکانی ئەوان منی بریندار دەکرد، هەموویان حەزیان بە گۆشتی لەشی من دەکرد، لە کاتێکدا من حەزم دەکرد ڕۆحی خۆم شاباش بکەم. دەمویست لەشم بە کەسێك ببەخشم کە ڕۆحم ئەسیر دەکات. حەزمدەکرد ئەوەی تینوویم لە ڕێی کێشمەکێشەوە چنگم بکەوێت، نەك یەکێك بێت و تکام لێ بکات. بەڵام لێرە.. لە تاران لەبەردەم ئەم پیاوە بەهرەمەندەدا، ئەم پیاوە ستەمدیدە سەرسەختەدا کە هونەرەکەی دەکردە قوربانی مرۆڤایەتی.. ئاخ، من چی دەڵێم؟ ئاخ.. چەند حەز دەکەم ئیوە لەو شتانە حالی بکەم کە ناتوانم بە قسە دەریانبڕم.

"وا نەزانن من هەر لە یەکەم نیگاوە عاشقی ئەو بووم. نە.. هەرگیز وانییە. نە عاشقی بووم و نە رقیشم لیی بۆوە. بەلأم ئەم پیاوە لە بوونمدا ئاسەواری خۆی جیهیشتبوو. ئاگریکی لەنیو دلمدا هەلکردبوو کە بەردەوام دەروونمی دەخوارد و دەیسووتانم.. چۆن چۆنی بیلیم؟ رەنگە لیم تیبگەن. لەوانەیە ئەو کینەیەی کە لە یەکەم چاوپیکەوتندا لە خانووەکەی شەقامی لالەزار لە ناخی دلمدا رۆنیشت، هەر ئەو کینەیە وەکو ئاویکی پەنهانی ژیر پووشیك، بەبیئەوەی من بەخۆم بزانم دژ بەو راپیپچابم، بەلأم چ ئەو شەوە ی سینەماکە وچ شەوانی دواتریش من سەرنجی ئەمەم نەدابوو.

بە کورتی ئەم پیاوە کەسیتییەکی پتەوی هەبوو، یان دەبوایە خۆشت بویستایە و یان پیتەوە بدایە. ئەم پیاوە لە ئاستی مندا نەبوو، منیش حەزمدەکرد لەگەلیدا بکەومە کیشمەکیشەوە.

"کاتیك ئەوەندەی نەمابوو فیلمەکە تەواو بیت و قسەکانمان بینە کۆتایی، لیم پرسی: "ئیوە دەلین نابیّ زۆر یەکتر ببینین،.. مەبەستتان چییە؟". وتی: "سەرەتا وا باشە یەکتر زۆر نەبینین". وتم: "ئاخر کارم هەیە لەگەلتاندا، ئیوە هیچ دەستووریکتان پیّ نەداوم، من نەهاتوومەتەوە تا بیکار و بەرەلأ بم. زۆر یانی چی؟ یانی من کەی ئیوە ببینمەوە؟" وتی: "سیّ چوار هەفتەیەك سەبر دەکەین" پرسیم: "ئەی چۆن وەلأمم لیّ دەگیرنەوە؟" وتی: "دوایی قسەی لیّ دەکەین". وتم: "دەبیّ ئیستا قسەی لیّ بکەین".

"لە تاریکییەکەدا تەماشایەکی چاوەکانی کردم. ئینجا وتی: "ئەم سووربوونەوەت لەچییە، کچیّ؟" پیکەنی.. ئەم قسەیەیم زۆر پیّ خۆش بوو، وتم: "حەز دەکەم زیاتر بتانبینم". پرسیی: "تەلەفۆنتان هەیە؟" ئەو ژمارەی تەلەفۆنەکەی خۆی دامیّ و منیش ژمارەی تەلەفۆنەکەی مالەوەمانم پیّی دا. ئەو ژمارەکەی منی نووسی، بەلأم من پیویستم بە نووسینی نەبوو، ژمارەی تەلەفۆنەکەیم هەرگیز لە یاد ناچیتەوە.

"پرسیم: "ئەگەر کارێکی پێویستم هەبوو، تەلەفۆنتان بۆ بکەم؟" وتی: "گەر کارەکە زۆر پەلە و پێویست بوو، بەڵێ" سەیرم کرد لەم ڕێیەوە بێهودەیە، لە ڕێیەکی ترەوە بۆی چووم. وتم: "من هەر ئەمشەو دەبێ شتێکی گرنگتان پێ ڕابگەیەنم، چونکە ئێوە لە تاراندا تاقە هاوڕێی منن و گەر ئیجازە بفەرموون ئەو ڕێزەم پێ ببەخشن، تاقە هاوڕێی مەحرەمی منن. بۆیە من دەبێ لە هەموو کارەکانی خۆمدا ڕاوێژتان پێ بکەم، چونکە من کەسێکی وەها شك نابەم، باوکم ئینسانێکی باشە. دایکیشم هەروەها. بەڵام ڕاستییەکەی تەنگیان پێ هەڵچنیوم و دەیانەوێت بەهەر نرخێك بێت من بە شوو بدەن" مێش میوانی نەبوو. وتی: "خێری پێوە بێت".

"ڕقم لەو ساردی و بێباکییەی بۆوە، نەك لەبەرئەوەی بایەخ بە مەسەلەی شووکردنی من نادات، بەڵکو لەبەرئەوەی بەلای منەوە لە میانی ئەم بایەخنەدانەی بە شووکردنی منەوە وا دەردەکەوێت کە بایەخ بە چارەنووس و پێشکەوتنی بزووتنەوەکەش نەدات. وەڵامم نەدایەوە، کەمێك بێدەنگ بوو، ئینجا وتی: "ڕەنگە بۆ تۆ وا باشتر بێت". پرسیم: "بۆ ئێمە چۆن باشتر بێت؟" وتی: "کیژێکی وەکو ئێوە دەتوانێت لەو کارە پڕ مەترسییەی ئێمەدا ڕۆڵێکی سوودمەندی هەبێت، بەڵام لەم ڕێگەیەدا ڕاڕایی مرۆڤ ناگەیەنێتە ئەنجام". وتم: منیش نامەوێ ڕاڕا بم، بۆیە دەمەوێ زیاتر بتانبینم". ئینجا نەرم بوو و وتی: "هەر کاتێك ویستتان دەتوانن تەلەفۆنم بۆ بکەن".

"ئەو شەوە پێکەوە زۆر قسەمان کرد، دەربارەی هەموو شتێك دواین، تەنها ئەو شتە نەبێت کە من تامەزرۆی بووم. دەمویست دەربارەی ئەو کارانەی بدوێم کە بە دەستییەوەن، بەڵام دەمزانی کە پێی خۆش نابێت. بیستبووم کە خەڵکی لەم جۆرە پرسیارەیان زۆر لێ کردووە و ئەویش یا بە گاڵتەوە و یان بە ژێرلێوەوە وەڵامی داونەتەوە، لە کاتێکدا من دوای ئەو شتانەی لە ستیڤانۆ و خوداداد بیستبووم، هەر بە ڕاستی دلم بۆ بینینی کارەکانی باڵەفریی دەکرد.

"جارێکی تریش تێهەڵچوومەوە: "چۆنە ئەگەر بێم بۆ قوتابخانە و تابلۆکانتان ببینم؟ چونکە من خۆشم خەریکی خوێندنی نیگارکێشان بووم". وتی: "دەزانم. لەگەڵ ئەوەشدا وا به چاك دەزانم تا دوو سێ هەفتە لەگەڵمدا نەبینرێیت". وتم: "ئێوە زۆر سڵ دەکەنەوە". وتی: "پێویستە وا بێت. دەبێ ئێوەش وابن".

"ئەو شەوە نەمزانی لەو یەکەم دیدارەماندا چ وێنەیەکی سەبارەت بە من لادروست بووبوو. بە ئێوەم وت کە ئەم کابرایە توێژێك لە خۆپاراستن وخۆ خواردنەوەی بەسەردەموچاوی خۆیدا دابوو و تا ئەو توێژەش نەتوایەتەوە کەس نەیدەتوانی ئاوێنەی سافی ڕۆحی ئەو ببینێت. هەندێ جار وام هەستدەکرد کە ئەم کابرایە ترسنۆکە و نەدەبوایە ئەوەندە سڵی بکردایەتەوە.. ئەو لە کارەکەیدا پێویستی بەو سڵکردنەوەیە هەبوو، بەڵام من لە پێناوی خۆشەویستییەکەمدا پێویستم بە هەڵپەو پەلەکردن هەبوو.

"تەنها جارێك لە ژیانمدا توانیم ئەو چینە ساردە پتەوەی دەموچاوی بشکێنمو پەردە لەسەر ڕووی هەڵماڵم.. ئەو شەوە.. ئەو شەوەی کەنار ڕووباری کەرەج، ئای.. چیی پێ دەوتم! سڵی لە چاوەکانم دەکردەوە. دەیوت گوایە من وا تەماشام کردووە وەك ئەوەی بمەوێ سیحری لێ بکەم و خەوی لێ بخەم.

کە برۆیەکی بەرز دەکردەوە و خەتێك لە سەروو چاوە بادامییەکانییەوە، لە ناوچەوانیدا دروست دەبوو، دەموچاوی حاڵەتێکی سەیری بەخۆوە دەگرت! چاوەکانی دڵڕفێن خۆیان دەنواند، وا دەهاتە پێشچاو خاوەنی ئەو چاوانە خۆی بەدەست شتێکەوە ئازار دەچێژێت. نەیدەتوانی لە چاوی من ڕابمێنێت. بەڵام کاتێك لە تاریکیی سینەماکەدا ناکاو ئاوڕم لێ دەدایەوە، دەمبینی تەماشام دەکات.

"زۆر حەز دەکەم باسی ئەو یەکەم شەوەی سینەماکە بکەم، بەڵام هیچی وام نایەتەوە یاد.. نەك هەر هیچم نایەتەوە یاد، چونکە وردو درشتی ئەو چاوپێکەوتنە بۆ هەتاهەتایە لە یادمدا دەمێنێتەوە، ئێوە لە قسەکانمدا هەست بەوە دەکەن زۆر لەو شتانەی ئەو شەوە لای من دروست بوون، ئەو خۆی ئاماژەی

بۆ کردوون. ئەم تابلۆیەی کە کێشاویەتی، گەر ڕاستتان بوێت، دەموچاوی من لەو شەوی یەکەمەدا لە تاریکیی سینەماکەدا پیشاندەدات. هێشتا بە تەواوی پەی بە حەقیقەتی چاوەکانم و زمانی چاوەکانم نەبردووە. شتێك لە تاریکییەکەدا ون و پەنهانە. من خۆم بە زۆری پرچەکانم کۆدەکردەوە و لە پشتی سەرمەوە دەمبەست. بەڵام ئەو شەوە پرچم نەبەستبوو و چین چین بەسەر شانمدا هێنابوومە خوارەوە. پرچم چواردەوری دەموچاومی دابوو. تەماشا بکەن، جگە لە چاوەکانم ئیدی لێو و دەم و ڕوومەت و چەناگە و لووت و نێوچەوانم لە تاریکییەکەدا ونە و هیچ کوێی ملم بە دەرەوە نییە، چاوەکانیشم ئەو خۆی چۆنی ویستووە ئاوا پیشانیداون و ئەمەشە ئازاری من دەدات.

"ئەو شەوە دونیایەکی دیکەم هەبوو، بە کەیف و شادییەکەوە لە ماڵەوە گاڵتەم لەگەڵ باوکمدا کرد کە بە لایانەوە سەیر بوو. بە پێچەوانەی شەوانی ترەوە کە دەچوومە هەیوان و لەبەر تیشکی چرایەکدا دەمخوێندەوە، ئەو شەوە چوومە ژوورەکەی باوکم و لایەوە دانیشتم و پێکێك قۆدگام خواردەوە. ئیتر کە تۆزێك بادە دەخۆمەوە ئەو حاڵەتەی کە تێیدام لام قووڵتر دەکات، پتر دەبینم، پتر چێژی شتەکان دەکەم، زیاتر هەست بە ئازار دەکەم و لەزەت زیاتر ڕۆحم پێ دەبەخشێت.

"درەنگانێ چووم بۆ ژووری نووستنەکەم، تاوێك گوێم لە گرامەکەم گرت و بە ژوورەکەما هاتم و چووم، کات یەکی نیوەشەو بوو، دەرگای ژوورەکە کرایەوە و باوکم بە ڕۆبە شەرابییەکەیەوە خۆی کرد بە ژووردا و هاتە لام و پرسیی: "بۆچی ناخەویت؟" وتم: "خەوم نایەت" پرسیی: "بۆچی؟" سەرم خستە سەر شانی باوکم و دەستم کرد بە گریان و وتم: "نازانم".

چ باوکێکی میهرەبان و تێگەیشتووم هەبوو. دەستی بەسەر قژمدا هێنا، بەڵام من زۆر بواریم نەدا، لە ژوورەکەم دەرمکرد و وتم: "بڕۆن، ئێستا دەخەوم" جارێکی دی، لەوانەیە دواجار بووبێت، حەسرەتێکی زۆرم خوارد کە بریا نیگارکیش بوومایە و، کاشکی دەمتوانی ئاسوودە بم.

"چەند رۆژێك نەمبینی و سات بە ساتی ئەو رۆژانە بە دوا بیانوویەکدا دەگەرام تا تەلەفۆنی بۆ بکەم، هەموو عەسریك دەچووم و دەورو خولی قوتابخانەکەیم دەدا، بەو ئومیدەی بەلکو ببینم. دەچووم بۆ لای مالەکەیەوە، بە هۆی تەلەفۆنەوە هەوالیم لە ئاغا رەجەبی نۆکەری دەپرسی. کاتیك دەمزانی لە مالەوە نییە تەلەفۆنم بۆ ئاغا رەجەب دەکرد و ئەحوالیم دەپرسی. تەنانەت جاریکیان خۆم پێ نەگیرا و وتم "پیی بلین فەرەنگیس تەلەفۆنی کردووە". هەر بەو ئومیدەی ئەویش هیچ نەبیت تەلەفۆنیکم بۆ بکات.

"ئاخرییەکەی ئەو بیانووە خۆی لە خۆیەوە پەیدابوو. نامەیەکم لە میهربانووەوە پیگەیشت، بۆی نوسیبووم کە خوداداد زۆر نەخۆشە و لە خەستەخانە خەواندوویانە و چەند قوتابییەکی هاوریی پیتاکیان بۆ کۆکردووەتەوە و تا ئیستا بەشی کردووە، بەلام ئیتر هیچیان بە دەستەوە نەماوە. جگە لەوە، میهربانوو خۆشی ناتوانی زۆر سەردانی بکات چونکە سیخورەکانی بالیۆزخانە گەر زۆر لە خەستەخانە بیبینن، بیگومان خەرجییەکەی دەبرن و ئەو تۆزە یارمەتییەشی نامینیت. خوداداد خۆشی حەز ناکات زۆر سەری لیبدەن و دەلیت ئەوەندەی پیناچیت لە خەستەخانە دەریدەکەن. پزیشکەکان ئەوەندەی خۆی گەش بین نین. میهربانوو داوای لێکردبووم کە من یەکسەر مامۆستا ببینم و داوای یارمەتیی لێ بکەم. بەڵکو سەرباری ئەو بارودۆخە ناهەموارەش بتوانێت خەرجیی خوێندنەکەی بۆ دابین بکاتەوە.

"تەلەفۆنم بۆ مامۆستا کرد و داوام لێکرد کە پێویستە بۆ کارێکی زۆر پێویست سەعات حەوت و نیو لە سینەمای قەسر ببینم. ئاماژەم بۆ ئەوە کرد کە نامەیەك لە خودادادەوە هاتووە و هەر دەبێ ببینم.. ئەویش یەکسەر قایل بوو و شەو لە بەردەمی سینەماکەدا چاوم پێکەوت. دەموچاوی گرژ بوو، دەتوت وا هەست دەکات داواکەم بێ بنچینەیە. کاتێك نامەکەم دایە؛ وتی "چیی نووسیوە؟ من ناتوانم ئێستا بیخوێنمەوە". پوختەی نامەکەم تێگەیاند. ئینجا ئەو وتی: "خەرجیی خوێندنی نادەنێ. دیارە نامەکە بە دزیی خودادادەوە نووسراوە و

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە حاڵی باش نییە". وتم: "بەهەرحاڵ خۆ دەبێت شتێکی بۆ بکەین". وتی: "دەبێ شتێك پارەی بۆ کۆبکەینەوە و بۆی بنێرین". پرسیم: "دەتانەوێ چەندی بۆ بنێرن؟" وتی "هەوڵ دەدەم تا چەند ڕۆژێکی تر، ئەوپەڕی تا هەفتەیەکی تر، دوو سەد سێ سەد تمەنێکی بۆ کۆبکەمەوە و بۆی بنێرم" وتم: "من سبەینێ سێ سەد تمەنی بۆ دەنێرم و دوایی ئێوە بیدەنەوە بە من". پرسیی: "لە کوێ پەیدای دەکەی؟" وتم: "لە باوکمی دەسەنم". "هەردووکمان قۆڵمان خستبووە سەر قەراغی کورسییەکە و سەرمان لە یەك نزیك کردبۆوە تا بە نزمی قسە بکەین. بە سەرسوڕمانێکەوە سەیرێکی کردم و وتی: "تۆ کچێکی باشیت". ئەم قسەیەی زۆر دڵشادی کردم. قۆڵم بە قۆڵییەوە نووساند، ئەویش دەستی خستە سەر دەستم و توند گوشیی. منیش بە هەردوو دەستم دەستیم گرت و بە ڕادەیەك ویستم چێژی گەرمییەکەی بکەم کە دەتوت ئەوە یەکەم بەختەوەرییە لە ئەنجامی کێشمەکێشمەوە لەگەڵیدا وەچنگم بێت. چاوەکانی گەورەتر خۆیان نواند. بەڵام ناگەهان خۆی کشاندەوە، گوشاری دەستی خاوبۆوە و دەتگوت پەنجەکانی سارد بوونەتەوە. ئەمەم پێ ناخۆش بوو. منیش دەستم لەسەر قەراغی کورسییەکە لابرد و ئیدی پێکەوە نەدواین و ئەو شەوە دەستمان بە تەماشاکردنی فیلمەکە کرد. فیلمەکە فیلمێکی مۆسیقائامێز بوو.

"دوو سێ مانگ ژیانمان بەمجۆرە تێپەڕی. هەفتەی جارێك یان زیاتر دەمبینی. ئەو ڕۆژانەی کە ئومێدی بینینیم نەبوو؛ ئۆقرەم لێ دەبڕا. نەمدەزانی چۆن کات بەسەر بەرم. هەمیشە چاوەڕوانی بینینی بووم. لەو شەقامانەدا کە هەرگیز پیایاندا نەدەڕۆیشت، لەو کاتانەدا کە سوور دەمزانی سەرقاڵی کارە، لەو ماڵانەدا کە ئەسڵەن خاوەنەکانیانی نەدەناسی، هەمیشە چاو لەڕێی بووم و لە خەیاڵی خۆمدا بیرم لە شتی وا ئەستەم دەکردەوە کە ئەنجامەکەی بە دیداری ئەو کۆتایی دیت.

"لە کاتیکدا کە هەر لە دووەم مانگەوە کۆمەلیك کاری زۆری پی سپاردم؛ بە شەوقەوەو و بیباکانە ئەنجامم دەدان. پیی راگەیاندم کە دەبێ خۆم فیری چاپ بکەم. ئاخ، ئەم چاپە چەند کاریکی ماندووکەرە. کوشندەیە. بەلاّم من فیر بووم. سێ هەفتەی تەواو رۆژی حەوت سەعات کارم کرد. من گومانم لەو هەول و توانایەی خۆم هەبوو؛ بەلاّم ئەمە تاقە ریگایەك بوو لە ژیاندا لە بەردەممدا مابووەوە. کاتیك ئیشیکی پێ دەسپاردم و ئەنجامم دەدا، دەمبینی بەوە خۆشحالە؛ ئەو خۆشخالییەی ئەو دەبووە مایەی ژیانم و پتر هانی دەدام.

"وەختیك فیری چاپکردن بووم، نامەیەکی دامێ و داوای لێ کردم پینج سەد دانەی لەبەر دەربهینمەوە. ئەو رۆژەی ویستی نامەکەم بداتێ؛ لە سینەما یەکترمان

بینی. پێی وتم: "دەمەوێ نامەیەکتان بدەمێ کە پێنج سەد دانەی بە چاپ دەربهێننەوە" وتم: "چەند خۆشحالم بەوەی کارم پێ دەسپێرن". وتی: "دەزانن کارەکە چەند خەتەرناکە؟" وتم: چاپکردن چ مەترسییەکی هەیە؟" وتی: "ئەم نامەیە بڵاودەکرێتەوە و گەر بزانن ئێوە چاپتان کردووە دەتانگرن و ئەوسا بارەکە زۆر خراپ دەبێت". وتم: "ئامادەم، بمدەنێ.. هەر ئێستا بمدەنێ". وتی: "پێم نییە". پرسیم: "واتاندەزانی من کارەکە بەجێناهێنم و داواکەتان رەتدەکەمەوە؟" وتی: "نەء؛ دەمزانی کە بەجێیدەهێنن؛ بەڵام حەزمکرد لە مەترسییەکەی ئاگادارتان بکەمەوە".

قەرار بوو ئەو شەوە کەسێك نامەکەم بۆ بهێنێت بۆ ماڵەوە. ناوەرۆکەکەیم باش لەبیرە. شا دەیویست نزیك "تنکابن" ئەو زەویوزارانە بکڕێت کە هەندێکیان موڵکی هەندێ موڵکداری بچووك بوون. کارمەندانی دائیرەی زەویوزار ڕژابوونە ئەوێ و بە زۆر خەڵکیان دەبرد بۆ مەحزەر و ئیمزایان پێ دەکردن. هەندێك لەو لادێییانە بەر لەوەی نۆرەیان بێت، شەو لە تنکابن هەڵدێن بۆ تاران؛ بۆ لای یەکێك لەو قازییە خاوەن پلە بەرزانەی کە هاوزێدی ئەوانە و خۆشی چەند سەد دۆنم زەویی لەوێ هەیە. قازییش چاری نابێت جگە لەوەی لەدەست کارمەندانی زەویوزار لای شا شکات بکات. جا ئەم نامەیە کە نزیکەی پەنجا دێڕێك بوو؛ نازانم چۆن گەیشتبووە دەستی مامۆستا. من پێنج سەد دانەم لەم نامەیە چاپ کرد و، بەپێی بڕیارەکە سەعات دەی شەو، کاتێك ماڵەوە هەموو نووستبوون، پیاوێك کە تەنانەت نەمتوانی دەموچاویشی ببینم، چەند جارێك بە سەری پەنجەی کێشای بە شووشەی پەنجەرەکەمدا، منیش بەستەی نامەکانم دایێ و ڕۆیشت. دوای چەند ڕۆژێك یەکێك لەو نامانە بە باوکم گەیشت. باوکم کە گومانی لە خۆفێرکردنی چاپەکەی من کردبوو؛ دوای ئەوە بە دوو سێ ڕۆژ؛ شەوێکیان نامەکەی پیشاندام و وتی: "بینیت دوێنێ چی لە پۆستەکەدا بوو؟" وتم: "نەخێر.. ئاغا گیان، چییە حەز دەکەم بزانم؟" وتی: "هەر ئێستا".

"کاتێك بۆ ژووری خەوتنەکەم چووم، باوکم بە دوامدا هات. دەرگاکەی کردەوە و وتی: "پێویست ناکات بیخوێنیتەوە، چونکە تۆ خۆت چاپت کردووە". وەڵامم نەدایەوە. چونکە نکووڵی کردن بێهودە بوو. ئینجا وتی: "کچی خۆم یاری بە ئاگر مەکە و ئابڕووم بە با مەدە. ئێرە فەرەنسا نییە، ئەمە کێیە تۆی لەم بەزمەوە گلاندووە؟" وتم: "هیچ کەس، ئاغا گیان، بەڵام ئابڕووی ئێوە بەم کارانە ناڕوات، بەڵکو زیاتر دەبێت". وتی: "کەیفی خۆتە، بەڵام من ئەوەندەت پێ دەڵێم ئەم کارە ئەنجامەکەی باش نابێت. لە پێرێوە کە ئەم نامەیە بڵاوکراوەتەوە تا ئێستا نزیکەی سێسەد کەسیان لە تاراندا گرتووە. هەر لەسەر ئەم نامەیە وەزیری پۆست و تیلیگرافیان گۆڕی. شا ئیهانەی کردووە و وتوویەتی: "بڕۆرەوە و بۆ خۆت لەماڵەوە بنوو". واتەوات هەیە گوایە سەرۆکی ئاسایشیش بگۆڕن. گەر بزانن لەم ماڵەی ئێمەدا ئامێری چاپ هەیە؛ تا سبەینێ ئەم خانووە تەخت دەکەن. ئەمانەی دەیڵێم زیادەوی نییە. بەرلەوەی بۆ ژوورەکەشت بێم؛ چاپەکەم وردوخاش کرد و فڕێمدایە چاڵێکی ئاوی عەمبارەکەوە تا هیچ ئاسەوارێکی نەمێنێت".

سەرەتا بە ترس و شڵەژانەوە گوێم بۆ قسەکانی باوکم شلکرد.. بەڵام هەر کە باسی شکاندنی ئامێری چاپەکەی کرد، ئیدی ئاگام لە خۆم نەما. دەموچاوم سوور هەڵگەڕا. دڵم گوشرا. تێکچووم و بۆ یەکەم جار لە هەموو ژیانمدا گشت ئەندامەکانی لەشم گرژ بوون. وەختێك چاوم کردەوە، سەیر ئەکەم باوکم لە ژوورەکەمدا نەماوە و دایکم لامەوە دانیشتووە و بۆنی ڤالێریانە لە ژوورەکەدا بڵاوبووەتەوە. من بەردەوام ئەعسابم لاواز بووە. هەمیشە حەساسیەتێکی نائاسایی ئازاری داوم. بەڵام ئەو شەوە یەکەمجار بوو ئەو حاڵەتە بەو توندییە شاڵاوم بۆ بهێنێت.

"سەرلەبەیانیی ڕۆژی دوایی کاتێك باوکم خۆی ئامادە کردبوو تا لە ماڵەوە بچێتە دەرێ؛ بەگێرم هێنا و پێم وت: "ئاغا گیان، ئامێری چاپەکەتان چی لێکردووە؟" وەڵامی دایەوە: "پێم وتیت فڕێمدایە ئاوی عەمبارەکەوە". وتم: "ئاغا

گیان، بۆ پاراستنی ئابڕووی ئێوە من هەر ئێستا دەچم و بە پارەی خۆم ئامێرێکی چاپی دی دەکڕم، بەڵام دەبێ ئەوە بزانن کە من کچێکی گەورەم، ئەگەر دەتانەوێ ژیانم لێ تێکبدەن و لە کاروبارەکانمدا سەربەست نەبم؛ ئەوا هەر لەمڕۆ زووتر نییە ماڵەوە جێدەهێڵم".

باوکم بە ترسەوە تەماشایەکی کردم. هیچی نەوت و چووە دەرێ. یەکسەر تەلەفۆنم بۆ ماکان کرد و وەختێکمان بۆ یەکتربینین دیاری کرد. بڕیار درا شەو، هەر لە هەمان شوێنی جاران، لە بەردەمی سینەماکەدا چاومان بە یەکتر بکەوێت. "بەزمی شەوی ڕابردووم بۆ گێڕایەوە. هەرچییەك لە نێوان من و باوکمدا ڕوویدابوو بەدرێژی بۆم باس کرد. ئامارژەم بۆ ئەوە کرد کە نامەوێ لەو ماڵەدا بمێنم و ناشزانم چارەنووسم بەچی دەگات. لە ناخی دڵەوە ئاواتەخواز بووم کە ئەگەر مامۆستا ڕووی چوونە ماڵەکەی خۆیم لێ نەنێت؛ ئەوا هیچ نەبێت قایل بێت بەوەی خانوویەك بۆ خۆم بگرم و لەوێ بتوانم جارجار بە تەنیا ببینم و هەر خۆم و خۆی بین. پێم وت باوکم بێئەندازە منی خۆشدەوێت و تەنانەت گەر لێشیان زویر بم و ماڵەوەش جێ بهێڵم؛ هەر ئامادەیە خەرجیی ژیانێکی ئابڕوومەندانەم بۆ دابین بکات. بەڵام مامۆستا سەری ڕاوەشاند و وتی: "نەء، بە پێچەوانەوە، ئێستا ڕوون بۆوە کە ماڵی ئێوە نەك بە تەنها پەناگەیەکی باشە بۆ تۆ بەڵکو بۆ ئێمەش، من ئێستا پتر دڵنیاییم پەیدا کرد. ئێستا ئەو لە نهێنییەکەی تۆدا بەشدارە. بێگومان دەترسێت. هەموو دەترسین. هەندێك کەمتر و هەندێك زیاتر. بەڵام دەبێ تۆ وردە وردە ئەو بەلای خۆتدا ڕابکێشیت. باوکی تۆش هەر یەکێکە لەو کەسانەی کە زەوییەکانی مازندەرانی لەدەست چووە و ئەوەی ئێستا لە تاران هەیەتی پێنج یەکی داراییەکەی جارانیشی نابێت. کەواتە ئەو خۆی لە دڵەوە هاوڕێگای ئێمەیە. تۆش پێویستە هەر لەو ماڵەوە بمێنیتەوە و لەگەڵ باوکیشتا گەرمتر بیت و کارەکانیشت لە خانوویەکی تردا ئەنجام بدەی کە دوایی پیشانتی دەدەم. باوکت کابرایەکی سوودبەخشە.."

"چەند ڕۆژێك دوای ئەوە، نیوەڕۆیەکیان سەعات دوو، کابرایەك کە جلوبەرگی کاسپیی پۆشیبوو، هات بۆ لام و نامەیەکی لەوەوە پێبوو و پێکەوە چووین بۆ خانوویەکی دەرەوەی شار و لەوێ بردمییە ژوورێکی بچووك کە دەرگا و پەنجەرەکانی بە پەڕۆ و پاتاڵ گیرابوون و مێزێکی بچووکی تێدابوو؛ ئامێرێکی چاپی بچووکی لەسەر دانرابوو. کابرای کاسبکار بە منی وت: "جگە لە من کەسی تر لەم خانووەدا نییە، لە پشت دەرگاکەوە دادەنیشم، کاتێ کارەکەتان تەواوبوو بانگم بکەن تا بتانگەیەنمەوە ماڵەوە. وتم: "هیچ کارێك هەیە تا ئەنجامی بدەم؟" وتی: "سەری چاپەکە هەلگرن؛ لە ژێریدا کاغەزێکتان بۆ دانراوە تا چاپی بکەن".

"ئێستا یادم نییە ئەو نامەیە چی بوو. وابزانم زۆر گرنگ نەبوو. بەڵام لە ڕوانگەی ململانێوە لەگەل دائیرەی ئاسایشدا گرنگ بوو. چونکە ژمارەیەکی زۆر گیرابوون و دەبوایە نامەیەکی تر بڵاوبکرێتەوە تا پیاوانی ئاسایش گومان لە گرتنی ئەو گیراوانە بکەن. دوو سێ سەعات دانیشتم و خەریکی کار بووم. کاتێك شەکەت و ماندوو بووم؛ نامەیەکی دامێ کە مامۆستا بۆی نووسیبووم. نووسیبووی کە تا چەند ڕۆژێك نابێ تەنانەت تەلەفۆنیشی بۆ بکەم. ئەم نامەیە ئەوەندەی تر ماندووی کردم. هێندەی نەمابوو لە هۆش خۆم بچم. پێم نا بە جەرگی خۆمدا و هەولمدا بەسەر خۆمدا زال بم تا تووشی ئەو حالەتەی پێشوو نەبمەوە. ویستم بە قسەی نەکەم و بەیانیی ڕۆژی داهاتوو ڕێك بچم بۆ قوتابخانەکەی و پێی بلیم تەواو ئیتر سەبرم براو وئارامم نەما. ئێوە نازانن کاتێك پێی دەوتم کە نابێ بیبینم؛ چ ترسێك دایدەگرتم. ئەو هێز و توانای پێ دەبەخشیم. من کە لەگەلیدا دەبووم بە ڕوالەت خۆم بە نەترس لە قەلەم دەدا. بەڵام لە ڕاستیدا ئەو سەرچاوەی هێزی من بوو. لەو شوێنەدا کە نامەکەم تیا خوێندەوە؛ یەکسەر برستم لی براو هەر لە جێی خۆمدا لەسەر پلیکانەیەك دانیشتم. بە کابرا کاسبکارەکەم وت: "دەتوانن پەرداخێك ئاوم بۆ بهێنن" وتی: "نەخێر، چونکە ئێرە ئاوی لی نییە". پرسیم: "ئەی باشە بۆ لە پێشدا ئەم نامەیەت نەدامێ؟" وتی: "ئاغا فەرمووی کەی لە کارەکە تەواو بوون و بۆ ماڵەوە

ڕۆیشتنەوە ئەوسا نامەکەتان بدەمێ.." "خەیال بردمییەوە. ئایا دەزانیت کە من چەند ماندوو دەبم لەهەر کاریکدا کە پیمی دەسپیریت؟ ئەی باشە بۆچی نەیویستووە بەر لە دەستپیکردنی کارەکە نامەکە بخوینمەوە؟ دیارە بە تەواوەتی دلنیایە لەوەی من تا چ رادەیەك گیرۆدەی ئەو بووم. دەیزانی کە رەنگە لە نائومیدیدا نەتوانم کارەکە باش ئەنجام بدەم.. ئەمەی دەزانی. تازە من خۆم لەدەست دابوو. تازە من تیا چووبووم. ئیستا ئەو بەسەر مندا زالە..

کوتوپڕ ئافرەتە نەناسەکە خۆی لەو دونیا رابوردووە وەدەرنا. سەیریکی منی کرد کە تەواوی دیمەنەکانم بە ڕوونی هابتووە بەرچاو و وتی: "بە ڕاست.. دەزانن ئەو کاسبکارەی کە منی بۆ ئەو خانووە برد کێ بوو؟" وتم: "نەخێر".

–ئاغا ڕەجەب بوو، ئەوەش یەکەم جار بوو چاوم پێی بکەوێت.

سەرم سووڕما و بە پێچەوانەی بڕیارەکەمەوە، قسەم بە ئافرەتە نەناسەکە بڕی، پرسیم: "ئاغا ڕەجەب، نۆکەرەکەی؟"

–بەڵێ، ئاغا ڕەجەب.. فەڕاشی قوتابخانەکەتان.

–یانی ئەو تەواو ئاگای لە پەیوەندیی نێوان ئێوە و مامۆستا و کارەکەتان بووە و کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لێوی هەڵنەهێنایەوە؟ من چەندم لێکرد فزەی نەکرد.

–ئێوە نازانن ئەو کابرایە پیاوێکی چەند دڵسۆز و بە ئەمەك بوو. قسەکانی مامۆستا بە لایەوە لە ئاسمانەوە دابەزیبوون. زۆر لە ناخەوە وگیان لەسەر دەستانە؛ ئامادە بوو تەواوی فەرمانەکانی هاوڕێ و ڕابەرەکەی ئەنجامبدات.

–ببوورن؛ قسەم پێ بڕین.

ئافرەتە نەناسەکە درێژەی بە قسەکانی دا: "بڕیارم دا بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە و بەیانیی ڕۆژی داهاتوو یەکسەر بچم بۆ قوتابخانەکەی و پێی بڵێم چی وا لە من دەکات ئەم کارە پڕ مەترسیانە بکەم. بڕیارم دابوو پێی بڵێم کە من ئامادەم هەزاران مەترسی بە گیان و دڵی خۆم بکڕم؛ بەڵام نەك لە پێناوی ئەو شتەدا کە ئەو بیری لێ دەکاتەوە. سەیرم کرد ئیدی ناتوانم لەسەر ئەو بارە بەردەوام بم.

دەمویست خۆم بە دەستەوە بدەم. وا دەهاتە پێشچاوم کە ئیدی ناتوانم ئەو لەسەر ریی ژیانی خۆم لابدەم. هەر ئەوەندە ویستم مالە نهێنییەکە جی بهێلم، ئاغا رەجەب وتی: "جاریکی دیکەش جانتا و گیرفانەکانتان بپشکنن". گەرام و هیچم نەدۆزییەوە، لە دوورەوە دەنگی عەرەبانەیەك هاتە گوێ، ئاغا رەجەب وتی: "با بەرەو لای عەرەبانەکە برۆین. لە پیشدا من دەرۆم. دوای چەند دەقیقەیەك ئیوە وەرنە دەرێ. دەرگاکە باش دابخەن. خۆی دادەخرێ. یەکسەر بە عەرەبانەکە دەتگەیەنمەوە مالەوە".

"کاتیك هاتمەوە مالەوە، فەرتەنە روویدابوو. سەیرم کرد دایکم لەودیو دەرگاکەوە دانیشتووە و چاوەریی منە. فزە سولتانیش عەبا رەشە خالخالەکەی لەبەردایە و لای دایکمەوە هەلکورماوە و چپەچپیانە. ئەم فزە سولتانە هاودەمی دایکم بوو. لە مالی دایکمدا بووە و کاتیکیش دایکم هاتە مالە میردی خۆی؛ ئەویش بوو بە هاودەم و هەمەکارەی. ئەو منی گەورە کردبوو، چونکە کەسیشی لە دونیادا نەبوو، چی خۆشەویستی و سۆزی دلە نەرمەکەی هەیە بە منی دەدا. "هەرکە لە دەرگام دا و فزە سولتان دەرگاکەی کردەوە و چوومە ژوورێ، بە شلەژانەوە وتی: "خوایە شوکر، خوایە سەد هەزار جار شوکر". دایکم نەیهیشت فزە سولتان قسەی تر بکات.

"کە ئەچوویتە حەوشەی خانووەکەمانەوە؛ ژوورەکەی باوکم دەکەوتە دەستە راستەوە. هەتاوی پاش نیوەرۆی پاییز تەواوی حەوشەکەمانی گرتبۆوە. لە پشت پەنجەرەکەوە هەنارە سوور و خرەکان دەدرەوشانەوە. حەوزەکەمان پربوو لە ئاو. بابا باخچەکەی ئاو دەدا. بابا پیرەمیردیك بوو سی سال ئەبوو لە مالی ئیمە کاری دەکرد. باوکم لە ژوورەکەی خۆی؛ لەسەر کورسییەك دانیشتبوو جگەرەی دەکیشا. کابرایەکی پیری قەلەوی ئەسمەریش کە دەموچاوی چرچولۆچ و سەری رووتابۆوە، چوارمشقی دانیشتبوو و کاغەزەکانی هەلگیروداگیر دەکرد. لە دایکم پرسی: "ئەوە کێیە؟ چیی دەوێت؟" دایکم وتی: "لە ئاسایشەوە هاتووە، تەواوی ژوورەکەی باوکتی ژێرەوژوور کردووە". نەمهێشت دایکم قسەکانی تەواو بکات،

یەکسەر چووم بۆ ژوورەکەی باوکم. کارمەندی دائیرەی ئاسایشەکە سەیرێکی کردم و هەڵسا و سڵاوی لێ کردم. وەك کەسێك کە ئاگای لە هیچ نەبێ؛ پرسیم: "ئاغا گیان، چی ڕووی داوە؟" "باوکم وتی: "دەڵێن گوایە چەند ڕۆژێك لەمەوبەر پۆستە کاغەزێکی بۆ ئێرە هێناوە کە من نەمبینیوە. ئێستا هاتوون ئێرە دەپشکنن". دوای تۆزێك بێدەنگی وتی: "وەك ئەوەی کە دەیڵێن. ئەگینا ئیتر نازانم چییان دەوێ. با بگەڕێن". "کابرا قەڵەوە سەر ڕووتاوەکە ڕووی کردە من و لە باوکمی پرسی: "ناوی خانم چییە؟" من وتم: "جا ئێوە بە چ هەقێك ناوی من دەپرسن؟" باوکم هەڵیدایە و وتی "کچم تووڕە مەبە! ئاغا کارمەندە. ئەم هیچی بەدەست نییە، ڕایانسپاردووە و ئەویش هاتووە ئەرکی خۆی بەجێدەهێنێت". پاشان باوکم ڕوویکردە کارمەندی ئاسایشەکە و پێی وت: "ئەمە کچمە" ئینجا ناوی منیشی پێ وت.

"کابرا قەڵەوەکە زۆر ڕەزاقورس بوو، بە سەروسیمایدا دیاربوو کابرایەکی بەدە. بەڵام بە ئەدەبەوە قسەی دەکرد.

_ڕاست دەفەرموون. ئێمە گوناهمان چییە؟ فەڕاشی پۆستە هەواڵی داوە کە نامەیەکی بۆ ئێرە هێناوە. لەو جۆرە نامەردانە زۆرن. ڕەنگە بە هەڵەدا چووبێت. بە پێی ئەو هەواڵانەش جەنابتان بوونەتە جێی گومانی جەنابی خاوەن شکۆ. لە کاتێکدا بەندە ئاگادارە کە جەنابتان لەو کەسانەن کە بە حەز و ویستی خۆتان زەویوزارەکانی مازندەرانتان بە جەنابی شا فرۆشتووە. دیارە کە بەرژەوەندیی وڵاتتان لەبەرچاو بووە. هەموو دەزانن کە موڵکدار وا چاکە موڵکی لە مازندەران نەبێت. لەوانەشە نامەکە بە ناوی ئێوەوە نەبووبێت؛ یان دەشێ خانمی بچکۆلە نامەکەی کردبێتەوە.

پرسیم: "نامەی چی؟ کێ نووسیویەتی؟" کابراکە سیمای دەبەنگێکی هەبوو، دەیویست خۆی گرنگ پیشان بدات. بە چاوە ڕیپۆقاوییەکانییەوە سەیرێکی منی کرد و پیکەنی. بە خەیالی خۆی دەیویست تاقیمبکاتەوە، بەڵام بۆی نەچووە سەر. دەرفەتم نەدا و بە باوکمم وت: "با لە هەموو کەسانی ماڵەوەمان بپرسیت کە

ئایا دوێنێ فەراشی پۆستە نامەی بۆ ئێرە هیناوە یان نەء". من دلنیا بووم لەوەی هەرکام لەوانەی مالەوە، چ دایکم و چ فزە سولتان و دایەنەکەم و بابای پیرەمیرد؛ کە هەریەکەیان بیست سی سالیان لە مالماندا بەسەر بردووە؛ ئاگاداری ژیانی رامیاریی رابردووی باوکم بوون وئەوە بە لایانەوە یەکەم جار نەبوو کە نابێ لەمجۆرە حالەتانەدا لیو هەلبهیننەوە. ئینجا وتم: "پاشان، فەراشی پۆستەش دەتوانیت بلیت کە نامەکەی بە کێ داوە". پیاوەکە وتی: "عەرزم کردن.. لەوانەیە فەراشەکە بە هەلەدا چووبیت. جگە لەوە خۆشی دانی بەوەدا ناوە کە نامەکەی نەداوەتە دەست کەس و لە درزی دەرگاکەوە فرییداوەتە ناو مالەوە. کابرا کە لە هەموو قسەکانیدا ریاو دوورووییی هەست پی دەکرا کەوتە باسکردنی خۆی؛ کە هەر لە کۆنەوە ریزی بنەمالەی ئیمەی گرتووە و یەکپارچە دلی خوینە کە بە هۆی ئەم پشکنینانەوە دەبیتە مایەی ئازاری خەلکانی بەریز. سویندی بە خواو بە عەلی خوارد کە هەزار جار داوای ئیستیقالەی کردووە، بەلام چی بکات دەسبەرداری نابن. باسی ئەوەی کرد کە رۆژیکیان ناچار بووە تەنانەت مالی ژنبراکەشی بپشکنیت. بەلام چی بکات ئەم مەئموورە و مەئمووریش مەعزورە. لە کاتیکدا ئەو باش دلنیا بووە لەوەی کە ژنبراکەی مرۆڤیکی بیوەیە و پیاوی ئەو جۆرە دەردەسەرییانە نییە و سەیر لەوەدایە کە ژنبراکەی داوای کردبوو لە وەزارەتی ناوخۆشدا دابمەزری. بەلام بە چی دەچیت،تازە ژنبراکەشی چاوەریی هەموو جۆرە کاریکی لەو بابەتانەی لی دەکات. بە قسەکانیدا وایپیشاندەدا کە کابرایەکی بیگوناه و بەسزمانە و خۆشی دەزانیت کە بیهوودە خەریکی پشکنینی ئەم مالەیە.

-بەلام ئاخر کەسیك هەیە لەم شارەدا ئەم نامانە دەنووسیت و دەبیتە هۆی ئازار و بەدبەختیی خەلکی و بیگومان پیاوانی ئاسایش هەر دەیاندۆزنەوە. ئەو ئامیری چاپەی کە ئەم نامانەی پی چاپ کراوە ئامیری چاپی کۆنتینانتالە و، ئیستا ژمارە و وینەی تەواوی ئەو ئامیری چاپانەی کە لەم سالانەی دواییدا هاتوونەتە ئیرانەوە لە لامانە و هەر ئەمشەو دەزانرێ ئەو ئامیرە لە چ مالیکدایە.

بە دەم قسەکانییەوە پەڕەی کتێبەکانی هەڵدەدایەوە و هەڵگێڕ و داگێڕی دەکردن. ئاخرییەکەی وتی: "نەخێر هیچ لێرە نییە".

باوکم خەریکبوو کەمێك توندوتیژ دەبوو و وتی: "کەواتە ئێستا چی دەفەرموون؟" کابرا مەسەلەکەی گۆڕی و پرسیی: "ئامێری چاپکردن لەمماڵەدا نییە؟" کە ناوی ئامێری چاپی هێنا ڕەنگ لە ڕوومدا نەما. بەڵام ئەو دەبەنگتر بوو کە لەوە بگات. من هەڵسام و ویستم بچمە دەرێ. تۆزێك پشتم لەو کرد. باوکم وەڵامی دایەوە: "من خۆم کابرایەکی قەدیمەم. خۆم خۆشنووسم و کچەکەشم چەند ساڵێك خۆشنووسیی خوێندووە. لەبەرئەوە چ کارێکمان بە ئامێری چاپ نییە" ساردییەکەی باوکم هۆشی بە بەرمدا هێنایەوە. گەڕامەوە و بە نیگایەکی ئافەرینەوە تەماشایەکم کرد و وتم: "ئاغا گیان.. با هەموو ماڵەکە بگەڕێت". باوکم وتی: "من هیچم نەوتووە، با بگەڕێت". کارمەندی ئاسایشەکە لە منی پرسی: "ئێوە دەزانن چاپ بکەن؟" وتم: "هەموو کەسێك دەزانێت. چاپکردن پێویستی بە فێربوون نییە". پرسیی: "لای کێ خوێندووتە؟" وتم: "نەمخوێندووە. من بە یەك پەنجە دەزانم چاپ بکەم". پرسیی: "لە کوێ کارت لەسەر ئامێری چاپ کردووە؟" وتم: "لە قوتابخانە چاپمان هەبوو، لەوێ کارم دەکرد". وتی: "دەتوانن ئامێری چاپەکەم پیشانبدەن؟" بە توندییەوە وەڵامم دایەوە: "چیتان پیشان بدەم؟ من دە ساڵ دەبێت لەو قوتابخانەیە نەماوم". وتی: "من وتم بەم دواییە". وتم: "کەی ئێوە وتتان بەم دواییە؟".

"ئەو لێپرسینەوەیەی ئەو ڕۆژە، ئەو ساردییەی باوکم کە منی هاندا و، ئەو دڵەڕاوکێیەی دووچاری بووم تا ئاکام بە دوورخستنەوەی باوکم کۆتایی هات.. هەموو ئەم شتانە بەلای منەوە تازە بوون. من ئەو ڕۆژانە تامی ترس و تۆقینی دائیرەی ئاسایشم چەشت و هەموو ساتێك چاوەڕێ بووم بێن و بمگرن. هەرکە لە دەرگا دەدرا من دادەچڵەکیم. سڵم لە سێبەری خۆم دەکردەوە. شەرمم لە نیگا نیگەرانەکانی دایکم دەکرد. بەڵام لە هەموو ئەم ترس و تۆقینە گرنگتر هەستێکی تازە بوو کە دڵ و ڕۆحی منی شاد دەکرد. بە خۆمم دەوت: "ئێستا ئەو بە

چاویکی ترەوە سەیرم دەکات. لە بەرچاویدا گەورە بووم. ئیستا ئەو کچە بچکۆلەیە نیم کە تەنها بەوەوە بەسترابمەوە و خۆم کەسیتیی خۆمم هەیە".

کاتیك کارمەندی ئاسایشەکە رۆیشت، باوکم بێئەوەی هیچ بلیت چووەوە ژوورەکەی خۆی و لەودیو میزەکەیەوە لەسەر کورسییەك دانیشت و کاغەزەکانی سەفتە کردەوە. چەند دەقیقەیەك هەردووکمان بیدەنگ دانشتین و رامایین. دایکم لەو ژوورەی تەنیشتمان؛ لەسەر بەرمالەکەی بوو. تا من بیدەنگییەکەم بری و وتم: "ئاغا گیان!" باوکم بە هیمنی و لەسەرخۆ وەلامی دامەوە: "بهیلە تاویك تەنیا بم و بیر بکەمەوە". وتم "ئاغا گیان حەزمدەکرد هەردووکمان پیکەوە بین و بە یەکەوە بیر بکەینەوە". تۆزیك چاوەریم کرد وەلام بداتەوە. ئینجا بە کورسییەکەوە وەرچەرخا و رووی تی کردم. من هەلسام و چوومە لای و سەریم نا بە سنگمەوە. باوکم دەستی کردە ملم و روومەت و ناوچەوانی ماچ کردم و دلی پر بوو. وتم: "ئاغا گیان من سەرچاوەی ئەم دەردەسەرییانەی ئیوەم". وتی: "نا کچی خۆم.. وا بیر مەکەرەوە. من شانازی بەوەوە دەکەم کە کچیکی وەکو تۆم هەیە". وتم: "ئاخر لە پای چی ئیوە بەرگەی ئەم شتە نابەجییانە بگرن. تەماشاکەن، لەگەل ئیوەدا وا رەفتار دەکەن؛ ئەی دەبێ لەگەل خەلکانی تردا چۆن رەفتار بکەن؟" وتی: "تۆ ئومیدت بە خەلکی زۆرە؟" وتم: "راستتان دەویت، زۆر ئومیدم پییان نییە. بەلام ئەمە تاقە شتیکە کە من بە ژیانەوە دەبەستیتەوە". وتی: "خراپتر! ئەی کێ ئەم نامانە دەنووسیت؟" وتم: "ئەم نهینییەم پێ مەدرکینە، ناتوانم بیلیم". وتی: "تۆ خۆت دەزانیت هەموو بیرکردنەوەیەکی من تۆیت. پیویست ناکات تۆ خەمی من بخۆیت. من هەمووی چەند رۆژیکم ماوە لەم دنیایەدا. بەلام ئەوەی ویستوومە ئەوەیە تۆ بە بەدبەختی نەبینم" وتم: "من ئیستا لە هەموو کاتیکی دی بەدبەخت ترم". دەستی بەسەر قژمدا هینا و وتی: "بۆچی کچە خۆشەویستەکەم؟ چی بووە؟" وتم:"مەپرسن. من خۆشم نازانم چیمە". ئینجا دەستی بە ئامۆژگاریم کرد و وتی: "نایلییت.. مەیلێ.. بەلام رۆلە تۆ و ئەوانەی وەکو تۆن ناتوانن هیچ بەرامبەر ئەم رژیمە بکەن. ئیوە وا دەزانن ئەم رژیمە لەسەر پیی خۆی وەستاوە تا

ئێوە بتوانن سەرەونگونی بکەن؟ ئەوانەی کە ئەم ڕژێمە دەپارێزن؛ لەم چاوشارکێیانەی ئێوە ناترسن. ئەم دێوە قوربانیی زۆری دەوێت. بەڵام من کەسێك نابینم پیاوی مەیدانەکە بێت. دەترسم لەبری ئەوەی لاوازتری بکەن؛ زیاتر هاری بکەن و خوێنخۆرتر بێت و بێپەروایانە تێتانبکەوێت. بیستووشمە لە فەرەنسا چەند قوتابییەك لەمجۆرە هەوڵ و تەقەلایەدان؛ چاوم بە ڕۆژنامەکەشیان کەوتووە. ئەگەر هەست دەکەیت ئەم ڕێیەی گرتووتە بەر ڕێیەکی ڕاستە و ناتوانیت دەسبەرداری بیت، بەردەوام بە لەسەری وخوا لە پەناتدا بێت.. بێگومان ئاوەکەیان لە فەرەنسا بۆ ڕشتوویت.. بەهەرحاڵ من هەموو ماڵ و داراییەکم لەبەردەستتدایە..".

"لە هەمانکاتدا زەنگی تەلەفۆنەکە لێی دا. لە دائیرەی ئاسایشەوە دەیانویست قسە لەگەڵ باوکمدا بکەن. ئەفسەرەکەی ئاسایش داوای لە باوکم کرد ئێوارە سەعات شەش تا حەوت سەرێك لە نووسینگەی بەڕێوەبەری گشتی بدات. کاتێك باوکم لە دائیرەی ئاسایش گەڕایەوە، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە من چاوەڕێم دەکرد؛ زۆر ئاسایی و هێمن بوو. لە ڕەفتار و قسەکانیدا هەستم بە هیچ جۆرە شڵەژانێك نەکرد و شەوێ هەر وەکو شەوانی پێشوو لەگەڵ من و دایکمدا لە ژووری کارکردنەکەی لەسەر زەوییەکە دانیشتبوو. بیجامەکەی لە پێ کردبوو و عەباکەی دابوو بە شانیدا. سینیی مەشرووبەکەی لە بەردەمدا بوو. بۆ مەزەش چەند لەتێك هەنار و تۆزێك نان و سەوزە و توور و گۆشتی برژاوی لەبەردەمدا بوو. دەربارەی هەموو شتێ دوا، تەنها ئەو شتە نەبێت کە لە دڵیدا حەشاری دابوو و من تامەزرۆی زانینی بووم. ئیتر لە کۆتایی شەودا من وامزانی ڕووداوەکە بە تەواوەتی کۆتایی هاتووە. ڕۆژی دوایی بە دایکمی وتبوو؛ ئەویش بە منی وت کە باوکم نیازی وایە بچێت بۆ ساڵح ئاباد، بۆ ئەو موڵکەی کە لە نزیك قەزوێنەوە هەیەتی. هەر هەمان ڕۆژ من و دایکمی بۆ تاپۆ برد و لەوێ بەشێکی داراییەکی خستە سەر من. بەشی دایکیشمی دیاری کرد. بڕیاریش درا کە تا باوکم لە ژیاندا مابێت و پاش مەرگیشی من کاروباری ماڵ و موڵکەکەی بگرمە ئەستۆ.

"مامۆستا تا دوو سێ هەفتە بە بەسەرهاتی دوورخستنەوەکەی باوکمی نەزانی. بەڵام بەوەی زانیبوو کە ماڵمانیان پشکنیوە و هەر لەبەر ئەم هۆیەش بە هیچ جۆرێك ئامادە نەبوو ببینم و تەنها جارناجارێك ئاغا ڕەجەب دەستوورەکانی ئەوی بۆ دەهێنام، تا ئەو شەوەی کە چارەنووسی شوومی منی تیا دیاری کرا.

"دەمە و کۆتایی پایز بوو. بەڵام هێشتا هەوا ئەوەندە سارد نەبوو کە پێویست بکات مرۆڤ جلوبەرگی گەرم بپۆشێت. من کراسێکی ئاوریشمی قۆڵ کورتم لەبەردا بوو، ئەویش چاکەتێکی هاوینەیی و پانتۆڵێکی خۆڵەمێشیی پۆشیبوو. بۆینباخێکی جوانیشی بەستبوو. ڕەنگەکەی شەرابییەکی خاڵخاڵ بوو. وەختێ، لەبەردەم سینەماکەدا بینیم؛ ترس دایگرتم. هەستم کرد کەسێك چاودێریمان دەکات. یەکێك لە پشت سەری ئەوەوە وەستابوو و کاتێك لە ماکان نزیك بوومەوە؛ ئەو تۆزێك لێم وردبووەوە. کە لەناو سینەماکەدا سەرنجیم بۆ ئەولاوە کورتە باڵا سمێڵ ڕەشە ڕاکێشا؛ وتی: "هیچ نییە. کەس هەقی بەسەر ئێمەوە نییە". وتم: "ئاخر من بینیم لێم وردەبووەوە". وتی: "گوێ مەدەرێ. لە خۆمانە". پرسیم: "ئەی باشە بۆچی پێمتان نەناساند؟" وتی: "ویستم ئەو تۆ بناسێت. پێم بڵێ؛ ئەو ڕۆژە لە ماڵی ئێوە چ باس بوو؟" پرسیم: "ئێوە لە کوێ دەزانن؟" وتی: "لەم دوو سێ هەفتەیەی دواییدا ژمارەیەکی زۆریان گرتووە". وتم: "هاتن بۆ ماڵی ئێمەش و پشکنیان". وتی: "سەبرکەن تا لە یادم نەچووە با شتێکتان پێ بڵێم. ئەو نامانەی لە پاریسەوە دێن بە چ ناوێك پێتان دەگەن؟" وتم: "لەسەر نامەکان دەنووسرێ: بەڕێز خانم فەرەنگیس" پرسیی: "ناوی باوکتانی لەسەر نییە؟". وتم: "نەخێر، تەنها ناونیشانی ماڵەوەمانی لەسەرە، ناوی شەقامەکە و ژمارەی خانووەکەمان". وتی: "باشە.. تیلیگرافێکم کردووە تا ئیدی بەو ناونیشانە نامە نەنێرن. هەر نامەیەکتان پێگەیشت؛ تا بیستوچوار سەعات مەیکەنەوە و گەر هاتنو داوایانکرد، بیگەڕێننەوە و بڵێن ئەمە بۆ ئێمە نەهاتووە و بە هەڵە بۆ ئێرەیان ناردووە". پرسیم: "ئەی ئەگەر نەهاتن؟" وتی: "لەگەڵ ئەوەشدا هەر مەیکەنەوە و بیدەن بە من. کاتێ ڕەجەبتان بینی بیدەنێ تا بۆ منی بهێنێت.

منیش بە بیٔئەوەی سەری زەرفەکە بکەمەوە؛ نامەکە دەخوێنمەوە و پاشان بۆتانی دەگەڕێنمەوە و نامەکە وەکو خۆی هەڵگرن". نیگەران بووم. پرسیم: "مامۆستا.. هیچ مەترسییەك لەئارادایە؟" وتی: "هەمیشە مەترسی لەئارادایە. بەڵام لەو بڕوایەدا نیم ئیتر مەترسییەك بۆ ئێوە هەبێت. جگە لەوە من تا ئێستا بە تەواوەتی نازانم لە ماڵتان چی ڕوویداوە. ئێوە جارێ ئەوەم بۆ باس بکەن".

هەرگیز ئەوم بەو گەرمی و کەفوکوڵەوە نەدیبوو. کاتێ لە تاریکییەکەدا دەستی گرتم، تا شوێنەکانمان ئاڵوگۆڕ بکەین، لەشی گەرم بوو و من هەرگیز چاوەڕێی ئەوە نەبووم. ئاغای چاودێر، ئەو حاڵەتانەی ئەو شەوە بەسەرمدا هاتن؛ کاتێ ئەوم بینی، بە جۆرێك نین بتوانم بەم سادەییە بۆتانی باس بکەم. تەماشا کەن، من باوکم خۆشدەویست، کەچی پتر نیگەرانی مامۆستا بووم. دەترسام نەبادا تووشی بەڵایەکی بکەن. ئەو مەترسییەی هەڕەشەی لە مامۆستا دەکرد بەلای منەوە هەزار جار سەختتر بوو لەو بەڵایەی کە بەسەر باوکمدا هاتبوو. من شڵەژابووم و ئەو پیاوە کە هێندە هێمن بوو و دەیتوانی ئەو هەست و سۆزەی کە گینگڵ بە دەروونی دەدا لە ناخی دڵیدا حەشار بدات؛ ئەو شەوە ئەوەندەی نەمابوو لەژێر کاریگەریی ئەو شڵەژاوییەی مندا هاوسەنگیی خۆی لەدەست بدات. لە کوێ دەمزانی کە ئەویش وەکو من ئازار دەچێژێت؟ بەهەرحاڵ ئەو ئازارەی هەردووکمان دەمانچەشت لە دوو ڕوانگەی تەواو جیاوازەوە بوو. من ناتوانم بەسەر ئازاری ڕۆحیی خۆمدا زاڵ بم. گەر تا ئێستا لە قسەکانم گەیشتبن دەها باشتر. گەر تێشنەگەیشتبن؛ ئەوا ئیدی گوناهی من نییە. بەڵام ئەو.. مرۆڤ بوو، بەلایەوە شتێك نەبوو تەنها لایەنێکی تاکەکەسی بە خۆیەوە بگرێت. ئەو هەموو شتێك؛ تەنانەت هاواری دڵیشی دەخستە ژێر تیشکی شیکردنەوە و گەر لەگەڵ ئەو بیروڕایانەی کە پێوەیان پابەند بوو؛ تەبا نەبوایە ئەو هاوارەی خەفە دەکرد. پێم وتن کە بەلای ئەوەوە هونەرەکەی بەیانکەری تەواوی خەونەکانی بوو. ئەوەی لە تابلۆکەیدا دەریدەبڕی، ئەو شتە بوو کە لە ناخی دڵ و لە کونج و کەلەبەرەکانی ڕۆحی بەرزییەوە گڕئاسا زمانەی دەکێشا. بەلای ئەوەوە هیچ شتێك نەبوو لە

هونەرەکەی بە بەبەهاتر بێت. هونەرەکەشی وا بەستە بوو بە کۆمەڵگا و ئەو خەڵکەوەی لە ناویدا دەژیا. ئیدی کێ چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکرد کە خۆشەویستییەکەشی نەکاتە قوربانی ئەم ئامانجە بەبەهایە. ئەو نەك هەر دەیتوانی بەسەر سێڵاوی هەستە پڕ جۆش و خرۆشەکەی خۆیدا زاڵ بێت و بە هێزەکانی ئەقڵیەوە وەکو بەربەستێك بەریان لێ بگرێت؛ نا.. بەڵکو دەیتوانی پێ بنێت بە جەرگی خۆیدا و، دڵی پڕ کڵپەی لە ناو مستیدا بگوشێت و نەهێڵێت کەسێك کە لە دەرەوەی دونیا و حاڵەتەکانی ئەودایە هەست بە لێدانی بکات. من ئەو شەوە زانیم کە لە نزیك چ کوورەیەکی پڕ ئاگری توێنەرەوەدا وەستاوم و کەچی خەریکم لە سەرمانا هەڵدەلەرزم. ئەو هەوڵیدەدا لێدانەکانی دڵی کە لەتاو دووریی من جۆشیان سەندبوو؛ لێم بشارێتەوە. وەختێ مرۆڤ بۆنی بەڵایەك دەکات؛ پتر پێویستی بە هاوڕێیەتی و میهرەبانی دەبێت. من هەر لە خۆمم دەپرسی دەبێ سەبارەت بە من چۆن بیربکاتەوە. بێگومان لە دڵی خۆیدا وتوویەتی: "شایستەی خۆشەویستیی من نییە. ناتوانین پێکەوە هەڵکەین. لە نیوەی ڕێدا جێم دەهێڵێت و دەڕوات". لەوانەیە هەقیشی بووبێت.

"باسی ئەو ڕووداوانەم بۆ کرد کە لە ماڵەوە بە سەرماندا هاتبوو. باسی دایکمم بۆ کرد وتم: لەو ڕۆژەوە بەردەوام ئایەتولکورسی دەخوێنێت و و فوو بە دار و دیواری ماڵەوەدا دەکات و لەمڕۆبەیانییەوە دووعای لە گیرفانیدا هەڵگرتووە. بە باوەڕی دایکم هۆی ئەو بەدبەختییەی ڕووی تێکردووین ئەوەیە کە شەوی چوارشەممەیەك ئینسانێکی شووم پێی ناوەتە ماڵمانەوە. هەر کە هاتمە سەر ئەوەی بڵێم باوکمیان دوورخستووەتەوە، قوڕگم پڕ بوو لە گریان. بە چاوی پڕ فرمێسکەوە لە تاریکیی سینەماکەدا ڕووم تێکرد و پێم وت: "من.. ئیتر جگە لە ئێوە کەسی تر شك نابەم ببێتە پەناو هاوخەمم". دەستی هێنا و قۆڵە ڕووتەکەمی گرت و وەها توند گوشیی کە من هەستم بە ئازار کرد، قۆڵمی گرت و منی بەلای خۆیدا ڕاکێشا.

"ئاغای ئازیز، سەرتان سوڕنەمێنێت، من تەنانەت لەوپەڕی لەزەتدا، تەنانەت کاتێ کە لە کوورەی بەختەوەریشدا دەتوێمەوە؛ هەر هەست بە تاڵیی ئەو ژەهرەی ژیان دەکەم کەوا لەژێر زمانمدا. هەستم بە چ لەزەتێك کرد وەختێ دەستی بەر قۆڵم کەوت! کەچی لەگەڵ ئەوەشدا قێزم هاتەوە. چاوەڕێی ئەوە نەبووم. ئەم پیاوە وەك ڕەساس دەهاتە پێشچاو! وایدەزانی دەتوانێت سۆزی دەروونی خۆی بشارێتەوە . بەڵام لە خەتەکانی دەموچاویدا، لەو سوورییەی کە لە چاوەکانیدا بوو، هەست بەو شڵەژان و تێکچوونەی دەکرا. لەگەڵ ئەمەشدا؛ مرۆڤ هەر دوودڵ دەبوو بەرامبەری و بە تەواوی لە مەبەستی نەدەگەیشت. ئایا بۆچی قۆڵمی گوشی؟ دڵی بە حاڵم سووتا، چونکە من خەریکم لە پێناوی ئامانجی هەردووکماندا ماڵ و خانەوادە و باوکم دادەنێم؟ وەختێك بیرم لەمە کردەوە؛ قێزم هاتەوە. لەوانەشە بۆیە قۆڵی گوشیبم؛ چونکە وتم بێکەس و بێپەنام و ئەو هەستی بە گەرمیی خۆشەویستیی من کرد.. ئاە..، ئەمەیانم پێ خۆش بوو. ئەمە ئەو شتە بوو کە من تینووی بووم. من دەمویست ئەو لە چاوە پڕ ئارەزووەکانمدا ئەوە بخوێنێتەوە؛ من کە ئامادەی گیانبازیم؛ تەنها لە پێناوی ئەودایە. تەنها لەبەر ئەوەیە کە من هەستدەکەم دوای ئەو هەموو متوموڕووانەی هاتنە دەستم؛ وا ئاخرییەکەی گەوهەرێکم دۆزییەوە.

"ئاغای چاودێر، سەرنج بدەن، من نەخۆشم. سەیر مەکەن بە ڕواڵەت باشم. کە ئەوەندەش بۆ ئەورووپا دەچم؛ بەشێکی زۆری بۆ چارەسەری خۆمە. چەندەها جار خۆم پیشانی پرۆفیسۆرە پلە یەکەکانی ئەورووپا داوە. بە ڕواڵەت هیچم نییە. زۆربەیان منیان بە ساغ لە قەڵەم داوە. گشت ئەندامەکانی جەستەم دروستن. بەڵام جاری وایە تەواوی لەشم دەلەرزێت، خەریکە بەدەنم گڕ دەگرێت، دڵم دەگیرێ. پێیان وتووم گوایە من تووشی Hyper sensibilite "حەساسیەتێکی فرە" بووم. پێستی لەشم، سەری پەنجەکانم، نیگای چاوەکانم، هەموو شتەکانم پتر لە ئاستی ئاسایی هەستیارن. هۆکارەکانی دەرەوە زیاتر لە ڕادەی ئاسایی کارم لێدەکەن و

ئەم هەستیارییە نائاساییە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەعسابم پتر لە سنووری دیاریکراو بورووژێت.

"من دەڵێم چی؟ نەبادا لە ناخی دڵتانەوە گاڵتەتان پێم بێت؟ ئەم شتانەی دەیانڵێم ڕەنگە هەر زۆر بێبایەخ بن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئازارم دەدەن. خۆشم تێناگەم. ئەو تابلۆیەی مامۆستاش دەربارەی چاوەکانی من کێشاویەتی ئەوەندە لە منەوە دوور نییە. ئەو شتێك تێگەیشتووە کە من خۆشم ڕەنگە تا ئێستا تێینەگەیشتبم. ئەم چاوانە، ئەم نیگایە، پتر لە ڕادەی ئاسایی شت دەڵێن. تەمەنێکە و ئەم تابلۆیە ئازارم دەدات. دەزانن بۆچی ویستم تابلۆکەتان لێ بسەنم؟ دەمویست بیسووتێنم. بەڵام تازە بە چی دەچێت؟ ئێستا خەریکم بەسەرهاتی عەزابی هەمیشەیی ژیانی مەلوولی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە، دەبینم کە ئەم بەدبەختییە شتێك نییە لێم جودا بێتەوە. تابلۆکە هەبێت یان نەبێت؛ ئەم ئازار و ئەشکەنجەیە، ئەم تووڕەیی و دەردی تەنیاییە هەمیشە لەگەڵمدایە. دەستم لێ هەڵناگرێت.

"کاتێك بەدەست و پەنجە پتەو و بەهێزەکانی قۆڵی گرتم، دەتگوت ناکاو هەزاران سووژنیان بەدڵمدا کرد. لە هەمانکاتدا دەتگوت پاش ماندووبوونێکی زۆر ئاوێکی فێنکی سازگار دەکەن بەسەر لەشمدا. کاتێ چاوم بڕییە چاوەکانی، تەواوی ئەو جۆش و خرۆشەی کە ئەوی دەتواندەوە و خەریکبوو منی دەکردە کەوە؛ چەشتم. دڵم خەریکبوو هەڵدەکەنرا. دەمویست بە زمانێك، بە جۆرێك لە جۆران؛ ئەو شتەی لە دڵمدایە پێی بڵێم. ئاخ، حەزمدەکرد ئەو زمانە هاوبەشەمان بهاتایەتە قسە. سەرم داگرت و پەنجە گەورەکانیم ماچ کرد کە دەیانویست لە قۆڵمدا جێی خۆیان بکەنەوە؛ ئەو فشارەی کە لەسەر قۆڵم بوو خاو بووەوە. پەنجەکانی کۆکردەوە. سەری پەنجەکانی بە قۆڵمدا هێنا. وەك ئەوەی بیەوێت ئەو ئازارە خاو بکاتەوە کە پێی گەیاندووە. ناگەهان جارێکی دیکە بە توندی قۆڵمی گوشی و ئینجا دەستی لابرد. ئیتر لەوە زیاتر بەرگەم نەگرت. هەلسامە سەر پێ و وتم: "بڕۆین؟" پرسیی: "بۆ کوێ؟" وتم" هەر لیرە بڕۆین، ئیتر بۆ کوێ دەچین با

بچین". وتی: "سەبر کەن، ئەو لاوەی کە لە دوامەوە بوو؛ کاری پێمە، چاوەڕێی من دەکات" ئاخ.. ئەم پیاوە بۆ ساتێك چییە کارەکەی، ئامانجەکەی لەبیر نەدەچووەوە. من وام هەست دەکرد. گەرچی بەڵگەی ئەوەشم شك نەدەبرد. هەمدیسان بیری لە "کار"ەکەی کردەوە. منی تا دەم کوورەکە دەبرد و ئینجا وای لێ دەکردم لە سەرمانا هەڵبلەرزم. ئەمە ئەو کۆستەیە کە تەمەنێکی تەواو من گرفتاری بووم و ئێستاش هەر گرفتاریم. دەزانن دەمەوێ چی بڵێم؟ دەمزانی کە تینووی ماچەکانم بوو، کە سەری پەنجە داخەکانی دەیانەوێت تەواوی جەستەی من بسووتێنن. دەمزانی کە سنگی پێویستی بە تەواوی گوشاری لەشی منە. دەمزانی گەر کەسێك هەبێت لەو دنیایەدا بتوانێت بەختەوەری بکات؛ ئەوا ئەو کەسە منم. من خۆشم دەمویست هەست بە تەواوی گوشاری لەشی و چێژی گوشینی دەستە پتەوەکانی لە قووڵایی لەشمدا بکەم. دەمویست بوونی لە بوونمدا بتوێتەوە. دەمویست قژە ئاڵۆسکاوەکەی خاو بکەمەوە و بە پەنجەکانی خۆم لوولیان بکەم. دەمویست.. گەرمیی لێوەکانی بە لێوەکانم بمژم، دەمویست ڕۆحی.. ئەو ڕۆحە پڕ سۆز و تین و تاوەی؛ بە ڕووتی ببینم، دوور لەو قاوغە زبرەی کە ڕۆژگاری دیکتاتۆری و ترسی پۆلیس بە دەوریدا دروستی کردووە. دەمویست پەی بە قووڵایی ناخی بەرم. بەڵام ئەو لە بیری کارەکەیدا بوو. لە بیری سیاسەتەکەیدا بوو. من وامدەزانی ئەویش وەکو من بە لایەوە جگە لە دونیای خۆم و خۆی دونیایەکی دیکە بوونی‌نییە. بەڵام ئەو هەر لە بیری نامەنووسین و، بە پۆستەدا ناردن و، هەراسانکردنی سەرۆکی ئاسایش و، وروژاندنی شاو، لە بیری لادێییەکانی مازندەران و، کرێکارانی ئەسفەهان و، هاوڕێکانی و، ئەو لاوانەدا بوو کە چاوەڕوانی دەستوورەکانی بوون و، هەر وەکو خۆشی دەیوت لە بیری خەڵکدا بوو. من هەموو شتێکی خۆمم کردبووە قوربانی ئەو، کەچی ئەو بەرامبەر ئەوە نەیدەویست هیچم بداتێ.

"دەرفەتیم نەدا. هەڵسام و ڕۆیشتم. دەبوایە گەر بۆ تەنها جارێکیش بێت ئیرادەی خۆمی بەسەردا زاڵ بکەم. وتم: "من دەڕۆم. من ناتوانم لێرە بمێنمەوە".

من وامزانی ئەو لە جێی خۆیدا دەمێنێتەوە. من سەرم داخست و لە سینەماکە چوومە دەرێ. بە دوامدا ڕایکرد تا پێم بگاتەوە. لەسەر شەقامەکە گالیسکەیەکم گرت. پێم وت چەترەکەی هەڵدا. کاتێك ویستم سواربم، هات و لە تەنیشتمەوە دانیشت. دەستی خستە ژێر باڵم. لە داخاندا بەدەنم دەلەرزی. بەڵام بە ڕواڵەت ئارام بووم. دەستی گرتم و توند گوشیی و وتی: "فەرەنگیس!" وەڵامم نەدایەوە. دەستەکانمی دەگوشی؛ بەڵام نەمدەزانی چیی پێ بڵێم. سارد.. وەکو دارێکی تەڕ کە دووکەڵ دەکات و ناسووتێ؛ ئاوەها لایەوە دانشتبووم. ئەویش هیچی نەدەوت. کە گەیشتینە شەقامی بەردەم باڵیۆزخانەکە، گالیسکەچییەکە پرسیی: "بۆ کوێ بچین؟" دەمویست ناونیشانیماڵەوەی بدەمێ. هێشتا ناوی شەقامەکەم لە دەم نەهاتبووە دەرێ؛ ئەو بەدوا قسەکەمدا هات و وتی: "بۆ لای شەقامی پەهلەوییەوە، نزیك ئاوەکەی کەرەج". ئاوڕم لێ دایەوە و بە نیگایەکی پڕ لە سوپاسەوە سەیرمکرد. نەمدەزانی چی بڵێم. ئەم پیاوە بەسەر مندا زاڵ بوو. لە من بەهێزتر بوو. دەیتوانی هەرچییەکی بوێت لەگەڵمدا بیکات.

"ئیدی ئیرادەم لە دەست خۆمدا نەمابوو. سەری هێناو چاوەکانمی ماچ کرد. بەڵام من خۆم لە دەستی ڕزگار کرد. تاوێك لێی ڕامام. ئینجا یەکسەر دەستم کردە ملی و لێوە وشکەکانیم بە لێوەکانی خۆمەوە نووساند. وتی: "فەرەنگیس، فەرەنگیس!" وتم: "گیانەکەم، گیانەکەم!"..

"ئەو ماچانە خۆشترین ماچی تەمەنم بوون. لە هەمان کاتدا هەرگیز خۆمم بەو ناکامی و بەدبەختییە نەبینیوە".

ئافرەتە نەناسەکە کەمێك راما. گازی لە لێوی ژێرەوەی خۆی گرت. بە زۆر دەیویست ریگا لە فرمیسکەکانی بگرێت. لە چەند ساتی دواییدا دەتگوت هەر منی لەبیر چووەتەوە و لەگەل خۆیدا دەدوێت. دەتگوت دیمەنەکانی رابوردووە تاریکەکەی بە رۆشنی و زیندوویی بە بەرچاوانیدا رەت دەبن و ئەوەی دەیبینێت بە بیری دەسپێرێت تا باشتر بیگێرێتەوە.

بێدەنگییەکەی منی بۆ دونیاکەی خۆمان هێنایەوە. جارێکی دی کە تەماشایەکی تابلۆکەم کرد کە بەرامبەرم بوو و لە چاوەکانی وردبوومەوە، حەزمدەکرد شتێکی نوێیان تیا بدۆزمەوە. لەم چاوە روون و بێگەردانەدا ئاوێنەی رابوردووی ئەم ئافرەتە خۆی حەشاردابوو. وەختێ چاوم لەسەر تابلۆکە لابرد و سەیری ئەوم کرد، تەماشام کرد سەیری سەعاتەکەی دەکات. وتی: "دەزانن کاتیش درەنگ بووە؟"

پرسیم "سەعات چەندە؟"

وتی: "لە یەك تێپەریوە"

وتم: "تازە خۆ دەرم ناکەن، نارۆم. حەز دەکەم تا کۆتایی بەردەوام بێت".

وتی: "کۆتایی نییە".

-ئەی چۆن لەو جیابوونەوە؟

-وا دەزانن دەمانتوانی پیکەوە هەلبکەین.

-نازانم.. منیش دەمەوێ پرسیاری ئەوە بکەم.

-کیشەکە لیرەدایە.. گەر تا ئیستا نەتانتوانیبیت هۆی ئەوە بزانن، دیارە کە من نەمتوانیوە خۆم و ئەوتان پی بناسینم.

-بەڵام ئاخر چۆن و بۆچی ئەویان دوورخستەوە؟

-ئیدی ئەوە پەیوەندیی بە ژیانی منەوە نییە.

-ئێوەش نەتانویستووە ژیانی خۆتانم بۆ بگێڕنەوە. ئێوە دەتانویست پەردە لە رووی نهێنیی ئەم چاوانە هەڵماڵن.

-من ئەمەشم نەویستووە. من تەنها دەمویست ئەوەتان تێبگەیەنم کە چۆن و بۆچی ئەو وێنەی چاوەکانی منی بەو جۆرە کێشاوە، بەڵێ، داوە دەزووەکانی ژیانی من بە جۆرێك لەگەڵ هی ئەودا لێکئالاون کە جیاکردنەوەیان لە یەکدی مەحاڵە.

رووی وەرگێڕا و سەیرێکی چاوەکانی کرد. بۆ چەند ساتێك گرژی کەوتە نێوچەوانی، دەتگوت چاوەڕوانی ئەوە نەبوو ئەو وەسفەی کە هی خۆی کردبوو؛ تیایاندا ببینێتەوە. پاشان وتی:

"ئەو ئەگەر منی نەناسیبێت و ئاوەها وێنەی چاوەکانمی کێشابێت، گوناهی ئەو نییە. گوناهی خۆمە، چونکە من هەرگیز هەوڵم نەدەدا حەقیقەتی خۆمی پیشان بدەم. پڕکێشیی ئەوەم نەدەکرد. ئەوەندە ڕێزم لێ دەگرت، ئەوەندە پلەوپایەی لام بەرز بوو کە نەمدەتوانی ڕابوردووی شوومی خۆمی لا ئاشکرا بکەم. تەماشا کەن، ئەمە دژوارە و من نازانم بە چ زمانێك ئەوەی کە لای خۆم پەرتە؛ لە قالبێکدا بۆ ئێوەی بخەمە ڕوو. من ڕابوردووم هەمیشە بە دوامەوە بووە. ڕابوردووم هەمیشە وەکو تارماییەك دوام کەوتووە. ئاخر من چیم کردووە؟ چ گوناهێکی گەورەم کردووە؟ بۆچی نەمتوانی ژیانێکی ئاسایی بژیم؟ بۆچی نەمتوانی ببمە خاوەن ماڵ و مێرد؟ ئەی ئێستاش بۆچی ناتوانم شوو بکەم؟ من ئاواتم ئەوە بوو ژیانێکی هونەرمەندانە بەسەر بەرم. وام

هەست دەکرد ئەو بەختەوەرییەم پێ بەخشراوە کە ئەوەی پەنهان و پیوارە بیهێنمە قسە. کەچی ئێستا لە بەختەوەریی ژیانی خەڵکانی ئاساییش بێ بەشم، وەك ماسییەك کە لەنێو ئاوەوە بکەوێتە سەر زەوییەکی وشك، لەسەر ئەو زەوییە تەپاوتلمە و کلك بە دار و بەردا دەکێشم. هەم ئەو دونیا بڵندەشم لە دەست چوو و هەم دونیا نزمەکەش. ئێستا بێ پەنا و پشتیوانم. دەزانن بۆ؟ چونکە ڕابوردووم، هەموو ئەو شتانەی بەسەرم هاتن، ئەو ڕووداوانەی لە ژیانی ڕابوردوومدا روویاندا، لە هەموو جێیەك وەکو سێبەرەکەم لەگەڵمدان و ناتوانم لە چنگیان قوتار بم. ئەو داوانەی خانەوادەکەم لە بوونمیانەوە چنی، منیان خستە قەفەسێکەوە و هەرچییەك دەکەم ناتوانم ئەو توێکڵە ساردەی بەرم بترووکێنم. ئەم بەڵایە کە ئێخەم دەگرێت هەر هی ئێستا نییە. بەڵکو هی ئەو ڕۆژەشە. ئەو بەختەوەرییەی کاتێ پیاوێك قسەیەکی خۆشم پێ دەڵێت و منیش سوور هەڵدەگەڕێم، ئەم لەزەتە تەنها لەگەڵ ئەودا هەستم پێکرد. کاتێك ئەو دەستی دەگرتم، تامی ئەو بەختەوەرییەم دەکرد. بەڵام یەکسەر ڕابوردووم، تارماییەك سات بە سات قورساییەکەی لەسەر ڕۆحم پتر دەبوو، ڕووە دزێوەکەی خۆی پیشان دەدام و خۆشاوی ئەو ڕۆژانەمی لێ دەکردم بە ژەهری هەلاهل. ئەم قورساییە گیانکێشە دەگەیشتە ڕادەیەك کە ئیدی بەرگەیم نەدەگرت. هەروەختێ بیرم لەو خۆشی و بەختەوەرییە دەکردەوە کە لەوانە بوو لە ژیاندا پیی شاد بوومایە، کتوپر، دوو جۆر بیرکردنەوە بەسەرمدا زال دەبوو، یەکیکیان ئەوە بوو کە دەمگوت: "من شایانی ئەو پیاوە نیم. من چۆن دەتوانم دەست لە هەموو شتەکانی خۆم هەلبگرم؟ لە جلوبەرگ و ئالووالا، لە سەیران و سەفا، لە سەفەر، لە رابواردن، لە هاورییەتیی لاوە قۆز و قۆشمەکان، لە هامشۆی کۆر و کۆبوونەوەی خانەدانەکان، لە چوون بۆ فەرەنگستان؟" من هەموو ئەمانەم لەبەردەستدا بوو و، دەبووایە وازم لە هەمووی بهینایە. لە کاتیکدا ئەو دەیتوانی هەموو شتیکی خۆی، پلەوپایە و، هونەر و خۆشەویستی و ریزی، بکات بە قوربانی بیروباوەرەکانی. ئەو کامەران بوو بەوەی سەرگەرمی گیانبازییە. ئومیدی هەبوو و لەزەتی لیدەبینی. ئەودەمەی کە دەترسا، ئەودەمەی دوچاری دلەراوکێ دەبوو، ئەودەمەی کە ڕۆژانە هاوریکانی بۆ دائیرەی

ئاسـایش ڕاپێچدەکـران و کەلەپچـەیان دەکـردن و ئاسـنی قورسـیان بـە ئـامێری پیاوانەیانـەوە هەڵدەواسـی، ئـەو دەمـە ئایندەی ئـەو خەڵکانـەی دەهێنایـە بـەرچاوی خـۆی کـە خۆشیدەویسـتن و ئـەو ئـازار و ئەشـکەنجەیەی بـە خـۆی، بـە سـوودی ئایدیالەکەی خۆی ڕەوا دەبینی. بەڵام من چی.."

فەرەنگیس سەری خستە سەردەستی و دەستیشی خستە سەر مێزەکە. پشتی پەنجەی ئیشارەتی خۆی دەگەزی و بیری دەکردەوە.

"دەمویست بڵێم چی؟ هەمان هەست دایگرتمەوە؛ وەختێ ویستم دەسبەرداری هونەرەکەم بم، دووچاری هەمان گرفتاری و ناکامی بوومەوە. بۆ سەرکەوتن بەسەر ئەو کێوە بڵندەدا نەخولقابووم. داروباری ئەوەم نەبوو و نەشمدەزانی ئـەودیوی کێوەکـە چییـە. وەلێ ئـەو نیگـارکێش بـوو. ئـەو دیمـەنی دڵڕفێنـتر لـە دیمەنـە ڕاستەقینەکانی سەردوندی کێوەکەشی لە دونیای تەسـەوریدا دەکێشـاو، زیـاتر چێژی لەو خەیاڵـە خۆشـەی خۆی دەبینی. ئـەو ئەسـیری ئـاینده بـوو. ئـایندەی جوان و ڕوونـاك و پـاك و خـاڵی لـە گرفتـاری و ئـازار و چەرمەسـەری دەبینـی. بـە پێچەوانەوەی منەوە، من لەبری ئاینده ڕابوردووم شك دەبرد، ڕابوردوویـەکی بێ ڕۆح، ڕابوردوویەکی تاریك کە تاقە تروسکاییەك چییە تێیدا نەبوو، چەندەها جار لـە ژیـانمدا وام هەسـت کـردووە دەرگایـەکم چنـگ کـەوتووە و پاشـان لـە دەسـتم کەوتووەتە خوارەوە. چەند هەوڵم داوە لە بڵندایییەوە دوای ئەم دەرگا پرشنگدارە بکەوم کە بە کەناری بەرد و زیخ و چەوەکاندا و بەنێو جۆگەلـە تیژڕەوەکانـدا تلـی دەدا، تـا بیدۆزمـەوە. بـە دوویـدا ڕامدەکـرد، بـێ بـەردەباز ڕوبـارە تیـژ ڕەوەکـانم دەبڕی، ئامادە بووم گیانی خۆم بخەمە مەترسییەوە، دەکەوتم و پێم لە بەردەکان هەڵدەخلیسـکا، برینـدار دەبـووم، هەمدیسـان هەڵدەسـتامەوە، ڕامدەکـرد، بـەنێو چەوە داخـەکاندا، بەنێو دڕك و خاشـاکەکاندا؛ بـە پێـی زامـدار و خـەیاڵی پـڕ لـە ترسـمەوە ڕامدەکرد و وەختێکیش دەمدۆزییـەوە، سـەیرم دەکـرد شووشـەیەکە و هیچی دی. ئەو ساتە تەواوی شەکەتیی ڕێگاکە لە بەدەنم دەنیشت و ئارەقەیـەکی سارد گازەرای پشتمی دەهێنایە لەرزە. هەزاران جار بە خۆم وتووە: "کێ دەڵێت

ئەم دەرگایەش یەکێك نیە لەو شووشە ساختانەی کە هەر لە خۆیانەوە دەشکێن؟"
ئەمە بیرکردنەوەیەکیانم بوو. بەڵام ئەوەی زیاتر ئازاری منی دەدا ئەمە بوو: "کێ دەڵێت ئەو منی خۆشدەوێت؟ ئەسڵەن منی هەر خۆشناوێ. ئەی هەزار جار ئەوەی دووپات نەکردۆتەوە کە لە ژیانیدا تەنها بە ئاوات و ئامانجەکەی خۆیەوە وابەستەیە. ئەو پابەندی هیچ شتێکی دیکە نییە. ئایا گەر لە کارە خەتەرناکەکانیدا بەشدار نەبوومایە؛ منی خۆشدەویست؟ چی پیاوانە باسی جوانییەکەمیان دەکرد، کەچی ئەو بۆ تاقە جارێکیش پێی نەوتم جوانیت". ئاخ.. چەند حەزمدەکرد بزانم ئایا لە دڵیدا پەسەندم. نەیوت، لە کاتێکدا ئەو؛ کە هونەرمەندێکی بەهرەوەر بوو، دەبوایە لە هەموو کەسێکی دیکە زیاتر سەرنجی ئەفسوونی رووە قەشەنگەکەی منی بدایە. بەلای ئەوەوە جوانییەکەی من بوونی نەبوو. ئەو بە تەنها دلاوەرییەکەی منی بەلاوە پەسەند بوو. لەزەتی لەو ئەعسابساردییەوەی من دەچەشت کە لەو کارە خەتەرناکانەدا پیشانم دەدا کە پێی دەسپاردم. ئەو لەزەتی لەوە دەبینی و ئێوەش دەزانن کە ئەو دلاوەرییەی من شتێکی دروستکراو بوو. من خۆم باوەڕم پێی نەبوو. من لە پێناوی ئەودا، نەك لە پێناوی ئەو خەڵکەدا کە ئەو لە پێناویاندا گیانبازیی دەکرد ئامادە بووم هەموو کاتیك رۆحی خۆم بخەمە مەترسییەوە. بەڵام ئەو ئاگاداری ئەو شتە نەبوو کە منی کلۆل دەبێ چەند نرخی ئەوە بدەم؟ ئەو وایدەزانی کە من دەمەوێ بە چاوە ئەفسووناوییەکانم ئازاری بدەم. ئەم بیرکردنەوەیە منی ئازار دەدا کە ئەو خودی من و بوونی منی ناویت، بەلکو بە تەنها کارەکەی خۆی دەویت و بەس.

"ئەو شەوە، لە کەنار روباری کەرەجەوە، ئەوەی بە سەرمدا هات شتیك نییە بگوترێ. وشە ناتوانیت هەست و نەستەکانم بەیان بکات. لەژێر تریفەی مانگە شەودا، بە عیشقەوە و خۆشبەختانە، وەك خۆشەویستی ئەو، بیباك لە رابوردوو، ئومیدەوار بە ئایندە، نوقمی حالەتیك بووم کە لە ژیاندا بە دەگمەن نسیبی کەس دەبیت. دەستمان لەناو دەستی یەکدا و، لەژێر درەختی دار بناوەکاندا پیاسەمان دەکرد. ئاوازی ئارام و دلرفینی ئاوەکەم دەهاتە گوێ. هەرکاتیك دەوروپشتمان

چۆل دەبوو بە هەلمان دەزانی و یەکتریمان ماچ دەکرد. ناولەپی دەستیم ماچ دەکرد، سەری پەنجەکانی، چاوە درشت و قژە ئالۆسکاوەکەیم ماچ دەکرد و بۆنیانم هەلدەمژی. دەتوت دەترسام کە ئیدی ئەم حالەتە دووپات نەبیتەوە، هەر بۆیە دەبێ تویشەبەرەی تەمەنیك بەدبەختی لەگەل خۆمدا هەلگرم. ئای.. چی وادەم دایێ، چیم پێ وت، پیم وت هەر لە یەکەم رۆژی بینینییەوە خۆشمویستووە. پیم وت یەکەم جار لە کارگەی نیگارکیشانەکەی بینیم. چەند بە تامەزرۆییو شەیداییەوە گویی بۆ قسەکانم دەدیرا. بە وردی ئەوەم بۆ باس کرد کە وازم لە نیگارکیشان هینا چونکە بە دلی ئەو نەبووم. سیمای چەند خەمزەدە بوو! لیوەکانی وشك بووبوون و دەلەرزین. بە دەستەکانی وەها لەشمی دەگوشی کە هەناسەمی توند دەکرد. بەلام ئای لەو ئازارە شیرینە! پیم وت دەمەوێ هەتاهەتایە ببم بە هی ئەو، ببمە هاورێ و هاورازی، هاوکار و هاوخەباتی، هاویارو هاوخەمی.

"گەوالە هەوریك بە دەوری مانگدا دەسوورایەوە. هەر کە گۆی مانگ بە رەشاییەکەدا تیدەپەری، ئەودەمە رووبارەکە بە نهینی و خامۆشانە ریی تەی دەکرد و، لقوپۆپی درەختەکان ئارامانە سەریان رادەوەشاند. پاشان مانگ بە زەردەخەنەیەکەوە سەری دەردەهێنایەوە و تریفەی بەسەر ئاوەکەدا پەخش دەکردەوە. ئافرەتێکی قەرەج لە دوورەوە گۆرانیی دەچڕی و تێدەپەڕی. پیرەمێردێك لە کەنار شەقامەکەوە نەیی دەژەنی و ئاوازەکانی ژیانە پڕ مەلوولییەکەی خۆی دەخوێند.

"شێتانە یەکترمان ماچ دەکرد، توند دەستیم بە سنگی خۆمەوە دەنا. پێی دەوتم: "چاوەکانی تۆ منیان بەم رۆژە گەیاند. ئەم نیگایەی تۆ منی گەیاندە ئەم شوێنە. توانای بەرگەگرتنی نیگاکانی تۆم نەبوو. نەتدەبینی چاوم دەبڕییە زەوییەکە؟" منیش پێم دەوت: "باشتر لە چاوەکانم وردبەرەوە، جگە لە تۆ هیچی تریان تێدا نییە". دەیوت: "نا، دونیایەکی پڕ نهێنی لەم نیگایەدا پەنهانە. من ئینسانێکی شەرمن بووم، چاوەکانی تۆ جورئەتیان پێ بەخشیم". ئینجا من

دەستیم دەگرت، ناولەپی دەستیم ماچ دەکرد و دەموت: "تۆ چ ڕۆحێکی گەورەت هەیە! من ئەم سروشتەی تۆم خۆشدەوێ، ئەم جۆش و خرۆشەت، ئەم گەرمییەت، من پێویستم بەم سۆز و تینوێتییەی تۆ هەیە، دەمەوێ تا دەمرم لەگەڵ تۆدا بژیم، هەمیشە لەگەڵ تۆدا بم".

"کە ئەو قسەی دەکرد؛ من سەرم دەخستە سەرشانی. بەڵام ئۆقرەی نەدەگرت. دەستی دەهێنا و ملمی دەگوشی و لێوەکانی بە گەردنمەوە دەنووساند. هەناسەی توند دەکردم. پێم دەوت: "تۆ چەند ئازار دەکێشیت، بەرگەی چ ئازارێکت گرتووە؟ بە منیان دەوت کە تۆ کابرایەکی ڕەق و بێ عاتیفەیت. چۆن دەتتوانی ئاوەها ئارام بیت و ئارام بنوێنیت؟ ئەم ڕۆحە پڕ تین و تاوەی تۆ.. ئەم ڕۆحە ئازار دیدەیەی تۆ دەپەرستم. حەز دەکەم ئاگام لە هەموو کارێکت بێت. هەرچییەکم پێ بڵێیت دەیکەم، سڵ لە هیچ ناکەمەوە، ئەرکی دژوارترم پێ بسپێرە. لێم خاترجەم بە. بچووکترین گومان چییە لە خۆتی دوور بخەرەوە. لەم دونیایەدا من هیچم بۆ نەماوەتەوە ژیانێك نەبێت کە بە مەیلی تۆ بێت. حەزدەکەم بێم و کارەکانت ببینم، ئێستا وا ناسیمیت. دەبێ بێم و بزانم چی دەکەیت؛ نیگاری چی دەکێشیت. بێگومان جگە لەو کارانەی پیشانی خەڵکی دەدەیت؛ کاری تریشت هەیە. دەبێ هەموو ئەو کارانەم پیشان بدەیت". ئەویش بە شەرمێکەوە سەری ڕادەوەشاند و جارجاریش لەژێر لێوەوە دەیوت: "من هەرچیم هەیە هی تۆیە. فەرەنگیس، وەرە بۆ ماڵەوە بۆ لام، کەس وەکو تۆ نەیتوانیوە کارم لێ بکات.. تۆ.. تۆ.. باشیت.. تۆ ئازیزیت".

"بەم وشانە، بەم وشانە هەستی خۆشەویستیی خۆی بۆم دەردەبڕی. منیش ئیتر چیم دەویست؟ ئەو کلێپەیەی کە هەردووکمانی سووتاند؛ بوونمی تواندەوە. من شاژنی عەرش بووم. لە دونیایەکی دیکەدا بووم. دونیایەك سەراپا مۆسیقایەکی پەتی بوو. ناسکی و جوانی بوو، هەستم دەکرد لە شادیدا بوونم مەحف بووە. دەستیم دەگرت، سەری پەنجەکانیم ماچ دەکرد، دەموت: "من ئەم دەستە دەپەرستم کە ئەو شاکارە نەمرانەی خولقاندووە". بەڵام ئەو دەرفەتی

قسەکردنی نەدەدام و منی دەگرتە ئامێز و ئاگای لەو ڕێبوارانە نەمابوو کە لە دوورمانەوە تێدەپەڕین.

"ئاخ، شتەکانی ئەو شەوە ناگێڕرێنەوە. ئەو شتانەی کە هەرگیز دووپات نەبوونەوە. لەبەرئەوەی گەورەیی ئەو، جۆش و خرۆشی عیشقی ئەو، بەسەر هەموو شتێکی مندال زال بوو، سێبەری منیش لە ڕووناکیی پیرۆزی ئەودا ون بوو. بە تەنها ئەو ساتانە دەرفەتم بە ڕابوردووی خۆم نەدا، بەو ڕابوردووەی بەردەوام ناو دلم دەکێلێت. بۆ تاوێك لەزەتی ئەو ساتانەم چەشت و ئاسۆی دەرەوشاوەی ئایندەم بە چاو بینی.

"قەرار بوو بەیانیی ڕۆژی داهاتوو بچم بۆ ماڵەوە بۆ لای، بەڵام وەختێ منی گەیاندەوە نزیك ماڵەوە، وتی: "سبەینێ دێیت بۆ لام؟" وتم: "بێگومان دێم". پرسیی: "کەی دێیت؟" وتم: "هەر کاتێك تۆ حەز بکەیت". وتی: "چاوەڕێی تەلەفۆنم بە. قەرارمان سبەینێ بێت. بەڵام من سەعاتی یەکتربینینمان دیاری دەکەم". پرسیم: "ئەی بۆ ئێستا دیاریی ناکەیت؟" وتی: "حەز دەکەم کاتێك ماڵەوە بێوەی بوو ئینجا بێیت. ئەوەشت لە یاد نەچێت ئەگەر شتێکیان لێ پرسیت؛ ئەوا دەڵێیت کە من ناناسیت و تەنها بۆ ئەوە هاتوویت تا وێنەت بکێشم". پرسیم: "جا بە ڕاستی دەتانەوێ وێنەم بکێشن؟" لە وەڵامدا وتی: "زۆر حەزم دەکرد وێنەیەکتم بکێشایە". وتم: "کەواتە وێنەم دەکێشیت؟" وتی: "جا دەتوانم؟" وتم: "بۆ ناتوانیت؟" وتی: "من تا تۆ نەناسم، چۆن دەتوانم وێنەیەك بکەم لەتۆ بچێت؟" وتم: "من هی تۆم". وتی: "من لە چاوەکانی تۆ دەترسم. بەسەر مندا زاڵن". وتم: "من لە تۆ دەترسم". وتی: "بۆچی؟" وەڵامم نەدایەوە. نەمویست لە دەستی هەڵێم. دەستی گرتم و ناولەپمی ماچ کرد و منیش بە پەلە بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتمەوە.

"دایکم لەسەر بەرماڵەکە دانیشتبوو. کتێبی "زاد العماد"ی بە دەستەوە بوو؛ کە هەر لە مناڵییەوە بەو کتێبە ئاشنا بووم. لەژێر سەرپۆشە سپییەکەی نوێژکردنیدا؛ تەنها دەموچاوی بە دەرەوە بوو. کەوتبووە سەر ئەژنۆ. سەری بۆ

خـوارەوە دەچـەماندەوە. لێوەکـانی دەجووڵانـدەوە. هەرکـە منــی بینــی، ســەری ناڕەزایی ڕاوەشاند و، وتـی: "تا ئەم شەوە درەنگە! دەزانیت کە باوکیشت لـێرە نەماوە. ئاخر کچم من لە تەنیاییدا دیق دەکەم". دەستی دایە ئەو ڕۆژنامەیەی لای بەرماڵەکەیـەوە بـوو و وتـی: "سـەرۆکی ئاسایشـیان گۆڕیــوە. ســەرتیپ ئـارامی خۆمانیان کردووە بە سەرۆکی ئاسایش. شتێك بۆ باوکت ناکەیت تا لەومەنفایـە بیگەڕێننەوە؟" تاقەتی گوێگرتنی ئەم قسانەم نەبوو. ڕێك بەرە و ژوورەکەی خـۆم چـووم و هەرچـەندە فـزە سـوڵتان هـات تـا بـۆ نـانی ئێـوارە بمباتـە ژوورەکـەی خوارەوە، نەچوومە ژێر بارو نیوە گیان چوومە ناو پێخەفەکەوە و لێی درێژ بووم.

"ئاغای چاودێر، هەندێ شت هەن بە وشە ناوترێن. هەندێ شت هەست پێ دەکەیت دەمارەکانت دەتاشن، دڵت دەکەن بە ئاو، بەڵام وەختێ دەتەوێ تەعبیریان لێ بکەیت بێ ڕەنگ و ڕوو دێنە پێشچاو. ڕێك وەکو ئەو تابلۆیەی قوتابیەك لەسەر کارێکی مامۆستا دەیکاتەوە. هەر هەمان تابلۆیە، بەڵام ئەو ڕۆحەی تێدا نییە، ئەو شتەی تێدا نییە کە دڵی تۆ دەگوشێت.

"چەند حەزم دەکرد ئەو شتانەتان بۆ بەرجەستە بکەم کە ئەو شەوە هەستم پێکردن. چیم بەسەر هـات. هەڵـەکانی ڕابـوردووم یـەك یـەك بـە بـەرچاومدا ڕەت دەبـوون. گاڵتـەیان پـێ دەکـردم، قسـەی ناشـرینیان پێـدەوتم، بـە قەشمەرییــەوە دەیانڕوانییـە خۆشەویسـتییەکەم. شکسـتخواردووەکان، دۆڕاوەکـان، فرسـەتیان بـوو، لـەوە دەچـوو بڵێــن: "قــورس مــەیگرە. ئەمەشــیان هــەر ئارەزوویــەکی ســاتەوەختییە". ســیمای خــەمباری دۆنـاتێللۆ، وەختــێ شــەپۆلەکان حاڵــەتی سروشـتیی ئــەویان شـێواندبوو، هاتــە بــەرچاوم، ئـاگری ســووری جگەرەکــەی لەملاولای شەپۆلەکانەوە دەهات و دەچوو و ناگەهان تەواوی ڕووی دەریاچەکـەی تەنییەوە. دێوانە ئاسا قاقا پێکەنی و وەکو شێتێك کۆتەکەی پچڕاندبێت لەدەست من هـەڵدەهات و هاواری دەکرد: "تۆ، تۆ باسی خۆشەویستی دەکەیت؟" ئینجـا قسەکانی دایکم دەربارەی سەرۆکی ئاسایش ئەوەی بیرخستمەوە کە چەند حـەزی دەکرد ببیتە میردم. لە هەموو ئەمانە ترسام. دەموچاوی خۆم لەنیو بالیفەکەدا ون

کرد، هەلدەلەرزیم، هەستم بە سەرما کرد، هەموو لەشم گرژ بوو بوو. هەلدەستام، کتێبم دەخوێندەوە.. خەو لە چاوم نەدەکەوت. ماندوو دەبووم و هەرکە هەولم دەدایەوە بخەوم، هەمدیسان ئەو تارماییە ترسناکانە ریز دەبوونەوە و نەیاندەهیشت ئارام بم. سیمای پەریشان و توورەی خوداداد ئامۆژگاریی دەکردم. بەلام نەرم نەدەهاتە پیشچاوم. ئەویش هەرەشەی لی دەکردم. وەك ئەوەی پیم بلیت: "تەماشەکە میهری چۆنە!" لە هەمووشیان لاسارتر ئەو کورە فەرەنساییە رۆماننووسە بوو کە بەهەر نرخیك بوایە دەیویست ببیت بە میردم. پیم وتبوو کە من نیشتمانەکەی خۆمم خۆشدەویت و ناتوانم لەگەل ئەودا ژیان بەسەر بەرم. ئەم کورە کە بەردەوام دەستی لە گیرفانی راستی چاکەتەکەیدا بوو توند و تیژانە دەجوولایەوە و بە سیمایەکی هەرزەییانەوە بە من پیدەکەنی و دەیوت: "کویی نیشتمانەکەت خۆش دەویت؟" ئەو دوو رۆحە بە یەك دوژمنەی کە لە رۆژی گەرانەوەمەوە بۆ ئیران لە بوونمدا خەفە بووبوون؛ سەرلەنوێ زیندوو بوونەوە، یەکیکیان دەیوت: "نەکەی بچیت بۆ مالی ماکان. ماکان نیگارکیشیکی بەتوانایە، هونەرەکەشی کردووە بە قوربانی گەیشتن بە پلەوپایە. سەری سەودای ئەو هەلوەدای سامان نییە. ئەو تینووی ناوبانگە. نەکەی بچیت بۆ لای. هەمووی چەند رۆژێك زیاتر لەگەلتدا نابێت. ئەوسا چی دەکەیت؟" ئەوی تریان وەلامی دەدایەوە: "شیرینیی خۆشەویستی لەم دوو دلییەدایە. برۆ بۆ لای، برۆ یاریدەی بدە.."

"ئاخ، چەند پەرت و بلاو دەدوێم! بروابکەن تەواوی ئەو شەوە نەنوستووم. خەیالاتی جۆراوجۆر، ترسناك و فریودەر، ئومێدبەخش و تاریك، دلدەرەوە و هەراسانکەر، پەی دەرپەی منیان لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر پەرت دەکرد. نەمدەزانی چی بکەم، نەمدەتوانی بریارێك بدەم. ئەمەیان بەلامەوە بەلگەنەویست بوو کە ئەگەر سبەینێ بۆ مالیان بچوومایە؛ ئیدی دەبوایە بەرگەی تەمەنێکی ژیانی پڕ چەرمەسەریم بگرتبایە. دەموت کە من شایانی ئەوە نیم لەگەلْ ئەودا بژیم. من ناتوانم پێ بە پێی ئەو لە تێکۆشاندا بەردەوام بم. دەرئەنجام لە نیوەی

ڕێدا دەبمە بەربەست لـە بـەردەم ئەویشـدا. ئـەویش کەسـێك نییـە دەسـبەرداری ڕێگاکەی خۆی بێت. ئەوسا بمەوێ و نەمەوێ دەبمە نێچیری عومرێکی پڕ ئازار و ئەشکەنجە. بەڵام ئەی ئەگەر سبەینێ نەچم، چی بکەم؟ ئایا پەشیمان نابمەوە؟ لە دوو سبەیەوە چۆن وەڵامی خۆم بدەمەوە؟ ئەمەشیان هەر بەدبەختییە. ئەمەشیان هەر بەلەنگازییە. بڕیاری هیچم پـێ نـەدەدرا. توانـای بڕیـاردانم نـەمابوو. سێڵاوی ڕووداوەکان منیان لەگەڵ خۆیاندا برد.

"ئەوەشـتان لـەیاد نـەچێت کـە خوازبێنیکـەرەکان دەسـتیان لێ هەڵنــەدەگرتم. واتەواتی ئەمانەش لەولاوە بوەستێت. یەکێ لەوانە بە ئۆتۆمبیلێکی شۆفەرلێتەوە هەموو ڕۆژێك لە بەردەمماڵەکەماندا دەوەستا. واقوڕماوانە بە سیمای گێلانەیەوە سـەیری دەکردم. مـن خـۆم هێنـدە گـیروگرفتم هـەبوو کـە نـەمدەتوانی بایـەخ بـەو تەڵەکەبازە بۆینباخ بەستووانە بدەم. ڕۆژێکیان چەند ئافرەتێك کە دەموچاویان بە پــۆدرە و سووراووســپیاو ســواغ دابــوو، قــاپووتی فــەروویان لەبــەردا بــوو، پەنجەکانیان پڕ لە ئەنگوستیلە بوو، خۆیـان کـرد بـە ماڵمـاندا. تاقە سـەیرکردنێك بەس بوو بۆ ئەوەی بیانناسم. ڕامکرد و چوومە لای دایکم و وتم: "خـانم گیـان، خۆشـی لـە خـۆت، هـاتوون بـۆ خوازبێنیـی کچەکـەت". لـە خانەوادەیـەکی بازرگـان بوون کە هێڵی ئاسنینەکە سەرتاسەر موڵکی ئەوان بوو. لە زەبنوورەکخانە بوون و پاشان چوونەتە خیابانی پەهلـەوی. سـەرەتا باسـی ڕێکوپێکـیو پاکیزەیی منیـان کرد. دەیانوت: "ئەم کچە کە بە ڕێدا دەڕوات سەری بەرز ناکاتەوە". هەرچەندە دایکم دەیویست تێیانبگەیـەنێت کە وا نییە، بەڵام ئەوان دەسبەردار نـەدەبوون. کاتێ دایکم دەیوت "کچەکەم دەیەوێت شوو بە پیاوێکی ڕۆشنبیر بکات". وەڵامـی حازربەدەستیان ئەوە بوو: "زۆر چاکە خانم، کوڕەکەی ئێمە بەکالۆریۆسی هەیـە". ئینجا دایکـم دەیـوت: "ئـاخر ئـەو تـا خـۆی کەسـێکی نـەوێت؛ هـەڵینابژێرێت". وەڵامەکـەیان ئـەوە بـوو کـە "بێگومـان ئەمـە شـتێکی ئاشکرایە. ئێـوە ڕێ بـدەن تـا پێکەوە هەڵسوکەوت بکەن و، بۆ سینەما بڕۆن، تا زیاتر یەك بناسن".

"یەکیکی دیکە؛ دایکی لەگەل دایکمدا پیکەوە بۆ کەربەلا سەفەریان کردبوو. ئەم کورە ماوەیەك لە فەرەنگستان بووە و ئیستا شەهادەی لە دروستکردنی بادەدا هەیە و لە وەزارەتی کشتوکال پشکنەری تایبەتی بوو. دەعوەتی دەکردم، بۆ شەونشینییەکانی یانەکانی تارانی دەبردم. منیش نەك بە تەنها جوانترین ئافرەتی ئەو ئاهەنگانە بووم؛ بەلکو شیکپۆشترین و بە زەوقترینیشیان بووم. لەگەل ئەمانەدا بە زمانی خۆیان دەدوام. رۆژیکیان باولی جلەکانی خۆمم پیشان دا و وتم: "ئەها.. تەماشاکەن، چەند جلوبەرگم هەیە، پیلاوی جۆراوجۆر، پالتۆ، هەرچییەك کە دلم پیوەیەتی. ئیوە لەکوێ دەتوانن هەموو ئەم شتانە بۆ من بکرن؟" نزیکەی بیست جۆر عەتر و سووراو و سپیاوم پیشاندا. کابرا سوورهەلگەرا و ئیدی سەری بە مالماندا نەکردەوە. من دەمزانی ئەو ئەمە چۆن لیکدەداتەوە. بەلاّم بەلای منەوە ئەوە چ بایەخیکی هەبوو؟ ژیانی من دوور لە تەوەری ژیانی ئەو دەسوورایەوە. یان دەبوایە ئەو ژیانەم هەلبژاردبایە یان ئەمەی کە ئیستا تییدام. سییەمیش سەرهەنگیکی خزمی باوکم بوو. ئەوم لە فەرەنساوە دەناسی. با باسکردنی ئەو بۆ دوایی هەلگرم.

"تا سەعات دەو نیوی رۆژی دوایی من هەر لەناو پیخەفەکەمدا تەپاوتلم دا، رەنگم پەریبو، نیگەران بووم، خەوم لی نەکەوت و هەلیشنەسام. دایکم هات و لای پیخەفەکەمەوە دانیشت. دەیویست بزانیّ بۆچی وا نائارامم. ئاخ، چەند باش بوو گەر باوکمیان دوور نەخستایەتەوە. بەو هۆگرتر بووم. هیچ نەبووایە خۆشیم لەوە دەبینی کە سەرم بخەمە سەرشانی و تیر بۆ خۆم بگریم و ئەویش ئەوەندە هۆی خەم و بیزارییەکەمی لی نەدەپرسیم. بەلاّم دایکم لەو ئافرەتە قەدیمانە بوو کە لەو بروایەدا بوو وشەی خۆشەویستی تەنها لە کتیبەکەی حافزدا هەیە. ئەو لە لیکدابران و ژووان نەدەگەیشت. بەلای ئەوەوە لە دونیای دەرەوەیدا جگە لە ژیانی لەگەل باوکمدا شتیکی دیکە نەبوو. باوکیشم کابرایەکی کەمروو بوو و تاقەتی زۆر وتنی نەبوو. بەلاّم دایکم ئەوە تیّنەدەگەیشت کە هەندیّ جار وا پیّویست دەکات مرۆڤ بیّدەنگ بیّت.

"سەعات دوو و نیو زەنگی تەلەفۆنەکە لێی دا. ڕاپەڕیم و هەر بەو کراسی نووستنەوەی کە لە بەرمدا بوو؛ بەرەو هۆڵەکەی قاتی سەرەوە چووم. تەلەفۆنەکە لەوێ بوو. یەکسەر دەنگیم ناسییەوە. وەك هەمیشە ئارام و سەنگین و لەسەرخۆ قسەی دەکرد. بە پێچەوانەی جارانەوە؛ هەواڵی منی پرسی. بە "ئێوە" قسەی لەگەڵدا کردم. پاش گفتوگۆیەکی ئاسایی پرسی: "ئێوە دەفەرموون بێن بۆ لام؟" وتم: "نازانم". پرسیی: "ئەی وا قەرار نەبوو؟" وتم: "بەڵێ، بەڵام ئەمڕۆ ناتوانم، تەندروستیم باش نییە". دەمویست بە هەمان ئەو زمانەی کە لەگەڵ ئەوانی تردا قسەم پێ دەکرد قسە لەگەڵ ئەویشدا بکەم، بەڵام بۆم نەچووە سەر. ئەم پیاوە سیحری لێ کردبووم. وتی: "فەرەنگیس، دەبێ بێیت". وتم: "ئاخر لەوانەیە هاتنەکەم باش نەبێت" وتی: "نەخێر.. باشە". وتم: "لەوانەیە کارێکی چاك نەبێت". ئیتر لێرەدا سست بوو. تۆزێك بێدەنگ بوو. دوای چەند ساتێك وتی: "خۆتان دەزانن. هەقتانە، لەوانەیە کارێکی چاك نەبێت". ئیتر وەڵامم نەدایەوە. ساتێك بێدەنگ بووەوە: "باشە، خواحافیز". بەلای ئەوەوە تەواو بووبوو. من دڵنیا بووم کە ئیتر مەسەلەکە لای ئەو کۆتایی پێهاتبوو.

"دوای ئەو گفتوگۆ تەلەفۆنییە دووچاری چ حاڵەتێك بووم؟ لەکوێ بزانم؟ ئەوێك کە هەرگیز قسەی نەدەکرد. ئەوەی توانیم لێی هەڵبکرێنم ئەوە بوو کە چووەتەوە سەر کارەکەی. ڕەنگە هەر ئەو ڕۆژەش بڕیاری کێشانی ئەم تابلۆیەی دابێت، بەم چاوانەوە کە دروستیکردوون. ئەو قسەیەیم بیرکەوتەوە کە وتی: "حەزدەکەم وێنەیەکی تۆ بکێشم و تا نەتناسم چۆن دەتوانم وێنەیەك بکێشم لەتۆ بچێت؟" پەناگەی ئەو کارەکەی بوو. هەر کاتێك دووچاری شکستییەك دەبوو پەنای دەبردە بەر ئاستانەی کارەکەی و ئارامیی بەدەست دەهێنا. ئەمە گەورەترین خۆشبەختییە نسیبی مرۆڤێك بێت لە ژیاندا، بەڵام ئەمجارەیان لەوە دەچێت بەرگەگرتنێکی زیاتری ویستبێت. ماوەیەك بە فڵچە و ڕەنگەکەی یاریی کردبوو. پاشان هەستیکردبوو ناتوانێ هیچ بکات. ئانیشکی خستووەتە سەر ئەژنۆی و سەری خستووەتە نێوان هەردوو دەستییەوە، چەند دەقیقەیەك تێفکریوە و پاشان

گەیشتووەتە ئەم ئەنجامە کە: "هەقێتی، بۆ هیچمان باش نییە". ئینجا لە خۆی پرسیوە: "ئەی کەواتە چاوەکانی چییان دەوت؟" تەواوی ئەم تێڕامان و تێفکرینە نیو کاژێری خایاندووە. پاشان چووەتەوە سەر کارەکەی.

"ئەمە ئەوە بوو کە توانیم لێی دەربهێنم، بەلاّم ڕاستییەکەی لەمە دژوارتر بووە. ئەو کە هیچ شتێکی خۆی لای کەس نەئەدرکاند، لای منیش نەیدرکاند. ئەم وێنەیەی کە بەرامبەرتانە پێچەوانەی ئەوە دەخاتە ڕوو کە من دەمزانی. ئەم پیاوە سێ ساڵی تەواو لە تاراوگەدا بەو تەسەورە هەڵەیە کە دەربارەی من لە خەیاڵی خۆیدا کردبووی ئازاری چەشتووە. بە سێ ساڵ دوای دوورخستنەوەی لە کەلاّت ئەم تابلۆیەی کێشاوە، ئەمەش تاقە کارێکە دوای ڕۆشتنی لە تاران و لە ڕۆژانی دوورخستنەوەیدا کێشابێتی. هەر بەو نیوکاژێر بیرکردنەوەیە بڕیاری خۆی نەداوە و دەسبەرداری بیرکردنەوە لە من نەبووە. من وامدەزانی کە هەر نیو کاژێر بیری کردووەتەوە و ئیدی مەسەلەکەی لەبیر کردووە.

"تەماشاکەن، بەدبەختیەکەی ئێمە لێرەدایە تا هەردووکمان لێك نزیك بووین یەکترمان نەناسی. ئەسڵەن ئەو هەر منی نەناسی. ئەم تابلۆیە دەیسەلمێنێت کە ئەو هەرگیز پەی بە ڕۆحی من نەبردووە. خەتای من بوو. ئەو کە هیچی نەدەوت، خواستی سروشتیی خۆی بەجێدەهێنا. هونەرمەند ئازارەکانی خۆی لای هەموو کەسێك نادرکێنێت، قسە ناکات، ئەو شتەکانی خۆی لە ڕێی ئاسەوارەکانییەوە دەردەبڕێت. بەلاّم من دەمتوانی بەو بڵێم کە بۆچی یەکەم جار لە تەلەفۆنەکەدا بەو جۆرە وەلاّمم دایەوە و پاشانیش بە پێچەوانەی ئەوەوە ڕەفتارم کرد.

"بێ بیرکردەوە یەکسەر تەلەفۆنەکەم دانایەوە و چوومە ژێر دووشەکە و خۆم شت. پاش چەند دەقیقەیەك بە هێمنی لەسەر کورسییەك دانیشتم و خەریکی ئارایشتی خۆم بووم، نەك بەو مەبەستەی کە بۆ لای ئەو بچم؛ لە ناخمدا هێزێکی بەهێزتر لە ئیرادە و دەسەلاّتم هەبوو هانی دام ئەوە بکەم. لەوە دەچوو خۆم بۆ کۆڕێکی ڕەسمی ئامادە بکەم کە وتاری تێدا بخوێنمەوە. قژم لە ناوەڕاستەوە کرد بە دوو بەشەوەو لەملاولای سەرمەوە بەستمن و چاکەتێکی ڕەشم لەبەر کرد. لە

ئاوێنەکەدا هەر ئەوم دەبینی. دانیشتبوو نیگاری دەکێشا. پالێتەکەی بە دەستەوە بوو. ڕەنگە جۆراوجۆرەکان، ڕەنگی زەق و ڕەنگی ناشرینی بە چەقۆیەك تێکەڵ بەیەك دەکرد. بیرم لەوە کردەوە کە دەرگای کارگەکەی بکەمەوە و خۆم بە ژوورەکەیدا بکەم، چیم پێ دەڵێت. بێگومان هەڵدەستێت و باوەشم پێدا دەکات و ئەوەندە ماچم دەکات تا هەناسەم سوار دەبێت. نا.. ئەمەیانم پێ خۆش نەبوو. بیرم لە شتێکی دیکە کردەوە. تەلەفۆنی بۆ دەکەم و پێی دەڵێم دێم. سەری سوور نامێنێت؟ لەو دوودڵی و ڕاراییەی من واقی وڕنامێنێت؟ بەلام ئەو لەگەڵ خەڵکی تردا جیاوازە. ماکان دەبێ ڕێز لە من بگرێت. نابێ بزانێ من کێم. من کە لە هەموو کەس زیاتر هەست بە لاوازییەکەی خۆم دەکەم. ئەگەر ئەویش بەو جۆرە من بناسێت، ئیدی من هیچ نرخێکم لای ئەو نامێنێت. ناڕۆم. بەلام باشە ئەی بۆچی بەم نیوەڕۆیە خۆم گۆڕیوە؟ چی بە دایکم بڵێم؟ بڵێم بە میوانیی کێ دەچم؟

"سەعاتێکی تەواو خەریکی دەموچاو و جلوبەرگەکەم بووم. لە هەمانکاتدا ناوەوەم یەك پارچە ئاگر بوو. لەگەڵ خۆمدا دەجەنگام. نەمدەزانی چیم دەوێت. دوو سێ جار لە تەلەفۆنەکە نزیك بوومەوە، تا ئاخریەکەی دەسکی تەلەفۆنەکەم هەڵگرت و ژمارەیەکم لێ دایەوە.ئەمجارەیان نەمتوانی قسە نەکەم. هەر کە دەنگیم بیست، وتم: "ماکان، بڕیارەکەم گۆڕی، دێم". وتی: "وەرە!" بێئەوەی هیچ بە دایکم بڵێم، لەماڵ چوومە دەرێ. ئەو بەسزمانە بەم هەموو چوونەدەرەوانەی من ڕاهاتبوو، بەلام ئێستا و دوای دوورخستنەوەی باوکم و بەبێ ئەوەی ئاگای لە کاری سیاسی من هەبێت دەترسا. نەمدەویست مشتومڕی لەگەڵدا بکەم. لای دەرگاکەوە بە فزە سوڵتانم وت: "نیوەڕۆ دەعوەتم. چاوەڕێی من مەکەن". پیرەژن وتی: "خوا ئاگای لێت بێت"

"لە ڕێگا وەها بە پەلە دەڕۆیشتم کە دەتوت لە گێژاوێکدا گیرمخواردووە و ئەمە تاقەڕێی ڕزگاربوونمە. گومانم لە هەموو کەسێك دەکرد. هەر کەسێك سەیری دەکردم، لێی دەترسام. هەموویانم لێ بووبوو بە پیاوانی دائیرەی ئاسایش. وام هەست دەکرد هەموو دەستیان خستووەتە ناو دەستی یەك تا جامی هەنگوینی

خۆشحالیی من بشکێنن. ماڵەکەی لە پشت مزگەوتی سوپەهسالارەوە بوو. هێشتا لە دەرگام نەدابوو، ئاغارەجەب منی بە حەوشەکەدا کرد. لەوپەری حەوشەکە؛ بەرامبەر خۆرەتاوەکە، پیپلیکانەیەك هەبوو بۆ هەیوانێك دەچوو کە لاولاو تارمەکانی پۆشیبوو. ئاغا رەجەب بە بێئەوەی سەیرم بکات؛ وەکو داریك کە جلیان کردبێتە بەر و، بە سیمایەکەوە کە بچووکترین کاردانەوە رۆحییەکانی پیشان نەدەدا، لە لایەکەوە وەستابوو بە دەستی ئاماژەی بۆ پیپلیکانەکان کرد. دوو منالی بچووك لە حەوشەکە و لەبەر هەتاوەکە یارییان دەکرد. یەکێکیان سواری پاسکیلیك بوو بوو و ئەوی تریشیان پالی پێوە دەنا. لە یەکێك لە ژوورەکانی دەستەراستدا، ئافرەتێك کە شەروالیکی رەشی لە پێدابوو، کۆمەلیك قاپی چینیی وشك دەکردەوە. لە هەمانکاتدا، دەرگای هۆدەی سەرەوەی هەیوانەکە کرایەوەو، ئەو کە پالیت و فلچەکەی بە دەستیکەوە گرتبوو تا لای پیپلیکانەکان هات. بە دەستی راستی ژێر بالی چەپی گرتم و منی بۆ ژوورەکەی برد.

"من دەبی هەموو شتەکانت ریك و رەوان پی بلیم تا بزانیت من چۆن دەتوت لەسەر ئاگرم. تا بزانیت ئەو چۆن بە بێئەوەی بە خۆی بزانیت وەکو پشیلەیەکی بچووك کە یاری بە کلکی دەکات؛ ئاوەها رەفتاری لەگەڵدا کردم.

"من چاوەڕێی ئەوە بووم هەر ئەوەندە خۆم بە ژوورەکەیدا کرد بێت و باوەشم پیا بکات و لێوەکانم بە ماچ داخ بکات و منیش رووی خۆم وەربگێڕم و ڕێی نەدەم ماچم بکات. بۆچی ڕێی نەدەم؟ تاکو دەسەلاتی خۆم بەسەریدا زاڵبکەمەوە. لە کاتێکدا من تامەزرۆی ماچەکانی ئەو بووم، حەزمدەکرد بە لێوەکانی ماچبارانم بکات؛ حەزمدەکرد تامی گەرمیی جەستەی بکەم، حەزمدەکرد ئەوەی لە ژیاندا ئاواتم بووە و هەرگیز پێی نەگەیشتووم؛ لە ئامێزی گەرمی ئەودا هەستی پێ بکەم. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بۆ سەلماندن و پاراستنی توانای کەسێتیم ئەو بڕیارەم دابوو. نەمدەویست پەی بەوە بەرێت کە وەکو بووکەشووشەیەکی بێئیرادە هێزێکی نائاسایی منی بەلای ئەودا ڕاکێشاوە. ئەو ئارام بوو. ئایا هێندە

شڵەژابوو کە پڕکێشیی خۆی لەدەست دابوو، یان ئەویش ترسابوو؟ لەوە دەچوو تەلەفۆنەکەی من کاری خۆی کردبێت و ئەوی هێنابێتەوە هۆش خۆی. ئاخ، ئەو ڕۆژانــە وامدەزانــی مامۆســتا پیــاوێکی ئاقڵــەو تــا خــێر و شــەڕی کــارێك هەڵنەسەنگێنێت دەستی ناداتێ. بیربکەنەوە.. من.. منێـك کـە بـە چـاوداگرتنێك سەدان لاوم دەهێنایە سەما، ناچار بووم بۆ ماچێك سواڵی لێ بکەم.

"منـی بردە ژوورەوە. هێمن دەهاتە پێشچاو. ژوورێکی سادە بـوو. کەلوپـەلی ژوورەکـە بریتـی بـوو لـە دوو کورسـی و مـێزێکی خـڕ. لەسـەر مـێزێکی بچـووك گوڵدانێکی پڕگوڵ دەبینرا. منی لەسەر کورسییەك دانیشاند. خۆشی لە نزیکمەوە دانیشت. چەند ساتێك لێم وردبووەوە. ئینجا پرسیی: "بۆچی ویستتان نەیەن؟" وتم: "لەگەڵ خۆمدا لە جەنگدا بووم". پرسیی: "ئەی لە کۆتاییدا کێ بردییەوە؟" وتم: "ئێوە". وتـی: "ئێوە لەگەڵ خۆتاندا لـە جـەنگدا بـوون نـەك لەگـەڵ منـدا". هەموو هونەرەکانی دڵڕفێنیم لەیاد چووەوە. ئیدی ئەو نیگایانەم نەما کـە دڵـی خـەڵکانی لـە ڕیشـە دەکێشـا. هـەرچی قسـەی لووسـە لەسـەر زمـانم وشـك بـوو. زەردەخەنەم لەبیر چووەوە. بە لاوازی و شکستییەوە تەماشای ئەوم دەکرد. یەك وشەی تری لە زار بهاتایەتە دەرەوە قورگم پڕ دەبوو لە گریان، بەڵام باش بوو ئاغا ڕەجەب منی لەو گێژاوە ڕزگار کرد کە لە هەیوانەکەوە دەنگی پێی هات.

وتم: "کارەکانتــان کــوان؟" وتــی: "کارەکــانم زۆر نــین. زۆربەشــیانم تــەواو نەکردووە. حەز دەکەن ئێستا تەماشـایان بکـەن یـان دوای نـانی نیـوەڕۆ؟" وتم: "ئێستاش و دوای نانی نیوەڕۆش". وتـی: "سەبرکەن، ڕەجەب ئیشت هـەبوو؟" ئاغا ڕەجەب بە سیمای دەمامکدارییەوە هاتە ژوورەوە و وتـی: "نـەخێر قوربـان" مامۆستا وتی: "گوێ بگرە ڕەجەب، هەرکەسێك هات من لەماڵەوە نیم. فەرەنگیس خانم دەناسن. هاتووە وێنەی بکێشم". وتی: "بەڵێ ئاغا" مامۆستا بەردەوام بوو: "هەرکەسێك پرسیاری لێ کردی وا وەڵامی دەدەیتـەوە". وەڵامـی دایـەوە: "بـەڵێ ئاغا". مامۆستا وتی: "کاری ترم نییە". ئاغا ڕەجەب پرسیی: "حـەز دەکـەن کـەی نانی نیوەڕۆ بخۆن؟" مامۆستا وەڵامی دایەوە: "ئێمە ئێستا دەچینە نیگارخانەکە.

تۆ سـفرەکە ئامـادە کـە. ئیمـە خۆمـان وەڵامـت لێ دەگێرینـەوە". ئینجا چووینـە ژووری نیگارخانەکەیەوە.

"تابلۆ گەورەکەی "جەژنی چارشیولادان" ئەو دەمە هیشتا تەواو نەبووبوو و خـەریکی هـەندێ تـابلۆ بـوو دەربـارەی چوارینـەکانی خـەیام. "مـالی رەش و رووتەکان"یش کە دواکاری بوو لە تاراندا؛ خەریکبوو تەواو دەبوو.

"مـن لـەو هـەموو توانـا نائاسـاییەی واقـم ورمـا. ناکـاو خـۆم لـە دونیایـەکدا بینییەوە کە ئاواتەخوازی بووم. بە حەپەساوی و دلیکی پر لە خەمەوە ماوەیەك لییان وردبوومەوە. مامۆسـتا لای دەرگاکـەوە بـە پشـتی سـەرمەوە وەسـتابوو و هەستم بە گەرمیی نیگاکانی دەکرد. سیحری ئەم نیگارانە منیگرت. هەستم بە ونبوون کرد. مـن لـە ئەوروپا کـەمتازۆر کـاری مامۆسـتا گـەورەکانم بینیبـوو. لـە ئیتالیا جوانیی تابلۆکانی لیۆناردۆ داڤنشی و رافائیل مرۆڤ سەرسام دەکات. کارەکانی قوتابخانەی فەرەنساییم خۆشدەویست. لە میونیخ کارەکانی رامبرانت و دۆریم دیبوو. بەڵام ئەوەی بۆ یەکەمجار لە نیگارخانەکەی ئەودا بینیم پتر کاری لە من کرد. نەك لەبەرئەوەی کە مامۆستا هونەرمـەندیکی لـەوان گـەورەتر بـوو؛ نەخیر. بەلکو لەبەرئەوەی ئەو شتانەی لە کارگەکەی ئەوا بینیمن؛ بەشیك بوون لە رۆحی خۆم. ئەو شتانەی مامۆستا لـە تابلۆکـانیدا کێشـابوونی؛ بـە زمـانی مـن قسەیان دەکرد. لەزمانی من دەگەیشتن، بە چاوی من نیگایان دەکرد، من ئەوانم دەناسی و لە ئازارەکانیان دەگەیشتم. جۆرە ئاشنایی و هۆگرییەك باڵی بەسـەر ئەو تابلۆیانەدا کێشابوو. بەلای منەوە ئەو رووداو و بەلایانەی کە لە وێنەکاندا بەرجەستە کرابوون، لە یەکەم تەماشاکردندا سەرنجیان ڕادەکێشا. پتر ئەوەم پێ خۆش بوو کە ئەو کەسانەی ئەو رووداوانـەیان بەسـەردا هـاتبوو، لـە کەسـان و نزیکان و هاونیشتمانەکانی خۆم بوون. ئەوەی ئەوان پێوەی دەتلانەوە، کەمتازۆر هەمان ئەو شتانە بوون کە بەسەر منیشدا هاتبوون یان دەهاتن. تابلۆی "جەژنی چارشێولادان" تـازە هێڵکارییەکـەی کرابـوو. بـەڵام سیمای ئافرەتەکە بـەو بـارە پێکەنیناوییەوە لـە تـەواوبووندا بـوو. یەکسـەر دایکـم بیرکەوتـەوە، دایکـم، هـەر

ئـەوەندە تۆزێـك بارودۆخەكـە تێكچـوو ، لـە ئـێران ڕایكـرد و چـوو بـۆ كەربـەلا و ویسـتی لـەوێ نیشـتەجێ بێـت.پووریشـم هـەروەها. وەزیـری كاروبـاری ئـاینی ویستبووی دەستی پوورم ماچ بكات كە هەمیشە خەریكی تەزبیحات بوو. تەواوی ئەم دیمەن و كەسانە هەریەكە و بە جۆرێك بە منەوە پەیوەست بوون و من هەستم كرد ئەو بەهەشتەم دۆزیوەتەوە كە بەدوویدا وێڵ بووم.

"هەمدیسان ئەو بەدبەختییەی خۆمم هاتەوە یاد كە بە هۆی ئەم پیاوەی كەوا لە پشتی سەرمەوە وەستاوە تووشی بووم. ئەو ڕۆژەی كە بۆ یەكەم جار بینیم ئەگەر ڕێنومایی بكردمایە؛ لەوانە بوو منیش ئەمڕۆ بەختەوەر بوومایە. گەڕامەوە و بە نیگایەك كە تەواوی ئەو تاسەیەی منی لەخۆ گرتبوو، سەیرم كرد. پرسیی: "چییە؟ بۆچی وا سەیرم دەكەیت؟" دوو سێ هەنگاو لێم نزیك بووەوە. دەستم كردە ملی و وتم: "ماكان، حەزم دەكرد وەكو تۆ نیگاركێش بوومایە". دەستی بە قژمدا هێنا. پاشان بە هەردوو دەستە گەورەكەی ڕوومەتەكانمی گرت، لە چاوەكانم ورد بووەوە. تاوێك لێوەكانی لەرزین، وەكو ئەوەی بەدوا كۆمەڵێك وشەدا بگەڕێت كە لێی ون بوون. تەنها چاوەكانمی ماچ كرد و هیچی نەوت. دەیتوانی چی بڵێت؟ ئایا پێویستی دەكرد ئەوەی پێنج ساڵ لەوەوبەر بەبێ وشە تێیگەیاندم هەمدیسان بیڵێتەوە؟ بەڵام ئەوەی دەزانی كە چیتر من ئەو كچە هەوەسبازە هەڵەشەیەی ئەو ڕۆژە نیم، ئەمەی دەزانی.

"ئاغای چاودێر، ئێوە نازانن وەختێ سەودای داهێنان لەسەرت دەدا، بەڵام لە توانا و بەهرە بێبەشیت، چۆن نائومێدی ڕێی خۆی بۆ ناخت دەكاتەوە و تێیدا لانە دەكات.

"لەسەر ستوولێك دانیشتبووم و ئەو لەلامەوە ڕاوەستابوو. لە لایەوە هەستم بە جوانی و بەختەوەرییەك دەكرد كە لە دووتوێیدا تامێكی تاڵ خۆی حەشار دابوو. ناكاو دەستی بە قسە كرد. بە هێمنییەوە، وەك ئەوەی لە پێشدا ڕستەكانی لەبەر كردبێت و بیەوێت بیانخوێنێتەوە، وتی: "دەمەوێت شتێكت پێ بڵێم كە ڕەنگە بەلاتەوە تازە بێت. ڕەنگە نەشتوانی تێبگەیت.. یان نەتەوێ بیزانیت، بەڵام من ناچارم پێت بڵێم؛

لەبەرئـەوەی نامـەویَ کچێکـی لاوی وەکـو تـۆ هەڵخەڵـەتێنم. چارەنووسـی مـن لەگـەڵ چارەنووسی ئەم وڵاتەدایە. تازە بەلای منەوە بەختەوەریی تاکە کەسی نەماوە. گـەرتۆ بتەویَ ژیانی خۆت بە ژیانی منەوە ببەستیتەوە؛ بەدبەخت دەبیت". وەکو ئەو منالآنـەی کە وانەکانیان لەبەر نییە زمانی کەوتە تەتەڵـەکردن. بـەلآم مـن حەوسـەڵەم نـەما و وتم: "دەزانم. هـەرچی ئـەو شتانەی دەتـەویَ بیـانڵێیت مـن بیرم لێکردوونەتـەوە، دەزانم مـن شایستەی تۆ نیم. بەلای تۆوە من منـاڵم، تـۆ هـەموو بیرت لای ئایندەیـە. بـەلآم منیـش دەمـەویَ لـە هـەموو تەمـەنمدا گـەر تەنها بۆ ساتێکیش بێت لـەزەتی ژیـانێکی ڕاسـتەقینە بچێژم. هـەر بۆیـەش هـاتووم و خـۆم فڕیَ دەدەمـە بـەر دامێنـت. مـن دەزانم دوودڵییەکـەم تۆی لە من کردووە. بەلای منـەوە سبەینێیەك نییـە. سبەینێی من تاریکـە. لەگـەڵ تـۆدا تاریکە؛ جا هـەیدیَ بیَ تۆ. بێهوودەیە، قسە مەکە! مـن لـە تۆ زۆر مناڵترم. بریا دەتزانـی چی بەسـەر منـدا هـاتووە. من لـە تەمـەنی خـۆم زۆر گـەورەترم". وتـی: "بـۆم بـاس بکـە، چیـت بەسـەردا هـاتووە". وتم: "ئێـوە بەرگـەی بیسـتنی نـاگرن، دەترسـم لـە بـەرچاوتان بکەوم". وتـی: "لەوانەشە بە پێچەوانـەوە بـیَ". پرسـیم: "پێچەوانەکـەی چییـە؟" وتـی: "پێچەوانەکەی ئەوەیە لەوانەیە نرخی ئێوە لای من زۆر لەوە زیاتر بێـت کـە تەسـەوری دەکەن". وتم: "نا، نا، ئەو شتانە ناوترێن، پیاوان هەموویان ئەم جۆرە قسانە دەکەن".

"ئاغای چاودێر، ئێوە بڵێن، دەمتوانی چیی پیَ بڵێم؟ لە گفتوگۆکانی ئەو ڕۆژەماندا شتێکی تازەی بۆ ئێوە تێدا نییە. ئەوەی پێشبینیم دەکرد ڕاست دەرچوو. ئـەم پیـاوە پـۆڵا بوو. کاتێك لە تەلەفۆنەکەدا دەنگـی منـی بیسـت؛ بڕیـاری خـۆی دا. ئـەو ڕێـزی لـە هـەموو کەسـێك دەگـرت. ئـەو دەیتوانـی ئـەو ڕۆژە هـەموو شـتێکی لەگـەڵمدا بکردایـە، دەیتوانـی وەکـو کـەنیزەکێك بمکاتـە باوەشـییەوە، بـەلآم خـەمی ئـەو شـتێکی دی بـوو. ئەویش هەمان ئەو شتەی دەویست کە من بە دوایدا وێڵ بووم. ئەو لەزەتی لە جەستەی منـدا نەدەبینییـەوە، بـەڵکو ڕۆحـی منـی دەویسـت و دەترسـا کـە نسـیبی نـەبێت، ئـەو دڵبەرێکی نەدەویست، هاوڕێگایەکی دەویست، یاریدەیەکی لە بوونی من دەویست بـۆ ئەو ململانێیەی کە لە بەردەمیدا بوو. ئەو کەسێکی دەویست وەکو خۆی لەخۆبوردوو بێت و لە هیچ بەلآیەك نەترسێت.

"نانی نیوەڕۆمــان خــوارد. دەربــارەی هــەموو شــتێ دوایــن بــە تەنــها ئــەو خۆشەویستییە نەبێت کە هەردووکمان لە دڵی خۆماندا حەشارمان دابوو. بەڵێ، خۆشەویستیی ئاشکرای ئێمە هەر ئەو شەوە لە کەنار ڕووباری کەرەجەوە، لەژێر دار بناوەکاندا دەستی پێکرد و هەر لەوێش کۆتایی هات.

"تەماشا کەن، ئەمەیە موسیبەتە گەورەکەی ژیانی ئەو. دەزانن ئەو ئاگرەی لەژێر خۆڵەمێشدا دەمێنێتەوە چەند دەوام دەکات؟ خۆشەویستیی نهێنیش وایە، خۆشەویستییەك کە مـرۆڤ پرکێشـی ناکـات هـەرگیز لەگـەڵ هیـچ کەسـێکدا دەربارەی بدوێت، ئیدی لەبەر هەر هۆیەك بێت. کـۆت و پێوەنـدی کۆمەڵایـەتی، جیـاوازیی چینایـەتی، یـان لـە یـەکتر نەگەیشـتن و هـەر هۆیـەکی دی. ئـەم خۆشەویستییە دەروونی مـرۆڤ دەخـوات و دەیسـووتێنێ و لـە کۆتـاییدا وەکـو قوڕقوشمێکی تواوەی ساف و ڕوونی لێ دێت.

"من نەمدەوێرا شتەکانی ناو دڵمی پێ بڵێم. ئەو دەیویست پارێزگاریی من بکات. لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازییەکی گەورە لە نێوانماندا هەبوو. من بە تـەواوی دەسـەڵاتم بەسەر خۆمدا نەبوو، نەمدەتوانی ئەوەی کە لە قووڵایی ناخمدا دەجۆشێت؛ بە تەواوی بیشارمەوە. لە لەرزەی لێوەکانمدا، لە ڕەفتاری پڕ ڕێز و میهرەبانمدا لەگەڵ ئەودا، لەو گوێڕایەڵییە کوێرانەیەمدا لە ئەنجامدانی فەرمانەکانیدا، لە نیگـای چاوەکـانمدا، لـەو تاسە و پەرۆشییەی دایدەگرتم وەختێ ئـەوم دەبینـی، لـە تـەواوی کاروبارەکـانی تـرم لەگەڵیدا، ئەو سەوداسەرییەم بە ئاشکرا پێوە دیار بوو. بەڵام ئەو جۆرێکی دیکە بیری دەکردەوە، جۆرێکی دیکە هەستی نەدەکرد، بەڵام دەیتوانی بەسەر هەموو هەست و سۆزەکانی خۆیدا زاڵ بێت.

گەر کەسێك بەردەوام چاودێریی ئێمەی بکردایـە، بـە تەنـها دەگەیشـتە ئـەو بڕوایەی کە من شەیدای ئەو بووم و ئەویش کابرایەکی دڵڕەقە و بە هیچ جۆرێك ئاگای لە خۆشەویستیی من نییە. هەر بۆیە ئەویش زیاتر لە من ئازاری دەکێشا و ئەم تابلۆیەی کە ئیستاش بەرامبەرتانە، بەلگەی ئەم قسەیەمە.

"ئاخ.. ژیانی من چەند خۆش دەبوو گەر ئەو رۆژە جورئەتم بکردایە و خۆمم بەو بناساندایە، هەر هیچ نەبێ وەکو ئیستا ئیوە دەمناسن.

"تەواوی ئەو رۆژە لای ئەو بووم. هەر لە ژووری نیگارخانەکەیدا بووین. جاری وابوو یەکیك بۆ دیدەنیی دەهات. ئەودەمە ئاغا رەجەب بەسەری پەنجە لە دەرگاکەی دەدا، ماکان بە ریزەوە داوای مۆلەتی لە من دەکرد و کارتۆنیکی دەدامێ کە هیلکارییە جۆراوجۆرەکانی خۆی تیکردبوو، یان گۆڤاریکی دەدایە دەستم کە تیایدا کارەکانی لە ئۆتریش چاپ کردوون و هەروەها چوارینەکانی خەییام کە وێنەی کێشابوون؛ ئینجا دەڕۆیشت. ئیتر من تەنها دەمامەوە، یان خەریکی خوێندنەوە دەبووم و یان خەمم دەخوارد. هەندێ جاریش لە دونیای ئەو وێنانەدا نوقم دەبووم و هیچم بیر نەدەما. تەماشای هێڵکارییەکانیم دەکرد و لە کارە تەواونەبووەکانی لەزەتم دەچەشت. کاتەکە وا خێرا تێپەڕی؛ وەختێ هەوا تاریك بوو، سەرم سوڕما. هەرکە هەڵسام، وتم: "ماکان ئێمە دەبێ کەسی نزیکی یەك بین". بەڵام ئەو وتی: "دەبێ هاورێی یەك بین". مانای قسەکەی لای من ئاشکرا بوو. قاپووتە سپییەکەی دەرهێنا. پرسیم: "دەتەوێ لەگەڵمدا بێیت؟" وتی: "دێم تا بەرێت بکەم". وتم: "با بچین بۆ کەنار رووباری کەرەج". وتی: "سوودی چییە؟ لە نێوان ئەمشەو و دوێنێ شەودا دونیایەك جیاوازی هەیە". وتم: "بەلای تۆوە!" بە هەردوو دەستی توند دەموچاومی گرت، بە نیگایەکی پڕ پاڕانەوە چاوی بڕییە چاوەکانم و وتی: "گەر دەمزانی چی لەم نیگایەی تۆدا هەیە، ئەوسا ئەمشەویش دەبوو بە دوێنێ شەو. وێنەکەشتم دەکێشا" وتم: "یارمەتیم بدە تا خۆمت پێ بناسێنم" وتی: "دەترسم ئەو کاتە بەدبەخت بیت". وتم: "ئێستاش هەر وام" لێوەکانی لێك ناو ئاگایانە یا بێئاگایانە ماچێکی ناوچەوانمی کرد و پاشان پێکەوە لە ماڵەوە چووینە دەرێ..".

"ئیدی شتێکی ئەوتۆ نەماوە بە ئێوەم نەوتبێت. گەر پاش بەسەربردنی سێ ساڵ لە تاراوگە، ئەم تابلۆیەی نەناردایە، لەوانە بوو وشەیەکی دیکەم نەبووایە بیڵێم. گەر ئەم تابلۆیە نەگەیشتبایەتە تاران و من لێی بێ خەبەر بوومایە؛ لەوانە بوو ئاشناییم لەگەڵ ئەم نیگارکێشەدا وەکو زۆربەی ئارەزووە سەرەڕۆکانی ترم کە تا ئەو ساتە بەسەرمدا زاڵ بوون، لە یادم بچوایەتەوە. من کە بەشێکی ژیانی خۆم کردە قوربانی، لە هەموو شتێکی خۆم بووورام، ئەمە پێویستی بە باسکردن نەدەکرد. دڵم خۆش بوو بەوەی یەکجار لە ژیانمدا قوربانییەکم داوە و، بەو خۆ لە ژیان بێبەشکردنە بەختەوەری و سەلامەتیی مرۆڤێکی لەخۆم سوودمەندترم کڕیوەتەوە. بەڵام ئەم تابلۆیە، بەو چاوانەوە کە ئاوا کێشاونی؛ ئیدی ژیانی منی بۆ هەتاهەتایە سەرەونگون کرد.

"دوای ئەو شەوەی کەنار ڕووباری کەرەج و گفتوگۆی دواترمان لە نیگارخانەکەی، گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە ئیتر تەنها لە تاقە ڕێیەکەوە دەتوانم پەی بە کونجەکانی دڵی بەرم. ئیدی نیگا و جوانی و ئارایشت و دڵڕفێنیی من کاری لەو نەدەکرد. هەموو ئەوانە وەك ئەوە بوون بەردێك بە لۆکەدا بکێشێت، بێگومان هیچ کاردانەوەیەکی نابێت، بەردەکەش لەنێو لۆکەکەدا ون دەبێت. من تەنها لە ڕێی کۆشش و تەقەللای پترەوە، لە ڕێی فیداکاریی گەورەترەوە دەمتوانی

جێی خۆم لە دڵی ئەودا بکەمەوە. بەڵام لە هەمان کاتدا هەستم دەکرد چەند خۆشەویستیی من بۆ ئەو و کارکردن زیاتر دەبوو؛ ئەو کەمتر دەرفەتی دەدام تا لە میوەی عیشقی بەرخودار بم.

"لەو ڕۆژە بەدواوە؛ ئیدی هەفتەی دوو سێ جار دەڕۆیشتم بۆ لای. بەردەوام من بیانوویەکم دەدۆزییەوە و دەچووم بۆ لای ئەو، هەمیشە من تەلەفۆنم بۆ ئەو دەکرد و وادەم لێ دەسەند. تەنانەت بۆ جارێکیش چییە دەعوەتی نەکردم؛ بەڵام کاتێك دەچووم بۆ لای، یان بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵدا دەکرد دیار بوو کەیفی پێم دەهات و خۆشحاڵ دەبوو و بە پەرۆشەوە پێشوازیی لێ دەکردم. جاری وابوو ئەو سەرقاڵی کارەکەی دەبوو و منیش دادەنیشتم و تەماشایم دەکرد. جاری واش بوو دەمخوێندەوە، پێکەوە قسەمان دەکرد، دەربارەی ڕابوردووی خۆم بۆم دەدواو منیش هەوڵمدەدا لە قسەکانیدا ئەو تەسەوراتانەی لێ دەربهێنم کە دەربارەی من هەیەتی. جاری وابوو دەربارەی هەندێ کاری ئاسایی قسەمان دەکرد، بە وردییەوە گوێی بۆم دەدێرا. کاتێك دەربارەی کارێك کە مەترسیی تێدا بووایە قسەی بۆ دەکردم؛ هەموو لایەنەکانی ئەو کارەی بۆڕوون دەکردمەوە! سەرنجم دابوو کە هەمیشە و لە گشت کارەکانیدا گەلێ وریا و وردبین بوو. "هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم کە سەرباری خۆشەویستیی بۆ من ئاوەها وریا و وردبین دەبیت. وەختێ بیرەوەرییەکانی رابوردووی خۆی بۆ دەگێرامەوە، لە دەنگیدا ئاوازیکی نەرم و خەمزەدە هەست پی دەکرا. بە وردی ئەوەی بۆ باس کردم کە چۆن ئاغا ڕەجەبی ناسیوە و چۆن لە هەموو کەسیك پتر متمانەی بەو پیاوە هەبووە. بەلای ئەوەوە ئاغا ڕەجەب لە لادێییە تۆکمەکانی هەمەدان بوو و بە مقاشیش شتی لێ دەرنەدەهینرا. بەڵام هەرگیز نەیدەویست و بواری نەدەدام باسی رابوردووی خۆمی بۆ بکەم. دوای ئەو ئاماژەیەی کە ئەو ڕۆژە بۆی کردم و، من جورئەتی درکاندنی نهینییەکانی خۆم نەبوو، ئیتر هەرگیز دەرفەتی نەدامێ؛ مەگەر ئەوەندەی پەیوەندیی بە سەرۆکی ئاسایشەوە هەبووایە. کە گویی بۆ ئەوەش شل دەکرد لە ڕوانگەی بایەخدان بە ژیانی منەوە نەبوو. تەنانەت لەوەشدا هەر بیری

لای کار و وەچنگهینانی سەرکەوتنی خۆی بوو. تەماشاکەن، کاتیك دەلیم کاری خۆی؛ مەبەستم لە خۆپەرستی نییە. ئیتر وردەوردە لە کاروبارە سیاسییەکانیدا وەها بووبوومە ئاشنای کە هەندێ جار لە بەردەمی مندا پرسیاری وای لە ئاغا رەجەب دەکرد و ریی پی دەدا مەسەلەی وەها باس بکات کە ئامادە نەبوو لە بەردەم کەسی تردا ئەوە بکات.

"دوای حەوت هەشت مانگ هاتوچۆم بۆ مالیان، رۆژیکیان کە لە ژوورەکەیدا لای سۆپاکەوە دانیشتبووم، ئاغا رەجەب بە شلەژاوییەوە خۆی کرد بە ژووردا و وتی: "ئاغا، دەقیقەیەك بفەرموونە دەرەوە هەوالیکی پەلەم پییە بۆتان". مامۆستا وتی: "چی روویداوە؟ هەر لیرە قسە بکە". رەجەب بە چاویکی پر ترسەوە وتی: "دوینێ شەو فەرهاد میرزایان گرتووە". مامۆستا پرسیی: "چۆنت زانی؟" وتی: "ئیستا کە چووم بەستەکەی ئیوە بە ئەندام شانەکەی هاوکاری بگەیەنم پیی وتم کە لەوە دەچیت دوینێ شەو گرتبیتیان، یان تووشی مەترسییەك بووە". پرسیی: "باشە چۆن دەزانن گیراوە؟" رەجەب وەلامی دایەوە: "هاوکارەکەی ئەمەی نەدەزانی. من خۆم زانیم". مامۆستا هیشتا هیمن بوو، یان هیمن دەهاتە پیشچاو، لە کاتیکدا ترس منی داگرتبوو. لە ئاغا رەجەبی پرسی: "چۆن زانیت؟" ئاغا رەجەب لە وەلامدا وتی: "وا قەرار بووە کە هەرکاتیك شتیك لە مالیاندا رووبدا، گولدانیکی لە کاغەزی سوورەوە پیچراو لەسەر قەراغی پەنجەرەکە دابنین، ئەمرۆ بەیانیش گولدانیك لەسەر قەراغی پەنجەرەکە دانرابوو". مامۆستا پرسیی: "باشە تۆ چۆن زانیت کە دوینێ شەو ئەویان گرتووە؟" رەجەب وەلامی دایەوە: "لە دراوسیکانیانم پرسی".،

–تۆ پرسیت؟

–بەلی ئاغا.

"هەلسایە سەرپێ و بە هەلچوونەوە وتی: (کێ پیی وتیت بچیت بۆ ئەوێ؟)

–ئاخر ئاغا بەڵگە و شتی زۆر لە ماڵەکەیاندا هەیە، دەمویست کارێك بکەم.

–ڕەجەب ، تۆ شێت بوویت؟

"هەموو لەشی دەلەرزی. یەکەم جار بوو بەو شڵەژاوییە ببینم. هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبووم بەو جۆرە تێکبچێت. پاڵتۆکەی دەستی لەسەر کورسییەکە دانا. قاپووتە سپییەکەی دەرهێنا، دانیشت و بە ئاغا ڕەجەبی وت: "بڕۆ! دەستەگوڵی خۆت وەشاند. بۆچی لێرە ڕاوەستاویت؟" تۆزێك هێمن بووەوە و وتی: "ئەگەر ئەوراق و بەڵگەنامە و ئامێری پلی کۆپییەکەیان دەستکەوتبێت؛ حاڵمان خراپ دەبێت. دەبێ بزانین چۆن گیراوە. بەم بێپەروایییە دەشێ هەڵەیەك بکات و هەموومان تووش بین". ترس دایگرتبووم، بەڵام نەك بۆ خۆم. من گەر بمزانیایە دەگیرێم و گرتنەکەم وای لێ دەکات منی خۆش بوێت، ئەوە دەبووە مایەی خۆشحاڵیم.

"تۆزێك بە ژوورەکەدا هات و چوو، پاشان ڕەجەبی بانگ کرد لێی پرسی: "چۆنت زانی ماڵەوەیان پشکنیوە؟" ڕەجەب بە هێمنییەوە وەڵامی دایەوە: "کاتێك فەرهاد میرزایان بە ئۆتۆمبیلێك لە ماڵەوە دەرهێنا؛ من لە سەری شەقامەکە ڕاوەستابووم". پرسیی: "کەی؟" وتی: "سەعاتێك لەمەوبەر". سەیری سەعاتەکەی کرد و پرسیی: "ئێستا سەعات چەندە؟"

سەعات یەکی دوانیوەڕۆ بوو.

–فەرهاد میرزا تۆی دی؟

–بەڵی، ئاغا.

–ئیشارەتی بۆ کردیت؟

–نەخێر، ئاغا، خۆی تێنەگەیاندم، بەڵام کاتێك ڕۆیشتن؛ لەناو ئۆتۆمبێلەکەوە تەماشای کردم، وەك ئەوەی پێی خۆش بێت کە ئێوە ئاگاداری گرتنەکەی دەبن.

–ڕەجەب، نەتزانی چییان لە ماڵەکەیدا دۆزییەوە؟ ڕەجەب وتی: "من لەسەر خیابانی "ڕەی" وەستابووم و ماڵی ئەوانیش لە ناوەڕاستی کۆڵانەکەدایە. نەمزانی ئۆتۆمبیلەکە چیی تێدایە.

–کارێکی زۆر خراپت کردووە. زۆر شتیشت لە من تێکدا؟ ئەی ئێمە بڕیارمان نەدا کە دەبێ هەر کەسە و خەریکی کاری خۆی بێت؟ تازە شتەکە ڕوویداوە.

بشتگرن؛ گوناهی خۆتە. بەهەرحاڵ ئێستا ئێمە دەبێ مشوورێك بخۆین. ئەگەر ئەوراق و شتەکانی تریان دەستکەوتبێت، ئەوا هیچ. گەر دەستیشیان نەکەوتبێت؛ دەبێ بزانین لە کوێ دانراون. قەرار بوو لەم دوو سێ ڕۆژەدا بۆ شوێنێکی تر ببرێن. نازانم، دەبێ بۆ کوێیان بردبێت. دەبێ ئێمە دوو شت بزانین: یەکەمیان ئەوەیە کە ئەویان بە چ تاوانێك گرتووە؟ دووەمیشیان ئەوەیە؛ ئایا ئامێر و هۆیەکانی تری کارکردنمانیان دەست کەوتووە یان نا.

"ئینجا تۆزێك بیری کردەوە و بە ڕەجەبی وت: "بۆ هیچ کوێ مەڕۆ، بمێنەرەوە تا بیرێك دەکەینەوە". کە ئاغا ڕەجەب لە ژوورەکەی چووە دەرێ، من وتم: "دەتانەوێ بزانن کە فەرهاد میرزا چۆن چۆنی گیراوە؟" وتی: "دەبێ لە خۆی بپرسین". وتم: "چۆن دەتانەوێ لە خۆی بپرسن؟" وتی: "دەبێ بە ناوی کەسێکی نزیکییەوە یەکێك بنێرین بۆ لای؛ بۆ بەندیخانە" شتێکم بە بیردا هات. وتم: "ماکان، من بۆ بەندیخانە دەچم".

-تۆ!

-بەڵی، من.

وتی: "نا.. نا.. ئەمە کاری تۆ نییە". وتم: "بۆچی؟ لەبەرئەوەی کاری وام لێ ناوەشیتەوە؟ ئیوە هەرگیز کاریکی دژوارتان بە من نەسپاردووە. قابیلە خوینی من لە هی ئەوانی دی ئالتر بیت؟" وتی: "مەسەلەکە ئەوە نییە. ئەمە کاریکی زۆر وردە و نابێ یەکیکی وەکو تۆ بخریتە مەترسییەوە. بۆ کاری دی سوود لە تۆ دەبینین". هەمیشە ئەمەی کردبووە بیانوو. کاری خەتەرناکی بە من نەدەسپارد. ئایا لەبەرئەوەی خۆشی دەویستم؟ یان هەر بە راستی بە چاویکی پر بایەخترەوە سەیری منی دەکرد. ئینجا وتی: "پاشان فەرهاد میرزا تورکە و نابێ تۆ بکەین بە خوشکی. فەرهاد میرزا ناوە نهینییەکەیەتی" وتم: "باشە.. لە جیی دەزگیرانی یان ژنی ئەو دامنین". وتی: "ئەی ئەگەر تۆشیان گرت؟" وتم: "ئەودەمە من خۆشحال دەبم؛ کە بەربووم جاریکی تر.." قسەکەی پێ بریم: "گەر تۆ بگیرییت؛ ئەوەندەی پیناچیت منیش دەفەوتینن، ئیدی ئەوسا هەرگیز من نابینیتەوە". وتم: نەء.. من

ناهیلم بتکوژن". دەستی برد بۆ سەری و بە پەنجە ئەستوورەکانی قژی خۆی شانە کرد. سەری بادا و وتی: "ئاخر تۆ هیچت لەدەست نایەت. چۆن دەتوانی بچیت بۆ لای؟" وتم: "تۆ چۆنت پێ خۆش بیت ئاوەها. جگە لەوە من لە نزیکەوە ئاشناییم لەگەل سەرۆکی ئاسایشدا هەیە و دلنیام داوایەکی لەم جۆرەی لی بکەم، داواکەم رەت ناکاتەوە. لە پاریسەوە دەیناسم. ویرای ئەوەش خزمایەتییەکی دووری لەگەل باوکیشمدا هەیە. دەزانیت کە ئەو باوکمی لە قەزوینەوە بۆ کەربەلا نارد".

غیرەی کرد. ئەمە یەکەم جار بوو ئاماژە بۆ رابوردووی من بکات. پرسیی: "ئەویش یەکیکە لەوانەی کە شەیدای چاوەکانت بوون؟" وتم: "من کەس شك نابەم شەیدای چاوەکانم بووبیت". وتی: "بەلام من شك دەبەم". وتم: "باشە پیم بلێ.. کێ؟" لیم ورد بۆوە، بەلام هیچی نەوت. من بەم نیگایانەی راهاتبووم. لە دەموچاویدا، لە خەتەکانی تەویلیدا، لە جوولەکانیدا، هیچ هەلنەدەهینجرا. پاش تۆزیك بە دەنگیکی نارەزایی ئامیزەوە وتی: "بۆچی دەتەوێ قسەم لی دەربهینیت؟ بهیلە با خەریکی کارەکەمان بین". چەند دەقیقەیەك لە ژوورەکەدا هات وچوو. لە پریکدا دەوەستا و بە سەرسورمانەوە لە من ورددەبۆوە و سەری رادەوەشاند و پاشان هەمدیسان دەچووە بەردەم تابلۆیەکی خۆی و بە پەنجە تۆزەکەی سەری دەسری و ئینجا لەو درەختانە ورد دەبۆوە، کە بەفر پۆشیبوونی. ناگەهان وتی: "فەرەنگیس.. برۆ، برۆ و لیرە مەمینە! هەرچییەکیش دەکەیت بیکە. من دەمەوێ تەنها دوو شت بزانم، یەکەم: ئایا ئەوراق و شتەکانی تریشیان چنگ کەوتووە؟ دووەم: ئایا ئەویان چۆن گرتووە؟" پرسیم: "فەرهاد میرزا چۆن ئادەمیزادیکە؟ کەمیك باسیم بۆ بکەن تا بزانم چۆن رووبەرووی ببمەوە".

"دەستی بە ناساندنی فەرهاد میرزا کرد. کوریکی بیست و شەش سالان بوو. تازە کۆلیژی پزیشکیی تەواو کردبوو. باوکی لە مولکدارەکانی زنجان بووە و مردووە. دایکی لە زنجان دەژی. کۆن باوکی لە چەکدارەکانی خانی زنجان بووە و ماوەیەکیش لە رژیم یاخی بووە. پاش کۆدیتا بەلینی دابینکردنی ژیانیان دایە و

سویندیان بۆ خوارد. بەڵام پاش ماوەیەك گرتیان و لە بەندیخانەی قەسردا لە بێ تلیاکیدا سەری نایەوە. فەرهاد میرزا باڵای مامناوەندییە. ئاسەواری ئاولە لە دەم و چاویدا دەبیـنرێ، توندوتیژانـە دەدویـت، قسـە خۆشـە. خۆراگـرە. هـەندێ هەلسوکەوتی تایبەت بە خۆی هەیە. ترسنۆك نییە، بەڵام واش پیشان دەدات کە زۆر ئازایە. هەموو شتیك بە ئاسان لە قەلەم دەدات. کە لە کۆلیژیش بوو دەمی خۆی پێ نەدەگیرا و لەو بارودۆخە ترسناکەشدا قوتابییەکانی سلیان لێ دەکردەوە گوێ لە قسەکانی بگرن. عەسەبیتیی لە رادەیەکدایە کە جاری وایە بە تەواوی ئاگـای لـە خـۆی نـامینیت. لـەو لاوە دەمارگیرانەشـە کـەوا دەزانیـت لـە ریـی توندوتیژییـەوە دەتوانـرێ بیروبـاوەری خـەلکانی تـر بگـۆررێ. هەرکەسـیك بیروباوەری وەکو خۆی نەبیت، بە توورەییەوە لەگەڵیدا گفتوگۆ دەکات و رەنگە هەر ئەمەش یەکیك بیت لە هۆیەکانی گرتنی. مالیان وا لە یەکیك لە کۆڵانەکانی خیابـانی رەی، بەرامبـەر بـازاری نـایب ئەلسـەلتەنە. نـاوی راسـتەقینەی خـۆی موحسین کەماله و ناوی تەواوی باوکیشی..

"هەرچەندی کرد ناوی تەواوی باوکی بیر نەکەوتەوە. بە منی وت: "لە زنجان هەر حاجی کەمالیان پی وتووە، گەر ناوی تەواوی باوکیان لێ پرسیت بلێ چونکە مردووە نازانم. ناوی دایکیشـی نـازانم". پرسـیم: "باشـە وینەیـەکت لا نییـە تـا خۆشم بیناسم؟" وتی: "وینەم لا نییە، بەڵام ئیستا چەند سکیچیکیت بۆ دەکەم". لای میـزی نووسـینەکەیەوە دانیشـت. بـە قەلـەمیکی ئەسـتووری رەش و لەسـەر مقەبایەکی ئەستوور دەستی بە وینەکیشانی دەموچاوی کرد. وەك ئەوەی لەگەڵ خۆیدا قسە بکات، نیشانەکانی دەموچاوی ئەوی بە بەرزی دەوت: "ناوچەوانیکی بەرزی هەیە، قژی بە لایەکدا دادەهینیت. سمیل دەهیلیتـەوە. لووتـی گەورەیـە و لیوەکانی ئەستوورن. دەموچاوی ئەسمەرە و کە تووره دەبیت؛ هەموو دەموچاوی سوورهەلدەگەریت.

"لەسـەر نـانی نیـوەرۆش دەربـارەی ئـەو قسـەی بـۆ کردمـەوە: "فـەرەنگیس، کارەکە دژوارە. دەبێ هـەر لـە یەکەم ساتەوە بـە جۆریك خۆتـی پیشـانبدەیت کـە

یەکسەر بە دەزگیرانی خۆیت بزانیت. کوریکی عاقلە و یەکسەر لە مەبەستت دەگات. پارەش لەگەل خۆتدا هەلگرە. ئەوەت بیر نەچیت گەر بوویتە جیی گومانیان دەتوانیت بە پارە گومانەکەیان لا بسریتەوە. وریابە هیچ هەنگاوی بە خۆرایی نەنییت. لەنیو ئەم پاسەوانە ئیفلیجانەدا رەنگە کەسانیکیش هەبن سل لەوە بکەنەوە بەرتیل لە یەکیکی وەکو تۆ وەربگرن کە بۆ سەردانی زیندانییەکی سیاسی دەچیت". ناکاو بە شلەژانەوە قسەکانی بری، بیدەنگ بوو! دیسان پرسییەوە: "ئیستا چی دەکەیت؟ یەکسەر دەچیت بۆ لای سەرۆکی ئاسایش؟" وتم: "نەء، یەکەم جار هەول دەدەم لە ریی ئەو پیاوە بچکۆلانانەوە کارەکە مەیسەر بکەم. گەر نەکرا؛ ئەوسا دەچمە لای سەرۆکی ئاسایش. هەلسام، سەعات دوو و چەند دەقیقەیەکی پاشنیوەرۆ بوو.. کاتێ ویستم برۆم پرسیی: "دەتەوێ هەر ئیستا برۆیت؟" وتم: "تا زووتر برۆم درەنگە". وتی: "باشە، تا پالتۆکەشت لەبەر دەکەیت وینەکە تەواو دەبیت".

"زستانیکی سارد بوو. پالتۆیەکی چەرمی قەشەنگم لەبەردا بوو کە لە فەرەنسا کریبووم؛ رەفتەیەکی سوورم بەستبوو و پالتۆکەم پۆشیبوو، دوو جار چوومە لایەوە. وتی: "وەرن، باش لیی وردببنەوە تا سەروسیمایتان لەبیر نەچیتەوە". سەروسیمایم بەلاوە غەریب نەبوو. هاتەوە یادم کە ئەو لاوە سمیلدارەم لە شوینیك بینیوە. وتم: "مامۆستا ئەم لاوەم لە شوینیك دیوە". پرسیی: "لە کوێ؟" تۆزیك بیرم کردەوە و وتم: "ئەمە هەمان ئەو لاوەیە کە ئەو شەوە لە دوای ئیوەوە وەستابوو؟" پرسیی: "کام شەوە" وتم: "هەمان ئەو شەوەی کە" بە نیگاکەیدا زانیم کە لە مەبەستەکەم گەیشت، بەلام من ویستم بیدەمەوە بە روویدا. وتم: "هەمان ئەو شەوەی کە پیکەوە چووین بۆ کەنار رووباری کەرەج". دەستی خستە سەر دەمم و نەیهیشت هیچی دی بلیم. منیش لیوەکانم نووقاند و دەستیم ماچ کرد. وەك ئەوەی دووپشکیك پیوەی دابیت ئاوەها دەستی کیشایەوە دواوە، وا پیدەچوو بەوە سەغلەت بووبیت. چووە لای پەنجەرەکەوە و روانییە ئەو بەفرەی درەختەکانی پۆشیبوو.

"دەرگای ژوورەکەم کردەوە و چوومە دەرێ. لە هەیوانەکە پیم گەیشتەوە. ژێر بالمی گرت تا لەسەر پلە سەهۆلبەستووەکان هەلنەخلیسکیم. کاتێك ویستی دەرگای حەوشە بکاتەوە. وتی: "راست دەکەن". من وامزانی دەیەویت بە چەند وشەیەکی خۆشەویستی بەریم بکات، بەلام وا نەبوو. ئەو تەنها بیری لای کارەکەی بوو و ئەو پرکیشی و گیانبازییەی منی بە لاوە شتیکی زۆر ئاسایی بوو. وتی: "راست دەکەن، موحسین کەمال ئیوە دەناسیت. ئەو لاوەیە کە ئەو شەوە لە سینەماکەدا لەگەلماندا بوو. زەینتان روونە، خواتان لەگەل".

"یەکسەر چوومەوە بۆ مالەوە، جلوبەرگیکی وام لەبەر کرد کە لە جلوبەرگی نیمچە پزیشکیکی مولکدارەکانی زنجان بچیت و راستەوخۆ بەرەو ئەو بەندیخانەیە چووم کە ئەودەمە تازە تەواو بووبوو.

"ئاخ، ئاغای چاودیر، خوا هیچ بەدبەختیك بەدەست پاسەوانەکانی بەندیخانەوە زەلیل نەکات. حەزمدەکرد بە وردی باسی ئەو مەینەتییەتان بۆ بکەم کە ئەو رۆژە چەشتم، بەلام ئەفسووس کات درەنگە! جگە لەوە دەترسم بیتاقەتتان بکەم. بەلام ئەوەتان لەیاد نەچیت هەرچی ریسوابوون و سووکایەتیی ئەو رۆژەیە کە بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا بینیم، لە چاوی ئەوم دەناسی. باش لە مەبەستم بگەن. هەلبەتە کە ئەو پیی نەوتم گوێ بەو سووکایەتیپیکردنە نەدەم، بەلام من ئامادە بووم هەموو شتیك بکەم تەنها بەو ئومیدەی رایکیشمە ناو ژیانی خۆمەوە. ئەو رۆژە بۆ یەکەم جار بە چاوی خۆم زەلیلی و بەدبەختیی خەلکی ئەم ولاتەم بەدەست خاوەن دەسەلاتانەوە دی.

"لەبەردەم دەرگای بەندیخانەکەدا حەشاماتیکی زۆر وەستابوون. پیاوان بە دەنگی گر و ناخۆشیانەوە هاواریان دەکرد. ئافرەتان دەیانقیژاند. منالان دەگریان، پاسەوانەکان جنیویان دەدا و لای دەرگاکەوە پالیان بە خەلکەوە دەنا. پیرەمیردیك ئەسکەناسیکی یەك تمەنیی پیبوو، دەرگاوانەکە لەسەر سەری خەلکەکەوە لیی سەند و پیرەمیردەی بۆ لای دەرگاکەوە راکیشا و کردی بە حەساری بەندیخانەکەدا. خەلکی شەقیان لە یەکتر هەلدەدا، مستەکۆلەیان بە

یەکتردا دەکیشا. هەر کەسەو بۆ خۆی هەلپەی دەکرد. تاقە سەیرکردنیك بەس بوو بۆ ئەوەی بزانن کە من لەوان جیام. پیریژنیك سەفەرتاسییەکی بە دەستەوە بوو، لیی پرسیم: "بۆچی هاتوویت؟" وتم "دەمەوێ دەزگیرانەکەم ببینم". وتی: "دەزگیرانەکەی تۆ یا سیاسییە یا دزیی لە دەولەت کردووە. ئەمرۆ تایبەتە بە سەردانی هەژار و لیقەوماوەکان. ئەمرۆ ناهیلن سەردانی زیندانییە سیاسی و گەورەکان بکرێ". پیریژنەکە دلی بە سیمای نائومیدانەی من سووتا. ئینجا بە منی وت: "من بۆ سەردانی کورەکەم هاتووم. شۆفیرە و یەکیکی کردووە بە ژیرەوە. پینج سال حوکمیان داوە. تۆش لەگەل مندا وەرە. لەوێ لەناو بەندیخانەکە چیتان لەدەست هات بیکەن". لەبەردەم دەرگا ئاسنەکەدا، چەند ئافرەت و پیاویك لەگەل پاسەوانیکدا مشتومریان بوو. پاسەوانیك جنیوی دەدا و حەیزەرانی دەوەشاند، لەولاشەوە هاتوهاواری پەنجا شەست کەس بەرز بووبۆوە.

"سەرۆك پاسەوانیك؛ بە چاوە حیزەکانییەوە سەیری دەکردم، لیم پرسی: "ئاخر بۆچی ناهیلن بچینە ژوورێ". وتی: "دەتانەوێ کێ ببینن؟" وتم: "موحسین کەمال" وتی: "چ کارەیە؟" وتم: "دکتۆرە" وتی: "چیی کردووە؟" وتم: "نازانم" پرسیی: "کەی گیراوە؟" وتم: "دوینێ شەو". وتی: "ئەگەر سیاسی بیت، نابیت". وتم: "ئیوە ریم بدەن با بچمە ناوەوە، من خۆم لەوێ تەگبیری خۆم دەکەم". سەرۆك پاسەوانەکە ریی بۆ کردمەوە. بە دەرگاوانەکەی وت: "ئادەی ریی بدە، کە گەرایەوە بەخشیش بە تۆش دەدات".

"چوومە ئەولای پەنجەرەکەوە، خەلکەکە بە چاوی رق و ئیرەییەوە سەیری منیان دەکرد. کابرایەك کە جلی مەدەنیی لەبەردا بوو لیی پرسیم: "کاری چیتان هەیە؟" سەرۆك پاسەوانەکە لەبری من وەلامی دایەوە: "هاتووە بۆ سەردانی زیندانی، حەسەن ئاغا، هەقتان بەسەرییەوە نەبیت با بروات" وتم: "ئاغای سەرۆك پاسەوان من شارەزا نیم ،بەلکو ریگاکەم پیشانبدەن". سەرۆك پاسەوانەکە چپەچپیکی لەگەل کاربەدەستی بەردەرگاکە کرد، ئینجا کاربەدەستە مەدەنیپۆشەکە وتی: "خانم، ئەگەر سیاسی بیت ئیجازەی نادەن". رووم کردە

سەرۆك پاسەوانەکە و پیم وت: "گەر بمگەیەنیتە لای ئاغای کـەمال بەخشیشـی زیاترت دەدەمێ". سەرۆك پاسەوانەکە وتـی "خـانم، لای ئەفسـەرە ئیشـکچییەکە نەلین سیاسییە، بلین لەسەر دزی گیراوە".

"کابرا سەروسیما قیزەون وجل چلکنەکەی کـە لای دەرگاکـەوە پرسـیاری لێ کردم؛ بە دواماندا هات. سەرۆك پاسەوانەکە لیی پرسـی: "حەسـەن ئاغا، دوینـێ شەو کەستان بۆ ئیرە هیناوە؟" کاربەدەستەکە وەڵامـی دایـەوە: "بـەردەوام خـەلك دەهینین. دوینێ شـەو دووسییەکمان هینـا. خـانم ئیـوە دەتانـەوێ چاوتـان بـە کێ بکـەویت؟" وتم: "موحسین کـەمال". وتـی: "بیگومـان لەوانەیـە کـە بەیاننامـەیان بلاودەکردەوە. ئیـوە چیـی ئـەون؟" وتم: "مـن دەزگـیرانیم". سـەرۆك پاسـەوانەکە لەژیر لیوەوە پیی وتم: "دەبێ رازیی بکەن. ئەم بیشەرەفانە تا نەکەی بە قورگیاندا وەڵامت نادەنەوە". بەڵام کابرا لـە سەرۆك پاسەوانەکە وشیارتر بوو و بایـەخیکی پتری بە کارەکەی خۆی دەدا.

–خانم، ئیوە دەبێ لـە پیشدا بۆ بەشی کاروباری سیاسی برۆن. دەبـێ لـەوێ ئیجازە وەربگرن، ئەگینا ناهیلن چاوتان بە زیندانییەکە بکەویت.

"سەرۆك پاسەوانەکە دەیویست لەسەرخۆ قسە لەگەل ئەودا بکات. ئۆقرەم لێ برابوو. کاربەدەستی بەشی سیاسییەکە بە سەریدا تەقییەوە: "تۆ دەلیی چی؟ تۆ مەسەلەکە نازانیت. ئـەو زیندانییـە هیشتا ناونیشـانی مالەکـەیانی پـی نـەداوین". بەڵام سەرۆك پاسەوانەکە کاتێ زانیی مەسەلەکە گرنگە تەماع گرتی، چەند ساتیك پیکەوە بە چپە قسەیان کرد. بەڵام کاربەدەستی بەشی سیاسییەکە هـەر نـەچووە ژیر بار.

خانم، فەرموون با بچین بۆ بەشی سیاسی، دەبێ لەوێ ئیجازەتـان بدەنـێ. وتم: "ئیوە باسی چی دەکەن؟ دەلین چی؟ ئەمرۆ بەیانی هاتوون مالەکەیان پشکنیوە". کاربەدەستەکە وتی: "بـەلێ، بەڵام ئـەوە مـالی خۆیـان نییـە، ئیمـە مەبەسـتمان ئـەو مالەیـە کـە ئامیری پلـی کۆپییەکەی لییە و بەیاننامەکانیان تیدا چاپ کردووە". وتم: "شتی وا نییە، بە هەلە ئەوتان گرتووە".

من هەستمکرد کارەکەی خۆمم ئەنجام داوە. لە بنەرەتدا بینینی فەرهاد میرزا خۆی پیویست نەبوو. مامۆستا دوو وەڵامی لە من دەویست، چۆن و بە چ تاوانیك گیراوە؟ ئایا ئەوراق و ئامیر و شتەکانی تریان چنگ کەوتووە؟ سەبارەت بە گرتنەکەی، دیار بوو یەکیك بۆی تیچاندبوو. یەکیك خیانەتی کردبوو. چونکە بەشی کاروباری سیاسی بە مەسەلەی پلی کۆپی و ئەوراقەکانی تری دەزانی؛ بەڵام نەیتوانیبوو لە مالەکەدا بیدۆزیتەوە. یەکیك لە پیشدا زانیویەتی و ئەوراق و شتەکانی تریان بەر لە پشکنینەکە گواستۆتەوە. هەر بۆیە کاتێ ئەم بەیانییە مالی فەرهاد میرزایان پشکنیوە و شتەکانیان نەدۆزیوەتەوە، وا دەزانن ئەوە مالی خۆی نییە و مالە ئەسلییەکەی خۆی پیشان نەداون.

کابرای کاربەدەستی بەشی سیاسی وتی: "خوا بکات بە هەلە گرتبیتمان. بەهەرحال ئیوە هەر دەبێ لەگەلمدا بین بۆ بەشی سیاسی، مادامەکی دەزگیرانیت، بیگومان دەزانیت مالیان لە کوییە". یەکسەر وتم: "بیگومان دەزانم" پرسیی: "لە کوییە؟" بە توندی و خیرا وەڵامم دایەوە: "خیابانی رەی، کۆڵانەکەی بەرامبەر بازاری نایب ئەلسەلتەنە". کاربەدەستەکە جام بوو. سەرۆك پاسەوانەکە کاتێ ئەو حالەی کاربەدەستەکەی بەشی سیاسیی دی، زیاتر خۆی سوورکردەوە.

–بینیت، بابا.. هەر لە خۆتانەوە خەلکی تووش دەکەن؟ ئەمە چ نان پەیداکردنیکە؟

"سەعات نزیکەی پینج و نیوی پاشنیوەرۆ بوو. کاربەدەستی بەشی سیاسییەکە وتی: "بەهەرحال، گەر بتانەوێ چاوتان پیی بکەویت دەبێ لە بەشی سیاسی ئیجازە وەربگرن و ئیستاش پشوویانە. بەبێ ئیجازەی رەسمیی بەشی سیاسی سەردانی زیندانییە سیاسییەکان قەدەغەیە و کەس ناتوانیت ریتان بدات تا زیندانییەکەتان ببینن" پرسیم: "سەرۆکی ئاسایش دەتوانێ ئیجازە بدات؟" وتی: "بیگومان" وتم: "کەواتە ریم بدەن با لە بەندیخانەوە تەلەفۆنیکی بۆ بکەم". پرسیی "جەنابی سەرۆك دەناسن؟" وتم: "بەلێ، خزممە" بە دوا ریییەکدا دەگەرام لە شەری ئەو کاربەدەستە لام بدات، بۆیە ناوی سەرۆکی ئاسایشیشم هینا و وتم

خزمەی تا ئیتر دەسبەردارم بیت و ئەوەم لەبیر چووبوّوە کە ئیتر پێویست بە سەردانی فەرهاد ناکات.

"دوا قسەی کاربەدەستەکە؛ سەرنجی منی بەلای شتێکدا راکیشا کە بووە مایەی بەدبەختیم. ئاغای ئازیز، بۆیە بە سەرهاتی ئەم بەندیخانەیەم بۆ گێرانەوە تا بزانن چۆن خۆم بە دەستی خۆم داوم بۆ خۆم نایەوە و ژیانی خۆم بەم رۆژە گەیاند. کاربەدەستەکە وتی: "جا گەر ئەو دەناسن، بۆ کاریکی وا ناکەن دەزگیرانەکەتان ئازاد بکەن". ئەو بە تانە و تەشەرەوە ئەم قسەیەی ئاراستە کردم، بەلام بە لای منەوە بیرۆکەیەکی تازە بوو.

"یەکسەر لە بەندیخانەوە چوومەوە بۆ مالێ. خۆم گۆری و بۆ یەکەمجار بە بێئەوەی لە پێشدا ئیجازەی لێ وەربگرم بەرەو لای مامۆستا چووم و وتم: "دوو پرسیارتان لێ کردبووم، وەلامەکانیم هیناوەتەوە". بە جۆریك قسەکەم بەروویدا دا وەك ئەوەی سەرکەوتنیکی گەورەم بەدەستهینابیت. پرسیی: "ئەی کەواتە چی؟" وتم: "ئیوە دوو پرسیارتان کرد، وەلامەکانیانم هیناوەتەوە". پرسیی: "بۆچی گرتوویانە؟" وتم: "بە تاوانی بلاوکردنەوەی بەیاننامە". ئینجا پرسیی: "شتەکان لە کوین؟"

—ئەمەیان نازانم. بەلام ئەوەندە دەزانم کە هیچیان لە مالەکەیاندا چنگ نەکەتووە.

پرسیی: "یەکسەر چوویت بۆ لای سەرۆکی ئاسایش؟"

—نەء، نەچووم بۆ لای سەرۆکی ئاسایش. ئەگەر ئیوە ئیجازەم بدەن دەچم.

"ئینجا بە وردی، تەواوی ئەو شتانەی کە ئیستا بۆ ئیوەم باس کرد، بۆم گیرایەوە و ئەو ئەنجامەی کە پێشی گەیشتبووم لای ئەو پیشنیازم کرد. پیالەیەك چای گەرمی بۆ تیکردم. ئەو ستوولەی کە لەسەری دادەنیشت و ئینجا کاری دەکرد هینایە لای سۆپاکەوە. بەرامبەرم دانیشت، بە جۆریك کە سەری ئەژنۆکانمان بەر یەك دەکەوتن. دەستی گرتم و وتی: "ئافەرین کچێ تۆ زۆر ئازایت". خەریکبوو چاوم پربیت لە فرمیسك. وتم: "بە پیچەوانەوە، من مرۆڤیکی

ترسنۆکم. ئیوه سەرچاوەی جەسووری و ئازایەتیی منن". بە چاوی پڕ پارانەوەوە؛ بەڵام راستگۆیانە، وەك ئەو ئینسانەی کە خەریکە بۆ جۆریك ئاو دەخنکیت؛ تەماشایم کرد. ناگەهان هەلسایە سەرپێ، دەستی خستە ژیر چەناگەمەوە و بە توندوتیژییەکەوە کە هەرگیز چاوەریی نەبووم، وتی: "کچێ، وا تەماشام مەکە، ئەم چاوانەی تۆ ئاخرییەکەی من لە ژیاندا سەراسیمە دەکەن". وتم: "منیش دەمەوێ سەراسیمەتان بکەم". ئەو وەڵامەی من راست بوو. بەڵام ئەو نەیخستە سەر خۆی و بە پیچەوانەوە، وایزانی مەبەستم ئازاردانیتی. ئەو قسەیەم تیریك بوو نیشانەکەی نەپیکا؛ بەڵام نیچیرەکەی بریندار کرد. هەلسا و وتی: "تۆ هیچ مەبەستیکت نییە تەنها ئازاردانی من نەبیت". وتم: "ئۆه.. ئیوه زۆر دلرەقن". بیهوودە بوو. ئەو بیرکردنەوەیە بەسەریدا زال بووبوو و منیش نەمدەزانی چۆن خاترجەمی بکەم. وتم: "ئیوه بە هەلە لە من گەیشتوون". دەمویست لە ژوورەکە بچمە دەرێ و ئەمجارە تا خۆی داوام لی نەکات نەچمەوە بۆ لای. بەڵام وەکو ژیشکیك کە لەپریکدا تیرەکانی خۆی کۆدەکاتەوە؛ هاتە لامەوە.. دەستی گرتم و بە نەرمییەوە پیی وتم: "فەرەنگیس، بمینەرەوە. کارمان هەیە. ئیمە دەبێ تەنها هاوریی یەکتر بین. ژیان بەم جۆرە من و تۆی پیکەوە بەستووەتەوە. دەقیقەیەك دانیشە!" بۆ چەند ساتیك هەردووکمان بیدەنگ بووین. من لای پەنجەرەکەوە راوەستابووم و ئەو لەسەر ستوولەکە دانیشتبوو. سەیری زەوییەکەی دەکرد. هەمدیسان دەربارەی بەسەرهاتی بەردەرگای بەندیخانەکە پرسیاری لی کردمەوە. دەربارەی کاربەدەست و پاسەوانەکان و رەفتاریان لەگەل خەلکیدا. پاشان کەوتە تیفکرین لەوەی کە دەبیت کێ فەرهاد میرزای تووش کردبیت. دەیوت: "دوو سێ رۆژە چەند کەسیکیان گرتووە. جەلال و عەبدول و شاتریان گرتووە. تەنها شاتریش دەیزانی کە ئامیری پلی کۆپییەکە لە مالی فەرهاد میرزادایە و لەوێ ئەوراقەکان چاپ دەکرین. بەڵام شاتر، فەرهاد میرزا تووش ناکات، چونکە فەرهاد میرزا لەوانەیە هەر بە هۆی شاترەوە ئامیر و ئەوراقەکانی گواستبیتەوە و ئەو خانووە تازەکە شارەزایە. تۆزیك بیری کردەوە و

وتی: "ئیوه شاتر ناناسن. ئەم پیاوه کیچیك دەکات بە گایەك. بیست و پینج ساله کریکاری هونەرییه. سەروەختیك شۆفیری شەمەندەفەری نیوان تەوریز و جەلفا بووه. دەمی خۆی پێ ناگیرێ. بەلای ئەوەوه کاری سیاسی زۆر بایەخی نییه. ئەو تەنها چاوەریی ئەوەیه رۆژیك له رۆژان شەمەندەفەریکی پر شۆرشگیری بدەنێ و پیی بلین: "یالا پیی پیدا بنێ!" وای بۆ دەچم ئەو قسەیەکی لای یەکیك درکاندبیت. لەوانەشە هیچ یەکیك لەوانەی کە گیراون ئەویان تیوه نەگلاندبیت و تا ئیستا ناپاکەکە لەناو ئیمەدا بیت.." نزیکەی سەعاتیك لەگەل مندا، بەلکو زیاتر لەگەل خۆیدا دەربارەی ئەوه دوا کە دەبێ کی فەرهاد میرزای تووش کردبیت.

"سەعات دە بوو کە من بە برسیتییەوه هەلسام تا برۆم. بە یەکەوه هاتینە دەرێ. سەرمایەکی سەخت بوو. کیوی دەماوەند لە دوورەوه بە تارا سپییەکەی سەریەوه دەبریسکایەوه. ژیر بالمی گرتبوو و هیچ قسەیەکمان پیکەوه نەکرد. لە بەردەرگای مالەوەیاندا خواحافیزیم لێ کرد. توند دەستمی گوشی، هەستم کرد گرنگیم لای ئەو زیاتر بووه. بەلام لەدەست گوشینەکەیدا هەستم بە خۆشەویستی نەکرد. کاتیکیش خەریك بووم برۆم؛ وتی: "دەربارەی چوونەکەتان بۆ لای سەرۆکی ئاسایش جارێ سەبر کەن. گەر پیویستی کرد خۆم وەلامتان لێ دەگیرمەوه".

کە دەرگای مالەوەم کردەوه، سەیرم کرد ژوورەکان تاریکن و بە تەنها گلۆپی حەوشە هەلکراوه. دایکە بەسزمانەکەم بەو حالەی من راهاتبوو. فزه سولتان نانی ئیوارەی بۆ هینام. نانم خوارد و چوومە پیخەفەکەمەوه و تا چەندین سەعات خەوم لێ نەکەوت.

"تا چەند رۆژیك نەچووم بۆ مالیان. ئەم پیاوه بە بێئەوەی بە خۆی بزانیت منی ئازار دەدا. بروا ناکەم ئەو ئازاردانەی لە ئاگاییەوه بووبیت. بەلام رەفتاری ئاگری لە من بەردەدا. چاوەریی بووم تەلەفۆنم بۆ بکات و داوام لێ بکات بچم بۆ

لای، بەڵام نەیکرد. ئارامم نەما. هەمدیسان من تەلەفۆنم کردەوە، هەمدیسان خۆم چوومەوە بۆ لای.

"دوای ئەو شەوە بە دوو سێ هەفتە، رۆژێکیان تەلەفۆنی بۆ کردم و یەکسەر داوای لێ کردم بچم بۆ لای. سەعات پێنجی عەسر بوو. هێشتا سەرمای زستان هەر بەکار بوو. کاتێ چووم بۆ لای؛ وتی: "تا ئیستا قسەیەکیان لە فەرهاد میرزا دەرنەهیناوە. دوو سێ رۆژە خەریکی ئازاردانین، پیرێ شەو تا بەیانی چەندەها جار ئاسنی قورسیان لێ بەستووە، ئیستا دەبێ بیریك لە چوونەکەت بکەینەوە بۆ لای سەرۆکی ئاسایش. راستییەکەی من لە دوینێ شەوەوە تا ئیستا بیر لەوە دەکەمەوە ئایا بۆ تۆ و بۆ ئیمە خراپ نییە بۆ ئەو مەسەلەیە بچیتە لای سەرۆکی ئاسایش؟ بەڵام چارمان نییە؟ تۆ خۆت دەلییت چی؟ حەز دەکەیت تۆزیك دەربارەی ئەو هاوری کۆن و خزمە دوورەی باوکت قسەم بۆ بکەیت؟"

"ئەمە یەکەم جار بوو دەربارەی رابوردووم پرسیارم لێ بکات و منیش شتەکانم وەکو خۆی بۆ گیرایەوە. کاتیك باش گویی لێ گرتم وتی: "فەرەنگیسی ئازیز، من رزگارکردنی فەرهاد میرزام لە تۆ دەویت. بەهەر نرخیك بووە دەبێ ئەو لە بەندیخانە رزگار بکەین، ئەگینا دەیکوژن. فەرهاد میرزا کەسیك نییە شت بدرکینیت. لەژیر ئازاردانا دەیکوژن".

پرسیم: "بەهەر نرخیك بووە؟"

"وەڵامی نەدایەوە. لیم وردبۆوە وەك ئەوەی لە مەبەستەکەم نەگەیشتبیت.

وتم: "تەنانەت گەر بەو نرخە.. ماکان، تەنانەت گەر بەو نرخەش بێ کە من هەموو تەمەنی خۆمی بۆ بفرۆشم.."

وتی: "نا.. نا.. بەو گرانییەش نا.."

"ئەمــە دوا جـار بـوو بیبینیـم. ئیـدی نەمبینییــەوە. بـەیانیی رۆژی داهـاتوو تەلەفۆنم بۆ مالی سەرتیپ ئارامی سەرۆکی گشتیی دائیرەی ئاسایش کرد و بۆ نـانخواردنی ئیــوارە دەعــوەتم کــرد. بەوپــەری خۆشــحالییەوە دەعوەتەکــەمی قبوول کرد.

"ئاغای چاودیر، ئەو شتەی کە ئیستا دەمەوێ بیلیـم، گـەورەترین نـهینیی ژیـانی منـە. کـەس ئـەو شـتە نـازانیت. نابـێ کەسـیش بـیزانیت. مـن بەوپـەری ئاگاییمـەوە خـۆم فریدایـە نـاو گیـژاوی بـەلاّوە. روون و ئاشـکرا فـەوتانی خـۆم دەبینـی، بـەلاّم نەمهیشـت تـرس و گومـان پـەی بـە دەروونم بـەرن. ئیسـتا ئیـوە خەریکن لەوە تیدەگەن کە بۆچی من خۆمتـان پـێ ناناسـینم. هـەر لەبەرئـەوەش بریارم داوە ئەم نهینییە کە گەورەترین نهینیی ژیانمە هەتاهەتایە لەژیر پـەردەی خامۆشیدا بە پەنهانی بمینیتـەوە. گـەر بیدرکینـم؛ ئیـدی ئـەو نرخـەی نـامینیت. ئیـدی ئـەو شـتەی کـە دلـم دەداتـەوە، ئـەوەی کـە لـە سـاتەکانی تـەنیایی و پـر نیگەرانیمدا ئارامم دەکاتەوە، ئەویش لەنیو دەچیت و ئەوسا ئازاریکی کوشندە دلم پارچە پارچە دەکات. ئاخ، گـەر من بمویرایـە و ئەم نهینییەم بـەو بگوتایـە، لەوانــە بــوو ئــەویش بەختــەوەر بووایــە. بــەلاّم مــن نــەمزانی کــە ئــەو چ لەخۆبوردووییەکـەو تـا چ رادەیـەك دەتوانـی بەرگـەی چەرمەسـەرییەکانی ژیـان

بگریت. گەر ئەو لەو قوربانیدانەی من ئاگادار بووایە، لەوانە بوو ئەم تابلۆیەی نەکیشایە. بەلآم ئەو ئازارەی کە ئەو بەرگەی دەگرت، منی پتر ئەشکەنجە دەدا. بۆچی ئیستا دەمەوێ پیتان بلیم؟ خۆشم نازانم. رەنگە لەبەرئەوە بیت بمەوێ ئەو گرییەی کە چەندەها سالە لە دلمدایە و هەناسەم توند دەکات، بکریتەوە. گەر دەیزانی کە من خۆم بوومەتە قوربانیی ئەو، بیگومان ئەم تابلۆیەی بەم چاوە هەرەزەیانەوە نەدەکیشا. بە پیچەوانەوە، ئەو وای دەزانی کە من لە دژوارترین ساتی ژیانیدا دەسبەرداری بووم و من ئەوم بە چارەنووسی شوومی سپاردوو.

"ئاشنایەتیم لەگەل سەرتیپ ئارامدا دەگەریتەوە بۆ سەرەتای چوونم بۆ پاریس. هەر کە شەمەندەفەرەکە لە ویستگای Chatelet "شاتلیە" وەستا؛ سەیرم کرد پیاویکی بەژنوبالآ ریکی شیکپۆشی سپی پیست کە تەنها مووە رەش و برۆ پرەکانی لە فەرەنساییەکانی جیا دەکردەوە، بەرەو رووم هات و منی بە ناوی خۆمەوە بانگ کرد و بە گەرمی و میهرەبانییەوە دەستمی گوشی و جانتاکەمی دا بە کۆل هەلگریك کە لەویدا وەستابوو و بردی بۆ ئوتیلیك کە پیشتر ژووریکی تیدا بە کریێ بۆ گرتبووم.

"هەر لە رۆژانی یەکەمەوە هاورییەتییەکی گەرم لە نیوانماندا دروست بوو و، بۆ هەر کاریك بێ سێ و دوو راویژم بەو دەکرد و ئەویش زیاد لەو رادەیەی کە پیرەمیردیك رایسپاردووە لە شاریکی غەریبەدا چاوی لە کچەکەیەوە بیت میهرەبانیی لەگەلمدا دەنواند. ئەو رۆژانە ئەو لە لایەن وەزارەتی جەنگەوە کرابوو بە سەرپەرشتیاری قوتابییە سەربازییەکان. لە هەمانکاتدا بە ناوی پەنجەمۆرناسی و کاروباری پۆلیسییەوە مووچەیەکی تری لە دەولەت وەردەگرت. ئەودەمە جیگری سەرهەنگ بوو، بەلآم لە بالیۆزخانە و لەناو ئیرانییەکاندا و لە وەزارەتی بەرگریی فەرەنسا و وەزارەتی رۆشنبیریی ئەو ولآتە و، لەو کۆر و کۆبوونەوانەدا کە پەیوەندیی بە کاروباری قوتابییە ئیرانییەکانەوە هەبوو، قسەی دەرۆیی و لە تەواوی کارەکانمدا، هەر لە ناونووسیم لە E.D.B.A و تاقیکردنەوەی وەرگرتنم و دابینکردنی کاروباری گوزەران و خانوو و تەنانەت کرینی

جلوبەرگیشدا نەك هەر خۆی بەلكو ئەوانەش كە لەژێر دەستیدا كاریان دەكرد؛ یارمەتیان دام. تا وای لێ هات پاش ماوەیەك من ئەوم نەك هەر بە ئامۆزایەكی باوكم دەزانی؛ كە برایانە هەلسوكەوتی لەگەلدا دەكردم؛ بەلكو ببووینە هاوڕێی یەكتر و پێكەوە دەچووین بۆ گشت شوێنە خۆشەكانی ئەم شارە جوانەی دونیا؛ هەر لە مۆزەخانە و شانۆوە بگرە تا كافیتریا و كاباریكان. لەگەلیدا دەچووم بۆ ئاهەنگە رەسمیەكان و راستییەكەی قۆزیتییەكەی و، رووخۆشییەكەی و، جلوبەرگە جوانەكانی و بە تایبەتیش كاتێك كە لە كۆڕە رەسمییەكاندا بەرگە سەربازییە سورمەییەكەی بە خەتەكانی سەرشانییەوە لەبەر دەكرد؛ وایان لێ دەكردم شانازیم دەكرد كە لەگەل ئەودا بۆ گەورەترین ئاهەنگەكانی پاریس و شەونشینییە گشتیو تایبەتییەكانی بالیۆزخانەكانی ولاتانی دەرەوە دەچووم. جگە لەوە دلفراوانی و دەسبلاوییەكانی؛ كاتێك بۆ شێویك دەعوەتی دەكردم. بەلام ئەمانە هەمووی بە لایەك، گرنگترین سیفەتی لە ژیاندا ئەوە بوو كە هیچ شتێكی لە خۆرایی نەدەكرد. خۆشی بەسەر راست نەدەزانی و بە لایەوە نەنگ نەبوو ئەوەم لا بدركێنێت كە لەو ساتەوەی لە ئێران دەرچووە عانەیەكی لە سوودی مولكەكانی لە فەرەنسا و ئەوروپادا خەرج نەكردووە، بەلكو بە پێچەوانەوە تەواوی ئەوانەی بە بانقەكانی ئینگلستان و سویسرا سپاردووە و تەنانەت لە بانقی دوفرانسیشدا حسابی كردووەتەوە. باس لە دزی و بە فیرۆدانی پارەی دەولەتیش هەر ناكرێ. ئەو بە تەواوی باوەری بەوە بوو كە ئەو كۆمەلگایەی ئەو تیایدا دەژی، ئەو كۆمەلگایەی كە ئەو لە زۆربەی پیاوەكانی خۆی بە گەورەتر دەزانێت؛ پێویستە ژیان و پێویستییەكانی ئەم دابین بكات. لەو باوەرەدا بوو كە ئەو لە زۆربەی كەسە هاوچەرخەكانی خۆی خانەدانتر و رەسەنتر و تێگەیشتووتر و دلێرتر و لێهاتووترە. نابێ لە قالبی ژیانی ئینسانێكی رەمەكیدا دیل بكرێ. دەبێ لە هەموو شتێكدا دەستی بروات و گەر لەم رووەشەوە بەرژەوەندیی لە ئاست بەرژەوەندیی خەلكیدا كەوتە مەترسییەوە؛ ئەوا خۆی لەسەر هەق دەزانێت لە ناویان بەرێت. لە راستیشدا كابرایەك بوو رێك و بێپەروا؛

بە کار و خاوەن بریار، هەر کاتێك لە لایەن ناحەزەکانییەوە هەستی بە بچووکترین مەترسی بکردایە گیرفانەکەی والا دەکرد. دەیتوانی دەمی چاوچنۆکترینیان چەور بکات و دلنیاش بوو لە زەرفی چەند هەفتەیەکدا بە زیادەوە دیتەوە جیی. بەڵام خۆ گەر ئەم ریگایە بۆ فریودان و رامکردنی ناحەزان سەرکەوتوو نەبوایە؛ ئەوا باکی نەبوو پەنا بەریتە بەر توندوتیژترین و بیبەزەییانەترین ریگای تر. باوەری وابوو کە هەر کەسیك لەم دونیا ئالۆزەدا، چ لە ئیران و چ لە ئەوروپادا، دەبێ مشوورخۆری کار و ئایندەی خۆی بیت. کەس بیر لە کەسی دی ناکاتەوە و هەرکەسیك دەقیقەیەك بەرژەوەندیی خۆی بویت و بە ناوی بەرژەوەندیی گشتییەوە پشتگویی بخات؛ ئەوا ئەو کەسە گەمژەیە و شایانی کوشتنە. بەڵام لەگەل ئەوەشدا هەندێ کاری تریشی لی دەوەشایەوە. کاتیك هەستی دەکرد کە رەزا شا دلی بە شتیکدا چووە، ئیتر حسابی قازانج و زیانی نەدەکرد. گیرفانی والا دەکرد و بە راست و چەپدا پارەی دەباراند تا ئارەزووەکەی شا بهینیتە دی. جاریکیان شا بۆ رۆژی سییەمی رەشەمێ داوای ئەسپیکی باشی کردبوو. یەکیك لە خاوەن پایە گەورەکان سێ مانگ لە ئەوروپادا گەرا و نەیتوانی ئەسپیك پەیدا بکات کە بە دلی شا بیت و نرخیکی گونجاوی هەبیت. هەوال گەیشتە سەرهەنگ کە شا زۆر توورە بووە و قسەی سووکی بەو خاوەن پایەیە وتووە. ئەم لە زەرفی هەفتەیەکدا بە فرۆکە چوو بۆ مەجەرستان و ئەسپیك کە هی هرتسوك فون میکاش بوو بە نرخیکی چەند قات گرانتر لە نرخی خۆی کری و بۆ تارانی ناردەوە. نیوەی ئەو پارەیەشی لەسەر شا نەژمارد کە خۆی خەرجی کردبوو. ئاشکرایە کە دەبێ چی بەسەر ئەو لیپرسراوە بەسزمانەدا هاتبیت کە سێ مانگ لە ئەوروپادا خولایەوە و نەیتوانی ئەسپیك بکریت کە بە دلی شا بیت و بە نرخیکی گونجاو بیت. گوناهی ئەم لیپرسراوەش ئەوە بووە کە لە راپۆرتیکدا سەبارەت بە سەرهەنگ ئارام دەربارەی پارە بە فیرۆدانی قسەی کردبوو.

"بەم جۆرە توانیبووی ببیتە جیی متمانە و ریزی شا. لە هەمان کاتدا لیی دەترسا، چونکە تاقە کەسیك کە دەیتوانی رۆژیك لە رۆژان لەناوی بەریت شا بوو،

ڕقێکی سەیری لە دڵدا بەرامبەر ئەو هەڵگرتبوو. بەڵام لە دەربڕینی ئەو ڕقەدا تەنانەت لەگەڵ منیشدا کە نهێنییەکانی خۆی لا دەدرکاندم سڵی دەکردەوە. نەك لەبەرئەوەی دەترسا و نەیدەویست کینەکەی ئاشکرا بکات. لە نارەزایی دەربڕیندا درێخیی نەدەکرد. بەڵام دەیخستە قاڵبی نیشتمانپەروەرییەوە. دەیوت: "ئەم زەبروزەنگەی شا لەم قەیرانەی ئێستای جیهاندا بە زیانی وڵاتەکەمان دەشکێتەوە. نیشتمانپەروەر کەسێکە بەر لە ڕووخانی ڕژێم جەزرەبەی بدات". بەردەوام بە منی دەوت کە جێی متمانەی بووم: "ڕۆژێك دەبێ وا جەزررەبەی بدەم کە خۆشی پێی خۆش بێت. بە لایەنی کەمەوە شتێك دەکەم کە ئیتر نەتوانێت ئازارم پێ بگەیەنێت". باش بیرم دێ، کاتێك ئەو ڕۆژنامەیەم پیشان دا کە خواداداد بە منی دابوو، تەماشایەکی کرد، خوێندییەوە و بێدەربەستانە پێکەنی و وتی: "لەگەڵ ئەم مناڵە وردکانەدا دەتانەوێ بەرامبەر بەو پیاوە بوەستنەوە؟ ئەو فوویەك بکات هەمووتان با دەتانبات. گەر کەسێك هەبێت ئەو کارەی لێ بوەشێتەوە، ئەو کەسە منم، نەك ئەو مناڵە وردکانە". وێڕای ئەو زەبروزەنگ و توندوتیژییەشی بەرامبەر ئەوانەی دەیانویست بۆی تێبچێنن؛ لێبوردنی هەبوو. خۆی لە ناحەزەکانی زۆر بە گەورەتر دەزانی و کاتێك یەکێك لەوانە تەڵەیەکی بۆ دەنایەوە و ئەم دڵنیا دەبوو کە لە تەڵەنانەوەکەیدا سەرکەوتوو نابێت؛ دەیبووری، بێباکانە ئەو تەڵەیەی بەرامبەرەکەی پشتگوێ دەخست.

"وابەستەی سەربازیی ئێران لە پاریس ڕاپۆرتی بە شا دابوو کە سەرهەنگ ئارام سەروکاری لەگەڵ ئێرانییە ئاشوبگێڕەکانی دانیشتووی بەرلیندا هەیە. ئەم ڕاپۆرتەش لە ڕاستی خاڵی نەبوو. دوو جارێك، لە سەفەریدا بۆ بەرلین بۆ کڕینی چەك و تفاق و پێداویستییەکانی سوپا؛ لەگەڵ چەند ئێرانییەکدا کە لەوێ تۆوی بزووتنەوەی ڕاپەڕینێکی شۆڕشگێڕانەیان دەچاند ئاشنا بووبوو. کەیفی پێیان دەهات و کاتێك بە بۆنەی کۆنگرەیەکەوە بۆ قوتابیانی پاریس لەوێ ئامادە دەبوون؛ بە گەرمییەوە هەلسوکەوتی لەگەڵدا دەکردن. دەیوت: "من هەقم بەسەر بیروباوەریانەوە نییە. بەڵام ئاخرییەکەی تیدەکەون. تا سەر ناتوانن بە ئارەزووی

خۆیان بلەوەرین. ئازان و ئەمەش لەوانی تریان جیادەکاتەوە. ئەفسووس کە ناتوانن هیچ بکەن. ئەمانە ئەگەر حیسابیك بۆ دلیری و جوامیری و پارە و سامانو رابوردووی خانەوادەکەی من بکەن، کاریان مەیسەر دەبیت". شا راپۆرتەکەی بۆ دائیرەی پشکنینی گشتی ناردبوو و، داوای روونکردنەوەی لییان کردبوو. سەرهەنگ پیاویکی وریا بوو. دەیزانی کە ناردنی ئەم راپۆرتە لە نووسینگەی تایبەتی شاوە بۆ دائیرەی پشکنین و لیپرسینەوە؛ ئەوە دەگەیەنیت کە شا بایەخیکی ئەوتۆی بەو راپۆرتە نەداوە. بۆیە وەلامیکی هۆنییەوە و ناردیو مەسەلەکە دیزەبەدەرخۆنە کرا. چەند رۆژیك دوای ئەو رووداوە، کاتیك بە یەکەوە بەسەر پلیکانەکانی بالیۆزخانەی ئیراندا سەردەکەوتین، لووتمان بە لووتی وابەستەی سەربازیدا تەقییەوە کە پلەیەك لە ئارام بەرزتر بوو. سەرهەنگ داردەستیکی بچووکی بە دەستەوە بوو. تەنانەت کاتیك جلی مەدەنیشی دەپۆشی هەر ئەم دارەی بە دەستەوە دەگرت و یاریی پی دەکرد. بە نەرمییەوە کیشای بەسەر شانی وابەستەی سەربازیداو بە گالتەوە پیی وت: "سەرهەنگ بۆچی لەگەل گەورەتر لە خۆتدا تیدەکەویت؟" وابەستەی سەربازی وتی: "من لە ئاست جەنابی سەرهەنگدا جەسارەتی هیچ ناکەم". ئارام وتی: "لەم جارە دەرس وەربگرە و پەشیمان بەرەوە." ئەمەی وت و تیپەری، وابەستە سەربازییەکە کە پلەی لەمیش گەورەتر بوو لە بەردەمیدا لاچوو تا ئەم بروات و ئارام هیچ زیانیکیبە ناحەزەکەی نەگەیاند، لە کاتیکدا دەیتوانی ئەوە بکات و ملیشی بشکینیت. سەرئەنجام دوای دوو هەفتە ئارامیان بۆ تاران بانگ کرد و وەختی گەرایەوە، کرا بە ئەفسەری تایبەتیی کاروباری شا لە هەموو ئەورووپادا و ئەو سەروەت و سامانەشی لە ریی ئەوەوە پیکەوەنا. هەر لەبەرئەمە هەموو سلیان لیدەکردەوە و تەنانەت بالیۆزی ئیرانیش چاك دەیزانی کە ئەم سەرهەنگ ئارامە؛ دەبێ حیسابی وردی بۆ بکرێ.

"سەرهەنگ ئارام هەر لەو رۆژانەوە لە خوازبێنیکەرەکانی من بوو. بەلام ئەو دەوری عاشقی لەگەلمدا نەدەبینی. ئەو تێروانینێکی تایبەتیی بۆ مەسەلەی

هاوسەرێتی و خۆشەویستی هەبوو. دەیوت: "پیاو پێویستی بە هاوسەرێکە لەگەڵیدا بژی. لە ماڵەوە هەمەکارەی بێت، رێزی لێ بگرێت، بتوانێ لەگەڵیدا بۆ شانۆ و کۆنسێرت بڕوات. ئافرەتێك بێت لە رووی بێت پیشانی ئەم و ئەوی بدات. لە ئاهەنگە ڕەسمییەکاندا لەگەڵیدا بێت. جاری وایە ئەو کارەی لە ئافرەتێکی تێگەیشتوو دەوەشێتەوە لە هیچ پیاوێکی بە توانا و تێگەیشتوو ناوەشێتەوە. بەڵام بە تەنها ئافرەتێکی لەم جۆرە بۆ ژیان بەس نییە. لە هەمان کاتدا خۆشەویستیش لە پێداویستییە بنەڕەتییەکانی ژیانە. گەرچی عیشقی پەتی هەر لە کتێبەکاندا هەیە و بۆ دەبەنگەکان باشە، واتە ئینسان ناتوانێ تەنها بە خۆشەویستی ژیانێکی خۆش بگوزەرێنێت. بە کورتی ئافرەتێك بۆ ماڵەوە پێویستە، چاوی لە مناڵەکانەوە بێت، پێشوازی لە میوانەکان بکات و مشووری تەواوی کاروبارەکانی ماڵەوە بخوات و پیاویش بۆی هەیە جارجارێك لەگەڵ ئافرەتێکی تردا کە لە هونەری دڵڕفێنیدا کارامەیە شیلەی ژیان بمژێت.

"کەم تا زۆر لە ژیانی بێبەندوباری من لەگەڵ هاوڕێ لاوەکانمدا لە قوتابخانەی هونەرە جوانەکان بێئاگا بوو. بەڵام باوەڕیشی وابوو کە ئەم شتانە ئارەزووی ساتەوەختی نین و کەسێك کە بیەوێت ببێتە ژنی ئەو، دەبێ ئەو قۆناغەی بڕیبێت. بۆیە هاتە خوازبێنیم، چونکە وای تەسەور دەکرد کە من ئافرەتێکی سەنگینم و لە کاروبار و بیرکردنەوەمدا وردم. دەتوانم لە هەموو ئەو کاروبار و سەروەت و پلەوپایەیەی کە ئەو دەیخاتە بەردەستم سوودببینم و پشتیوانیی من بۆ هەوڵ و کارەکانی ئەو سوودمەند دەبێت. منی بە ئافرەتێکی ئەزموونديدە و ئازا دەزانی و ئەگەر ئیرادەی منیش ببێتە پاڵپشتی خەون و ئاواتەکانی ئەو؛ ئیدی هیچ هێزێك لە ژیاندا ناتوانێت بەرهەڵەستیمان بکات. ڕێکوڕاست پێی دەوتم: "لەگەڵ مندا ژیان بەرنە سەر. من لەم دنیا پڕ ئاشووبەدا دەرگاکانی بەهەشتتان بۆ دەخەمە سەرپشت. هەرچییەکتان بوێت، سەفەر، خۆشگوزەرانی، ڕێز، پارە، ئاڵتوون، خانوو، پارك، زیاتر لەوەی تەسەوری دەکەن و عاشقە بە ئەمەکەکان بەڵێنی وەدیهێنانی دەدەن، من دەیخەمە بەردەستتان. لە ئارەزووە سەرەڕۆکانی من

مەترسن. تێپەڕ و ساتەوەختین. ئەوەی دەمێنێتەوە هەر خۆم و خۆتین". کاتێك مەسەلەی گرتنی کاربەدەستانی پۆست و تیلیگراف هاتە پێشێ، سەرۆکی ئاسایشیان گۆڕی و شا بروسکەیەکی بۆ ئارام کرد و داوای لێکرد لە پاریسەوە بگەڕێتەوە بۆ تاران و کردیان بە سەرۆکی گشتیی دائیرەی ئاسایش.

"چەند ڕۆژێك دوای هاتنەوەی بۆ تاران چووم بۆ لای بۆ ماڵەوە. پێویست بوو سەری لێ بدەم. بەدوورخستنەوەکەی باوکمی نەدەزانی. منیش باسم نەکرد، نەبادا وا بزانێت بۆ ئەو مەسەلەیە سەرم لێداوە. من ئەوم باش دەناسی و دەمزانی هەنگاوێك نانێت پاداشتی نەبێت، منیش نەمویست بچمە ژێر ئەوبارەوە. کاتێك کەوتینە قسە؛ خۆی باسی دوورخستنەوەکەی باوکمی هێنایە ئاراوە و وتی: "ئەمە یەکێکە لە کارە گەمژەکانی سەرۆکی پێشوو و، بە شای ڕاگەیاندبوو کە ئەگەر باوکتان تا چەند ڕۆژێکی تر لە تاراندا بمێنێتەوە؛ شار دەخرۆشێت. لە کاتێکدا کە.. چیتان عەرز بکەم.." وتم: "باوکیشم حەزناکات بۆ تاران بگەڕێتەوە. بەڵام کە هەر لە دووخراوگە بێت.. بۆ کەربەلای بنێرن باشترە. بۆ ئێوە جیاوازیی نییە، واتە نامەوێ لەم ڕووەوە داوایەکتان لێ بکەم". وتی: "ئێوە ئەمر بفەرموون. من هەمیشە لەبەر دەستاندام. من ئێستاش هەر لەسەر داواکەی جارانم سوورم". پرسیم "چ داوایەك؟" وتی: "ئەو داوایەی کە خانمی بەڕێز ئاگادارین" وتم: "جەنابی ئەفسەر، دیارە کە گاڵتە دەکەن. ئێوە وا بوونەتە سەرۆکی گشتیی ئێمە و چی کچانی شارە خۆزگە دەخوازن ببنە هاوسەرتان" بەدوا قسەکەمدا هات: "بەڵێ، بە کورتی کێشەکە لێرەدایە. ئەوانە هەموو خۆزگە بە هاوسەرێتیی من دەخوازن، بەڵام ئەوەی من خۆزگە بە هاوسەرێتیی دەخوازم، منی ناوێت" وتم: "جەنابی ئەفسەر گاڵتە دەکەن". وتی: "ئێوە وای لێك بدەنەوە". چەند ڕۆژێك دوای ئەوە بلیتەکەی باوکمی بە ناوی منەوە نارد و، هەموو کار و پێویستییەکانی تری سەفەری بۆ ڕەخساند. تەنها داوای لە من کردبوو کە بۆ باوکم بنووسم نەگەڕێتەوە بۆ تاران و هەر لەوێوە بۆ کەربەلا بچێت. قەرار بوو دوای ئەو بە دوو مانگ دایکشیم بڕوات.

"من دڵنیام کە وەختێك تەلەفۆنم بۆ کرد و بۆ شێو دەعوەتم کرد، ئەو بێگومان بووە لەوەی کە من دەمەوێ داوای چەند ساڵەی بهێنمە دی و، هەرگیز ئەوەی بە خەیاڵدا نەهاتووە کە من داوای ئازادکردنی تاوانبارێکی سیاسیی لێ دەکەم.

"مێزێکی فراوانم بۆ ڕازاندەوە. ویستم دەعوەتێکی شایستە بێت. مەبەستیشم ئەوە بوو کە هیچ نەبێت پاداشتی چاکەکانی بە جۆرێك بدەمەوە کە لە جێی خۆیدا بێت. ئاشپەزێکم لە ئوتێلی پالاس داوا کرد و فەرمانم دا کە شێوێکی باش ساز بکەن. گوێم نەدایە ئەوەی چەندی تێدەچێت. شەمپانی، ویسکی، جن، شەرابم ئامادە کرد و، گەرچی نەدەگەیشتە ئەو دەعوەتانەی ئەو کە لە ئوتێلە پلە یەکەکانی پاریس دەیکردم؛ بەڵام ئەوەندەی پێم کرا درێخیم نەکرد. بۆ نانخواردن دایکیشم لەگەڵماندا دانیشت و قسەکانمان لە قسەی ئاسایی ئەم جۆرە دانیشتنانە تێنەپەڕی. باسی بیرەوەرییەکانی فەرەنسامان دەکرد، سەبارەت بەو کەسانە دواین کە دەماننناسین. لە بەردەمی دایکمدا ستایشی منی کرد؛ ڕەفتاری لەگەڵ دایکمدا زۆر پڕ ڕێز بوو. مەسەلەی سەفەرەکەی دایکمی هێنایە پێشەوە و دایکیشم وتی کە هێشتا ئاغا نەیتوانیوە شوێن و حاڵ و ماڵ دابین بکات و هەر ئەوەندە نامەی گەیشت؛ ئەمیش سەفەر دەکات. پرسیی: "بلیتتان وەرگرتووە؟" دایکم وتی: "جارێ نەخێر". وتی: "تکا دەکەم هەرکاتێك بڕیاری سەفەرتان دا؛ تەلەفۆنێك بۆ بەندە بکەن تا بۆتانی بنێرم". ئینجا ڕووی کردە من و وتی: "ئەوسا هەر من و خانم دەمێنینەوە، نازانم تا ئێستا داواکەی منتان بە خانمی دایکتان وتووە؟".

–بەڵێ دایکم، ئاگادارە.

"دایکم لە خوای دەویست ئەو مەسەلەیە بێتە گۆڕێ. وتی: "ئێمە هیچمان قسەی تێدا ناکەین. ئاغای باوکی لە خوای دەوێت. ئومێدەوارم کە خۆشی قایل بێت. کێ لە جەنابتان شایستە ترە؟" من بە پێکەنینەوە ڕووم تێکرد و وتم: "جەنابی ئەفسەر، ئەمشەو بۆ ئەوە نەهاتووین تا خوازبێنیم بکەن".

پێکەنی و وتی: "نەخێر، بەڵام بیرم لێ دەکردەوە".

"شێو تەواو بوو. من هەڵسام و وتم: "با ئەم مەسەلەیە هەڵگرین بۆ کاتێکی تر. ئێستا بفەرموون بــا بڕۆیــن لــە هۆڵەکــە قاوەکــەمان بخۆینــەوە. دەمــەوێ لــەوێش دەربــارەی مەســەلەیەکی دی قســەتان لەگــەڵ بکـــەم". هــەورێکی تــاریك ســیمای تەنییــەوە. لەوە دەچوو چاوەڕێی ئەوە نەبووبێت کە من داوای شتێکی لێ بکەم. ئەویش هەڵسایە سەرپێ و بەرەو لای من هات. ژێر باڵمی گرت و وتی: "فەرموون با بڕۆین. خــانم نافــەرموویت؟" دایکــم وتــی: "نــەخێر، مــن داوای لێبوردنتــان لێ دەکــەم". خواحــافیزیی لــە دایکــم کــرد و قۆڵــی منــی گــرت و وتــی: "هەرچییــەك بفەرموون؛ بە چاوان. تەنانەت بەرلەوەی بشزانم داواکــەتان چییــە؛ مــن ئامــادەم جێبەجێی بکەم". وتم: "جەنابی ئەفسەر، گەلێ خۆشحاڵم. خۆشم هەر چاوەڕێی ئەوە بووم". یەکێك لە خزمەتکارەکانم بانگ کرد و وتم: "قاوە و شەرابەکە بهێنن بۆ هۆڵەکە"

"لە هۆڵەکە، بە دیواری سەرەوە، تابلۆیەکی گەورەی مامۆستا هەڵواسرابوو. تابلۆکە سەرنجی ڕاکێشا و پرسیی: "ئەمە ئیشی کێیە؟" وتم: "ئیشی مامۆستا ماکانە" پرسیی دەیناسن؟" وتم: "نەخێر، هەر ناسینێکی سەرپێییانە".

"لەســەر کورســییەك دانیشــت، قــاچی خســتە ســەر قــاچ. پاکــەتی جگەرەکــەم پێشــکەش کــرد. جگەرەیــەکی هــەڵگرت، خۆشــم جگەرەیــەکم هــەڵگرت. هەڵســا، شــقارتەکەی داگیرســاند و هێنایــە بــەردەمم و وتــی: "ئینســانێکی گێرەشــێوێنە" پرسیم: "کێ" وتی: "ئەم نیگارکێشە". پرسیم: "چۆن؟" وتــی: :" هیــچ، بــەڵام کەسێك نییە پێی بڵێت کابرا دانیشە و خەریکی ئیشەکەی خۆت بە. هەقت بەسەر سیاسەتەوە چییە!".

"خزمەتکارەکە جزوەی قاوە و فنجانەکان و بوتڵێــك شــەراب و پەرداخــەکانی لەسەر مێزێکی بچووك کە تەختەکەی زەرد بوو دانا و ڕۆیشت. هێشــتا ئــەو بــە تــەواوی نــەچووبووە دەرێ کــە مــن وتم: "حــەز دەکــەم کــەمێك بــە تــەنیا قســەتان لەگــەڵدا بکــەم". وتــی: "چاکــە، پێــم خۆشــە، چ فەرمایشــتێکتان هەیــە؟" وتم: "پێویست ناکات دەربارەی داواکەم قسەتان لەگەڵدا بکەم، چونکە خۆتان بەڵێنی

جێبەجێکردنیتان دامێ. کاتێك تەشریفتان ڕۆیشت، بیرتانی دەخەمەوە". وتی: "ئەی ئەگەر نەڕۆیشتم". وتم: "نە.. دەڕۆن". بە پێکەنینەوە پرسیی: "ئەی ئەگەر نەڕۆیشتم چی؟" منیش بە پێکەنینەوە وەڵامم دایەوە: "کەیفی خۆتانە،بەڵام مەملەکەتەکەمان پڕە لە پیاوانی ئاسایش. ئەوسا منیش پاسەوانەکان بانگ دەکەم". قاقا پێکەنی: "هەر خۆش بیت.. ڕاست دەفەرموون". پرسیم: "جەنابی ئەفسەر لە کارەکانی خۆتان قایلن؟" وتی: "دەتانەوێ قایل نەبم؟" پرسیم: "لە پاریس ئاسوودەتر نەبوون؟" وتی: "بێگومان ئەوێ باشتر بوو. بەڵام من خۆشم حەزم لە پلەوپایەیە". پرسیم: "لەوە زیاتر چیتان دەوێت؟ سەرۆکی دائیرەی ئاسایش واتە ئەو کەسەی دوای شا هەموو کاروبارێکی بەدەستە". وتی: "بارودۆخی وڵات هەروا نامێنێتەوە. دەمەوێ خۆم ببم بە هەمەکارە".

-ئەی چۆن دەبێ؟

وتی: "دونیا ڕووە و جەنگ دەچێت. گەر دەزانن ئاڵمان چۆن خەریکن خۆیان چەکدار دەکەن؟" وتم: "بە ئێمە چی؟" وتی: "هەر ئەوەندە تەقەو ڕەقە پەیدابوو، یارۆی لای خۆمان دوو پێی هەیە؛ دووانی تریش قەرز دەکات و تێیدەتەقێنێت". وتم: "ئەی کەواتە بۆچی ئەوەندە خزمەتی دەکەن؟" پرسیی: "ئێوە لە کوێ دەزانن کە من خزمەتی دەکەم؟" وتم: "دەبینم خەڵکی ئازار دەدەن. کێ نازانێت کە ئێوە لە خۆڕایی خەڵکی دەگرن؟" وتی: "بۆ نموونە کێم گرتووە؟" وتم: "لەم چەند ڕۆژەی دواییدا ئەوەندەی من ئاگادارم؛ بە لایەنی کەمەوە پێنج کەستان گرتووە". وتی: "جا با لە وڵاتێکی دە ملیۆنیدا دە پانزە کەس بگیرێ؟" ئینجا سیمای گۆڕا و وتی: "باشە ئێوە چۆن ئەمە دەزانن؟" وتم: "دایکی یەکێك لەو گیراوانە، دوو سێ ڕۆژ لەمەوبەر هاتە لام و لێم پاڕایەوە تا کوڕەکەی ڕزگار بکەم". پرسیی: "ناوی چییە؟" وتم: "موحسین کەمال".

"ناوچەوانی گرژ کرد. دەستی بۆ ئەملاولای لێوی برد و دوو جار تا ژێر چەناگەی پەنجەکانی بەملاولای ڕوومەتەکانیدا هێنا. بە نەرمییەوە وتی: "خانم، لێرەش خۆتان بەو کارانەوە خەریك نەکردبێت کە لە پاریس خۆتان پێوە خەریك

کردبوو؟" پرسیم: "بۆچی من لە پاریس خۆم بە چییەوە خەریك کردبوو؟" وتی: "چوزانم؟ بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و یاریی منداڵە وردکەکان". وتم: "کەواتە لەم ڕۆژانەدا منیش دەگرن؟" وتی: "نەء، ناتانگرم، دەتانخەمە سندووقێکەوە؛ دەرگای سندووقەکە مۆر دەکەم و بە فڕۆکە بۆ فەرەنساتان دەنێرم". وتم: "باشتر نییە بمنێرن بۆ لای باوکم؟" وتی: "نەء، لەوێ لەدەستم دەرئەچن". وتم: "دیارە هەر داتان ناوە ڕۆژێك لە ڕۆژان بچنەوە بۆ فەرەنسا؟" وتی: "لە گاڵتە دەرچێت. ڕاستیتان دەوێت، مانەوەی من لە ئێراندا کاتییە. ژیان لە ئێراندا و لەناو ئەم دڕندانەدا، لەگەڵ سروشتی ناسکی مندا ناگونجێت. ئەمە ژیانە لەم شارە بۆگەنەدا؟ من هەر لە بنەڕەتدا بۆ ڕابواردن و خۆشگوزەرانی خوڵقاوم. ئەو ئاهەنگانە، ئەو شەونشینییانە، ئەو ئافرەتە شۆخ وشەنگانە، پیاو واز لەو نازونیعمەتە هێنێت و بێت گوێ لە قسەی سووك بگرێت؟ ئەمە ژیانی پێ دەڵێن؟" پرسیم: "بۆچی شا هیچ قسەیەکی بە ئێوە وتووە؟" وتی: "کە قسەی سووکی بە سەرۆك وەزیران وتبێت، دیارە نۆرەی منیش دێ". وتم: "ئێوە ئاوا دەڵێن، ئەی دەبێ خەڵکانی ژێردەستی ئێوە چی بڵێن؟" بە تووڕەییەوە وتی: "ئێی خانم، خەڵك؟ خەڵك کێن؟ ئاخر ئەمانە Mentalite(7) یان وا هەڵکەوتووە. لەوە زیاتر تێناگەن. ئەمانە وەکو ئەو بۆقە وان کە بتەوێ لە ئاوێکی قەوزاویدا دەریبهێنیت و لەناو پەڕی قوودا بیخەوێنیت. بۆقەکە هەر قەوزەکەی پێ خۆشە. بە ڕاستی من تاقەتم چووە. لێرە ڕۆژێك چییە ئاسوودە نیم. دەشێ ڕۆژێك خۆشم تووش بکەن. واش نەزانن دوور خستنەوەکەی باوکتان بۆ کەربەلا کارێکی هەوا ئاسان بوو، من نامەوێ منەتتان بەسەردا بکەم. لە دائیرە پێڕێك سیخوڕی بێشەرەف هەن و بەردەوام ڕاپۆرتی درۆ بۆ دەربار دەنووسن. ئەوەی سەیرە ئەوەیە بۆچی تا ئێستا کەس سەرنجی ئەم خاڵی لاوازییە گەورەیەی نەداوە. پانزە ساڵە پایە و بناغەی کاری ئەم وڵاتە لەسەر ڕاپۆرتی درۆ بەندە. دەبینن کە هەر لە جێی خۆشیاندا ماون، لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر کاری خۆیان بەردەوامن. چۆن ئیش وا بەڕێوە دەچێت؟" وتم: ئەوەتانێ خۆشتان هەر بە پێی ئەو ڕاپۆرتە درۆیانە کاردەکەن".

وتی: "قسەکەتان تا ڕادەیەك ڕاستە" وتم: "تا ڕادەیەکی چی؟ هەر ئەو موحسین کەمالەتان بە پێی ڕاپۆرتی درۆ گرتووە". وتی: "نا.. گیانی من.. مەسەلەکە ئێجگار بەو جۆرەش نییە. کوڕەکە خەریکی بڵاوکردنەوەی بەیاننامە بووە". وتم: "ئاخر بۆ بەیاننامەیەك دەبێ قەپان لە کوڕەکە ببەستن؟" پرسیی: "ئەمەیانت چۆن زانی؟".

"ئینجا تۆزێك ڕاما. جگەرەیەکی پێکرد و وتی: "تەلەفۆنەکەتان لە کوێیە؟" وتم: "لە داڵانی سەرەوەیە". پرسیی: "سەعات چەندە؟ لە دەونیو تێپەڕیوە؛ ئەگینا هەر ئێستا فەرمانم دەدا موحسین کەمال بەربدەن. سبەینێ بەری دەدەم. بەڵام دڵنیاش بن ئەمە خراپ بەسەر خۆمدا دەشکێتەوە". وتم: "منیش دڵنیام کە کارێکی باش دەکەن و هیوادارم خوا پاداشتتان بداتەوە". وتی: "ئەم قسانە لە دایکتانەوە فێربوون، یەکێك نەزانێت دەڵێت کچەکە هەموو عومری لەسەر بەرماڵ بەسەربردووە. من ئێستا کە دوو مانگە لە ئاسایشدا کاردەکەم و لە ساڵێکیش زیاتر لەوێ نامێنمەوە. دەبێ لە ماوەی ئەم ساڵەشدا هەموو کارەکانی خۆم ئەنجام دابێت". پرسیم: "کام کارانە؟" وتی: "کاری دابینکردنی ژیانی خۆم بە جۆرێك کە کەس ئیتر نەتوانێت زیانم پێ بگەیەنێت". پرسیم: "جا سوودی ئەوە چییە؟" وتی: "پاشەڕۆژتان لەبەرچاو بێت. وەکو پێم وتن ڕژێم ڕووە و پاشاگەردانی و نەمان دەچێت. کۆنترۆڵکردنی خەڵکی لە کاتی شەڕدا شتێکی ئاسان نییە. کەم تا زۆر ئازادی بە خەڵکی دەدرێ و منیش گەر بتوانم گورزی خۆم لە ڕژێم بوەشێنم و ڕابکەم، سەرمایەیەکی گەورە بۆ پاشەڕۆژی خۆم پێکەوە دەنێم". وتم: "لەم بارەدا بێگومان ڕای ئینگلیزیشتان بەلای خۆتاندا ڕاکێشاوە؟" وتی: "ئێستا من کارم بەوان نییە. بەڵام لە کاتی خۆیدا دەشێ ئەوان خۆیان بەدواما بگەڕێن. کێ لە من باشتر دەدۆزنەوە. ئەوسا من ئالاهەڵگری ئازادی دەبم". پێکەنیم و وتم: "بە وردی حیسابی هەموو شتێکی خۆتان کردووە". وتی "هەموویان وا بیردەکەنەوە. هەر کەسە و بیر لە خۆی دەکاتەوە. لە گاڵتە دەرچێت. دەمەوێ ئەمەیانتان بە جیدی پێ بڵێم. ئومێدەوارم تا ئەوکاتە بڕیاری تەواوی خۆتان دابێت. تا لە ئەوروپا بین؛

ژیانێکی شاهانەت بۆ دابین دەکەم. کاتێکیش بارودۆخ شێوا و بۆ ئێران گەڕامەوە، ئەو دەمە گەر سەرکەوتنم وەچنگ هێنا، ئێوە دەبنە هەمەکارە. تەواوی توانا و سەروسامانم کەبەردەوام لە زیادوبووندا دەبێت دەخەمە بەردەستی ئێوەوە، ئەوسا ڕێی تەواوی کۆڕ و کۆبوونەوە گەورەکانی ئەورووپا لەبەردەمتاندا والا دەبێت. پادشا و سەرکۆمارەکان پێشوازیتان لێ دەکەن و دەستتان ماچ دەکەن. گەر سەرکەوتنیش وەچنگ نەهێنم، ئەوا تا ئەو ڕۆژەی لە ئێران دەردەچم؛ سەرمایەیەکی ئەوتۆ کەڵەکە دەکەم کە بە درێژایی تەمەنتان لە ئەورووپادا نوقمی خۆشگوزەرانی بن و هەست بە هیچ جۆرە کەموکورییەك نەکەن. ئەمە زێدەڕۆیی نییە کە پێتانی دەڵێم، ئەمەتان پێ دەڵێم تا بزانن کە لەگەڵ مندا ژیانێکی خۆش بەسەر دەبەن. باشە، کاتیش درەنگە. خواحافیزی لە خانمی دایکتان بکەن. ئومێدەوارم زوو بتانبینم. حەز دەکەم زووترین کاتیش وەڵامم لێ بگێڕنەوە".

"ویستی دەستم بگوشێت و خواحافیزی بکات. دەستیم گرت و وتم: "سبەینێ موحسین کەمال بەریدەن. دایکیگەڵ خۆشحاڵ دەبێت". وتی: "دایکی لێرە نییە. بۆ ڕاست ناڕۆن؟ ئێوە پێی خۆشحاڵ دەبن، ئەوەش بۆ من بەسە. کچە باشەکە. تەنها داوایەکتان لێ دەکەم. ئەگەر دەربارەی ئەم منداڵەوردکانە شتێك دەزانن پێم بڵێن. من ئازاریان پێ ناگەیەنم. بەڵام بەرەکەی ژێرپێیان کۆدەکەمەوە. ئەمە هەم بۆ ئێوە باشە و هەم بۆ منیش. زوو بێ یا درەنگ من کلکی هەموویان دەکەم. ئەو بەرەیە لەژێر پێیان دەردەهێنم. ئەمە یەکێکە لە کلیلەکانی سەرکەوتنی من. وەختێ شا دڵنیا دەکەم کە لە ماوەی پێنج شەش مانگدا توانیومە ئەو منداڵە وردکانە لەناو بەرم، ئەو متمانەی بە من زیاتر دەبێت و ئەوسا منیش ئاسانتر دەتوانم گورزی خۆمی لێ بوەشێنم. ئەوەشتان پێ بڵێم، گەر سەرەتا بمزانیایە داوای ئازادکردنی یەکێك لەوانەم لێ دەکەن هەروا بە ئاسانی قایل نەدەبووم. بێگومان مەبەستیشم ئەوە نییە ئەوە بکەم بە منەت بە سەرتاندا، نا.. ئەوە لە ڕەوشتی مندا نییە.. بەڵام لە ناخی دڵەوە پێتان دەڵێم کە هیوادارم ئیتر لەمەودوا ئەم جۆرە داوایانەم لێ نەکەن! تەنها مەگەر لە بارێکدا کە هەموو

نهێنییەکانم پیێ بڵێن و منیش بەرەکەی ژێرپێیان دەربێنم. بەهەرحاڵ داوایەکم لێ مەکەن کە ناچاربم رەتی بکەمەوە. هی کەسێکیش کە ئاواتمە هەموو داخوازییەکانی بۆ بەدی بهێنم. چونکە دڵنیام کە ئێوە ناتانەوێ ئازارم پێ بگات و ئەنجامی ئەم جۆرە داوایانەش زۆر خراپ لەسەرم دەکەوێتەوە. سوپاس بۆ ئەو خزمەتە. خواحافیزی لە خانم بکەن. گەر نامەتان بۆ ئاغای باوکتان نارد سڵاوی منی پێ بگەیەنن و بڵێن هەر کارێکی هەبێت من بۆی ئەنجام دەدەم"

"خزمەتکارەکەم بانگ کرد. فەرمانم دا شۆفێرەکەی ئاگادار بکەنەوە. تا بەردەرگا بەرێم کرد و پاشان گەڕامەوە بۆ هۆڵەکە. لەسەر کورسییەك پاڵم دایەوە، پێکێك شەرابی ترم خواردەوە و کەوتمە دونیای بیرکردنەوەوە.

"ئاغای چاودێر، ئێوە باش دەزانن بیرم لە چی کردۆتەوە. زانینی کۆتایی چیرۆکەکە ئاسانە. ئایا شەیتان چووبووە بنکلێشەمەوە؟ ئایا ئاسوودەیی، حەز بەڕابواردن، خۆشگوزەرانی، هەموو شتە خۆش و جوانەکانی پاریس و بەرلین، ژیانی رەنگاورەنگی ئەوروپا، شانۆ، کۆنسێرت و هەزاران سەرگەرمیی دی، ئەمانە وەکو دووکەڵێکی سرکەر منیان گێژ کردبوو؟. نەء.. وا نییە. گەر سەد ئەوەندە خۆشیی تریش بچوایەتە سەر ئەوانە؛ ئینجا لە ئاست یەك سات فڕینی سەر باڵەکانی خۆشەویستی، ئەو خۆشەویستییە پاکژەی من بۆ مامۆستادا؛ هیچ نەبوو. من چۆن دەمتوانی لەگەڵ ئەم پیاوەدا بژیم، کە هەموو شتێکی بە تەنها لەچاوی خۆیەوە دەبینی و، ئەو شوێنەی کە تیایدا دەوەستا بە مەڵبەندی زەوی و زەمەن و دونیای سەرمەدیی دەزانی؟ من چۆن دەمتوانی لەگەڵ کابرایەکدا گوزەران بکەم کە خودی منی نەدەویست و تەنها حەزی بە ناوی بنەماڵە گەورەکەی ئێمە دەکرد، ئەویش بەو مەبەستەی بیکاتە هۆیەك لە هۆیەکانی گەیشتنی بە مەرامەکانی؟ بیری لێ بکەنەوە! دەیویست من بکاتە ژنی خۆی تا لە ئاهەنگەکانی دەرباردا لە ئەوروپادا دەست بخاتە ژێر باڵم و خۆی با بدات کە جوانترین ژنی هەیە. دەیویست بمکاتە ژنی خۆی تا تینوێتیی گەیشتنی بە مەرامەکانی خۆیم پێ بشکێنێت. دەیویست ببێتە مێردم تا ماڵێکی پڕ

حەوانەوەی هەبێت، لەناو پێخەفی گەرمدا بنوێت و خواردنی بەلەزەتی بۆ لێ بنرێ و ئاسایشــی دابـین بکـرێ. بەرامبــەر ئـەوەش چـی بـە مـن بـدات؟ پـارە، خــانوو، خۆشگوزەرانی، سەفەر بۆ فەرەنسا؟ مـن خۆشـم ئەمانـەم هـەبوو. جـوان بـووم و دەمتوانی لە رێی جوانییەکەمەوە لەوەش زیاتر بەدەست بهێنم. ئەو نەیدەویست تەنانەت دڵە وشك و شـوومەکەی خۆشـیم بداتـێ. ئـەو ژنێکـی دەویسـت ژیـانی ماڵـەوە و بـەخێوکردنی مناڵـەکانی بـۆ دابـین بکـات؛ کۆمـەڵێك ئـافرەتی تریشــی دەویست تا ئارەزووە چەپەڵەکانی تێر بکات؛ ئەو پێشنیازی ژیانێکی وای بـۆ مـن دەکرد.

"ئەوەتان لە یاد نەچێت کە من لـە ژیانـە پـڕ ڕابواردن و خۆشییەکەی فەرەنسا بێزار بووبووم، تەنها لەبەرئەوەی لـەوێ هـەموو منیـان خـۆش دەویست؛ بـەڵام مـن کەسـێکم نەدەبینییـەوە شایسـتـەی خۆشەویسـتی و میـهرەبانیی مـن بێـت. لــە فەرەنگسـتان بـۆ جـاڕس بـووم؟ لەبەرئـەوەی لـە پڕێکـدا هەسـتم بـە تـەنیایی و بێچارەیی خـۆم کرد. سـەیرم کرد هونەرمەند نیم و ئەو تاقە تەسەللایەش، واتـە هونەری نیگارکێشان؛ لە نیگای پڕ لـە خـەندە و لـە گـەرمیی خـۆی بێبەشـی کـردم. بەڵام لە ئێران کەسێکم بینییەوە کە هەم هونەرمەند بوو؛ هەم خۆشیشم دەویست.

"کە لەسەر کورسییەکە پاڵم دابۆوە؛ نیگارخانەکەیم هاتـە پێشـچاو. هەسـتم کرد خۆشترین جێگـا بەلامـەوە لـەم دونیایـەدا نیگارخانەکـەی ئـەوە، کـە تیـایدا کەسانێکی وەکو من دانیشتوون، دووراو دوور سەیرم دەکەن. نیگارخانەکەی ئەو جێـی ئاسـوودەیی مـن بـوو. لـەوێ کـەس بە چاوی ڕابـواردن یـا ڕقـەوە تەماشـای نـەدەکردم. ئەوانـەی لـە نیگارخانەکـەی ئـەودا دەژیـان، کەسـانێك بـوون کـە مــن تەسـەورم دەکردن؛ بـەڵام نـەمدەتوانی وەك ئــەو لــە قـاڵبێکی زینـدوو و ڕۆحـداردا بەرجەستەیان بکەم. لە نیگارخانەکەی ئەودا ئەو شتانە بەرجەستە بووبوون کـە من شـەیدای پـەیپێبردنیان بووم. چـەند کـەیفم بـە قریـوەی ئەو کیژانە دەهـات کـە گازیان لە گەنمەشامی دەگرت. سیمای ڕووخۆشی دەروێشەکە بە چاوی گـەورە و برۆ پڕەکانییـەوە، ئـەو مـارگرەی کـە دەیویست گـاز لەسـەری مارەکە بگرێـت، ئـەو

شاعیرەی کە لەسەر پێستەیەك دانیشتبوو و مقەڵییەکی لەبەردەمدا بوو و چای تێدەکرد، هەموو ئەمانە بە من ئاشنا بوون. هەر یەکێکیانم ڕۆژێك لە ژیانمدا دیبوو".

"ناگەهان سیمای شڵەژاوی مامۆستا هاتە پێشچاوم. هەستم کرد کە چاوەڕێی منە و پێویستە من یارمەتیی بدەم. قسەکەی سەرتیپ ئارامم بیرکەوتەوە. هەستم کرد ژیانی لە مەترسیدایە و دەشێ لە هەر ساتێکدا بێت تووشی کارەساتێك ببێت. وتبووی: "ئینسانێکی گێرەشێوێنە" دەمویست یەکسەر بەرەوماڵیان بچم. بەڵام کات درەنگ بوو.، جگە لەوە گومانم نەما کە ماڵەکەشیان خراوەتە ژێر چاودێرییەوە. ئیتر وای پێویست دەکرد من مشووری ڕزگارکردنی مامۆستا بخۆم؛ نەك هی ئەو ڕێی تێکۆشانەی کە گرتبوویە بەر. ئیدی دوای ئەو چاوپێکەوتنەم لەگەڵ سەرتیپدا، دوای ئەوەی ئەو داوایەمی زۆر بە گران وەڵام دایەوە، ئاشکرا بوو کە دەبێ‌گیانی مامۆستا لەو بەڵایە بپارێزم کە دەوروخولی داوە.

"سەعات یانزەی شەو بوو. لە یانزەش تێپەڕیبوو. تەلەفۆنێکم بۆ ماڵی مامۆستا کرد. چەند زەنگی لێ دا، کەس وەڵامی نەدایەوە، وتم لەوانەیە خۆی لە ماڵەوە نەبێت. جارجار شەو درەنگانێ دەچێتەوە بۆ ماڵەوە. جارجار بۆ پیاسە و گەڕان دەچێت. بەڵام ئەی ئاغا ڕەجەب بۆ وەڵام ناداتەوە. دوو سێ جار تەلەفۆنم کرد؛ بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە. ترسێکی تەواو دایگرتم. وتم هەبێ و نەبێ شتێك ڕووی داوە". "لە پڕێکدا دەنگی دەرگای دەرەوە هات. ڕاچڵەکیم. بەم شەوە درەنگە دەبێ کێ بێت؟ پرسیم: "کێیە؟" بۆم ڕوون بۆوە کە خزمەتکارەکانی ئوتێلەکەن، دەڕۆیشتنەوە. تۆ بڵێی مامۆستایان گرتبێت؟ دوور نەبوو. بە قسەکانی سەرتیپدا وا دەردەکەوێت درەنگ یا زوو ئەو شتە ڕوودەدات. دیارە کە دائیرەی ئاسایش سەرەداوێکی کەوتۆتە دەست. هەوڵم دا ئەڵقەی ڕووداوەکان پێکەوە ببەستمەوە. چەند ڕۆژێك لەمەوبەر لەکاتی بڵاوکردنەوەی بەیاننامەکەدا دووسێ کەسیان گرتبوو. موحسین کەمالیش گیرا. داوای ناونیشانی ئەو خانووەیان لێکردووە کە پلی کۆپی و ئەوراقەکانی تێدا شاردراوەتەوە. سەرۆکی

ئاسـایش مامۆسـتا بـە ئینسـانێکی گێرەشـێوێن دەزانێـت و دەڵێـت: "کلکـی هەموویان دەکەم. ئەو بەرەیە لەژێر پێیان دەردەهێنم". ئایا ئیتر ئەمە نیشانەی مەترسی نییە؟ بریا دەمتوانی هەر ئەمشەو مامۆستا ئاگادار بکەمەوە.

هێـدی هێـدی خـەریکبوو شـەکەتیی ڕۆژ و، مـاندوویی خۆئامـادەکردن بـۆ شـێوەکەو، خـەیاڵی ویسـکی و شـەرابەکە هۆشـیان لێ دەبڕیـم. وەکـو مرۆڤـە تادارەکان لە ئەژنۆمدا هەستم بە ئازارکرد و پەرێشان و نائارامانە خەوم لێ کەوت.

"بەیانیی ڕۆژی داهاتوو تەلەفۆنم بۆ مامۆستا کرد. نائارامییەکەم لە خۆڕایی نەبوو. پرسیم: "بۆ دوێنێ شەو کەس وەڵامی تەلەفۆنەکەی نەدایەوە؟" وتـی: "کەس لە ماڵەوە نەبوو". پرسیم: "ئەی ڕەجەب لە کوێ بوو؟" وتـی: "دوێنـێ عەسر گرتوویانە" وتم: "بۆ؟" وتی: "نازانم".

"زمانم لاڵ بـوو. بێگومـان ئـەو هەسـتی پێکـردم. بـەڵام خـۆی تێـك نـەدا. بـۆ دڵدانەوەی من وتی: "شتەکە زۆر گرنگ نییە. بەری دەدەن" وتم: "ئەمڕۆ فەرهاد میرزا بەردەدەن. من ئێستا دێم بۆ لاتان". وتی: "تکاتان لێ دەکەم تا خۆم وەڵامتان لێ نەگێڕمـەوە مەیـەن بـۆ لام، تەلەفۆنەکـەش دابخەنـەوە". وتم: "ئـاخر مـن کـارم پێتانـە". وتـی: "دەزانم. بـەڵام وەکـو پێـم وتـن: بـە هیـچ جۆرێـك نەیـەن بـۆ لام. خواحافیز فەرەنگیس!" تەلەفۆنەکەی داخستەوە. منیش دەستم بە تەلەفۆنەکەوە وشك بوو و سەرم بە دیوارەکەوە نا. ئیدی ئەوم نەبینییەوە".

"نا، وا نییه، جارێکی تریش بینیمەوە. بەڵام ئەمجارەیان پرکێشیم نەکرد قسەی لەگەڵدا بکەم. ڕووداوەکان وەها خێرا تێدەپەڕین کە ئیتر نەمدەتوانی هیچ بکەم. هەرچەند هەوڵم دەدا پەیوەندی بە مامۆستاوە بکەمەوە؛ کەچی ئەو ڕێی پێنەدەدام، تەنانەت کە تەلەفۆنم بۆ دەکرد زۆر بە کورتی وەڵامی دەدامەوە و زوو دایدەخستەوە. ئەم جۆرە ڕەفتارەی ئەو وەکو ئیهانە دەهاتە پێشچاوم و بەرگەیم نەدەگرت. هەرجارێك کە تەلەفۆنەکەی دادەخستەوە دەتوت بە درێلێك جەرگم کون دەکەن. تەواوی ڕۆژ چاوەڕێم دەکرد. هەمیشە، لە دڵی خۆمدا وام هەست دەکرد کە هەواڵێکیم پێ دەگات. نامەیەکیم پێ دەگات و بۆ ماڵی خۆی دەعوەتم دەکات. تەنانەت جارێکیان وەك پاڕانەوە لێی پاڕامەوە کە لە شوێنێکی تر، لە ماڵی یەکێك لە هاوڕێکانم ببینم، بەڵام قایل نەبوو. هەمیشە، تەنانەت ئەو ساتانەی کە دڵنیاش بووم و بە حوکمی تاقیکردنەوەی ئەو ماوەیەی لەگەڵیدا بووم، دەمزانی لە شوێنێك سەرقاڵی کارێکە، کەچی هەر چاولەڕێی بووم. لە دڵی خۆمدا دەموت ئەو پێویستی بە منە و هەر داوای بینینم دەکات.

وام بە خەیاڵدا دەهات کە ئەو شتەی قەت نەیکردووە؛ دەیکات و لە پڕێکدا بێوادە خۆی بە ماڵماندا دەکات. هەر کاتێك کە بۆ ماڵەوە دەهاتمەوە، گەرچی دەمزانی گەر نامەیەکم بۆ بێت فزە سوڵتان لەسەر مێزی ژوورەکەمی دادەنێت،

کەچی هەر باوەڕم نەدەکرد هیچم بۆ نەنێرێت و، لە بابا و دایکم یان هەرکامێکی تری ماڵەوەم ببینیایە دەمپرسی ئایا کەسێك هەواڵی نەپرسیوم؟ ئایا کەس نامەی بۆ نەهێناوم؟ تەنانەت ئەو نامانەی کە لە دەرەوەی وڵاتیشەوە پێم دەگەیشتن، گەرچی پوولی وڵاتانی دەرەوەشیان پێوە بوو، بەو ئومێدە دەمکردنەوە کە نامەی ئەو بن. بەڵام کاتێ چاوم بە خەتەکە دەکەوت و دەمزانی هی ئەو نین، بە بێئەوەی بیانخوێنمەوە فڕێم دەدانە سەر مێزەکە و، جاری وابوو تا چەند ڕۆژێك لەسەر مێزەکە وەکو خۆیان دەمانەوە.

"ڕۆژێکیان لە شەقامێکدا فەرهاد میرزام بینی. سکێچەکەی مامۆستام بیرکەوتەوە و بە سمێڵیدا ناسیمەوە و چوومە بەردەمی و هەواڵی مامۆستام لێ پرسی. بە وشکی و ساردییەوە وەڵامی دامەوە: "من ئێوە ناناسم" وتم: "من ئێوە دەناسم. ئێوە فەرهاد میرزان. ناوی ڕاستەقینەشتان موحسین کەماڵە". وتی: "بەهەڵەدا چوون خانم، من فەرهاد میرزا نیم" وتم: "من هیچم لە ئێوە ناوێت. دەمەوێ بزانم ئاغا ڕەجەبیان بەرداوە یان نا؟" وتی: "خانم بە هەڵەدا چوون من نە ئێوە دەناسم و نە ئاغا ڕەجەبیش". ئەو قسەیەیم زۆر پێ ناخۆش بوو. بە سووکییەوە تەماشایەکم کرد و بەبێ هیچ پۆزش و خواحافیزییەك ڕووم لێ وەرگێڕا و ڕۆیشتم. لە دڵی خۆمدا وتم: "هەتیوچەی ترسنۆك!من لە بەندیخانە ڕزگارم کرد، کەچی ئێستا دەترسێت قسەم لەگەڵدا بکات". "مانگێکی ڕەبەقم لەو چاوەڕوانییە کوشندەیەدا بەسەر برد. تەواوی ئەو ڕۆژانە دەمویست خۆم لەو دێوەزمە سامناکە ڕزگار بکەم؛ وەلێ ئەو قووڵتر چڕنووکە خوێنینەکانی خۆی لە دڵم دەچەقاند. دوو سێ جار تەلەفۆنم کرد. ڕۆژێك کەسێکی نەناس وەڵامی دایەوە و وتی: "مامۆستا لێرە نییە". جارەکانی تریش، هەر ئەوەندە ئەو تەرەفەی تر دەنگی منی دەبیست، تەلەفۆنەکەی دادەخستەوە. ئاخ، دەزانیت بەدبەختییەکەم لە چیدا بوو؟ هەرچەندم دەکرد باوەڕم نەدەکرد ئەو بەو جۆرە ڕەفتارم لەگەڵدا بکات. ئایا لیم ڕەنجابوو؟ ریك ئەو گفتوگۆیەی نیوانمانم هینایەوە یادی خۆم. وتبووی: "فەرەنگیسی ئازیز، من رزگارکردنی فەرهاد میرزام لە تۆ دەویت. بەهەر

نرخێك بووە دەبێ ڕزگاری بکەیت، ئەگینا دەیکوژن. ئەو کەسێك نییە شت بدرکێنێت لەژێر ئازاردا دەیکوژن". منیش پرسیم: "بەهەر نرخێك بێت؟" وەڵامی نەدایەوە، ڕوونتر پێم وت: "تەنانەت گەر بەو نرخەش بێت کە من هەموو تەمەنی خۆمی بۆ بفرۆشم؟" وتی: "بەو گرانییەش نا". بۆ ڕزگارکردنی هاوڕێکەی ئامادە بوو من بنێرێتە لای سەرۆکی ئاسایش، بەڵام ئێستا کە خۆی لە مەترسیدایە، ئێستا کە گیانی بەتاڵە موویەکەوە بەندە، نەیدەویست من ببینێت. چۆن بیری دەکردەوە؟ وا بیری دەکردەوە لەوانەیە من لەبەر ئەو خۆم بفرۆشم؟ یان لە ترسانا گیانی خۆم بخەمە بەردەستی سەرۆکی ئاسایش؟ ئاخ، گەر ئەم تابلۆیەی بەو چاوانەوە نەکێشایە، وا بیرم دەکردەوە و ئاسوودە دەبووم. بە دوا ژیانێکی ئاسوودە و خۆشدا دەگەڕام و خۆم فڕێ دەدایە وەیلانگەی ژیانێکی ئاساییەوە و تووشی ئەم ڕۆژە نەدەبووم. هەروەکو ئەو ساڵانەی دوایی دەژیام. بەیانیان درەنگ لە خەو هەڵدەسام، هەر لەسەر سیسەمەکە چا و شیر و هێلکە و کەرە و مرەبا و شەرابم دەخوارد. پاش نیوەڕۆ سەرقاڵی ئەسپ سواری دەبووم؛ یان سواری ئۆتۆمبیلێك دەبووم کە بە خێرایی هەشتا نەوەد کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا دەڕۆیی و، لەگەڵ هاوتەرزەکانی خۆمدا پێشبڕکێمان دەکرد و، یان بۆ کۆگاکان دەچووم و شتم دەکڕی. شەویش هەمدیسان کاتی ئارایشت و میوانداری و کاتبەسەربردن و قومار و شەراب و نوکتەبازی و جلوبەرگی قەشەنگ و چەنەبازی دەهات. تا ئەوە بوو ڕۆژێکیان، لە یەکێك لەو ڕۆژنامانەدا کە لە ئێرانەوە پێمان دەگەیشتن، هەواڵی مەرگەکەیم خوێندەوە و پاش ماوەیەکیش لە گۆڤارێکی ئەڵمانیدا ئەم تابلۆیەم بینی بەم چاوە نەفرەتییانەوە. ئیتر لەو ڕۆژەوە ئاوەهام کە دەمبینن.

"بهێڵن با کۆتاییەکەتان پێ بڵێم و تەواوی بکەم. ئێوە تاقەتێکی سەیرتان هەیە. گەر بەمجۆرە بێدەنگ دابنیشن. دەتوانم هێندەی کتێبێك قسەتان بۆ بکەم.

"دوای مانگێك ئیتر حەوسەڵەم نەما. دیسان شەوێکیان سەرتیپم بۆ ماڵەوە دەعوەت کردەوە. لە ماوەی ئەم مانگەدا بەردەوام تەلەفۆنی بۆ دەکردم. کاتێك لە

ماڵەوە نەدەبووم؛ ئەحواڵمی لە دایکم دەپرسی. دوو جار بەر لەوەی پێشتر ئاگادارم بکاتەوە هات بۆ ماڵمان. دادەنیشت و چای دەخواردەوە و جگەرەی دەکێشا! ئاماژەی بۆ داواکەی دەکرد، ئینجا دەڕۆیشت. ئەو شەوە هەر ئەوەندە فرسەتم هێنا، پرسیم: "باشە، ئێستاش هەر خەریکی خزمەتن؟" پرسیی: "چۆن؟" وتم: "ئێستاش هەر خەڵك دەگرن؟" وتی: "نەء، ئیتر خەڵك ناگرین. لانەی خراپەکارییەکەمان دۆزییەوە". پرسیم: "لە کوێ بوو؟:" وتی "یەکێکیان ماڵی مامۆستای نیگارکێش بوو". بە هێمنییەوە پرسیم: "کام مامۆستای نیگارکێش؟" وتی: "خۆتانی لێ هەڵە مەکەن، ئەم مامۆستایە، خاوەنی ئەم تابلۆیە. ئێوە باش ئەو دەناسن. ڕاپۆرت لە ئێوەش دراوە. ئێوەش هامشۆی ماڵی ئەوتان کردووە". وتم: "من مانگێك دەبێ بۆ ئەوێ نەچووم. کاتی خۆی دەچووم تا پۆرترێتم بکێشێت" وتی: "ئەی چۆن بوو ئێمە وێنەی تۆمان لەوێ نەدۆزییەوە؟" وتم: "لەبەرئەوەی من دوو سێ جار چووم بۆ لای و چونکە کەیفم بە کارەکانی نەهات؛ تاقەتم چوو و ئیتر نەڕۆیشتمەوە. کارەکەی تەواو نەکرد. ئێوە ماڵەکەیتان پشکنیوە؟" وتی: "ماڵەکەیمان پشکنی و هەرچییەکمان ویست دەستمان کەوت. بە کورتی سەری گلۆڵەکەمان دۆزییەوە. خۆشیمان گرت، عەجیب درۆزنێکە، تا ئێستا نەمانتوانیوە یەك وشەی لێ دەربهێنین..".

"نامەوێ پێتان بڵێم چ حاڵێکم بەسەرهات. هەر ئەوەندە قسەکانمان گەیشتنە ئێرە، گەرچی من خۆم بۆ بیستنی ناخۆشترین هەواڵیش ئامادە کردبوو، کەچی نەمتوانی بەسەر خۆمدا زاڵ بم. ڕەنگم پەڕی و خەریك بوو گشت لەشم ڕەق ببێت. بەڵام سەرتیپ لەوە بەڕێزتر بوو کە شڵەژاوییەکەم بە ڕوومدا بداتەوە. دانم بە جەرگی خۆمدا نا. ئارام دانیشتم. جگەرەیەکم داگیرساند. شەراب و قاوەم خواردەوە و گوێم بۆ قسەکانی سەرۆکی ئاسایش شل کرد.

".. هەر لێی دەردەهێنین. گەرچی ئێمە شتێکی ئەوتۆشمان لەو ناوێت، تەنها ئەوەمان دەوێت پێمان بڵێت ئەم نامانەی کە لە پاریس و بەرلینەوە بۆی دەهاتن، لە کێوەن. ئیدی کاری ترمان پێی نییە". پرسیم: "تەعزیبیشی دەدەن؟" وتی:

"ناچارین، ئەگینا ناتوانین هیچی لێ دەربهێنین". وتم: "ئەی ئەگەر لەژێر تەعزیبدا مرد؟:" وتی: "گوناهی ئێمە چییە؟ با قسە بکات و سەری خۆی ئاسوودە بکات. ڕاستیشتان دەوێت ئەوساش هەر ئاسوودە نابێت. چونکە شا لە ئاست ئەم مەسەلەیەدا بە ئەندازەیەك تووڕەیە کە هێمن ناکرێتەوە" پرسیم: "دەیکوژن؟" وتی: "هەقی خۆیەتی". وتم: "ئای کە کەسانێکی بەدن ئێوە". هچی نەوت. ئەم قسەیەمی پێ خۆش نەبوو. من ئەم قسەیەم بە دەم زەردەخەنەوە وت، بەڵام دیاربوو زمانە ساختەکەم باش دەرنەهێنابێت و، ئەو ڕاستییەی کە خۆی تێدا حەشار دابوو؛ سەرتیپی ئازار دابێت .

"بابەتی قسەکانمان گۆڕی. دەربارەی بووکەکەی پادشای بەلژیك و ئابڕووچوونەکەی سەرداری گەورەی کرمانی لە مۆنتیکارلۆ و، داگیرکردنی ئوتریش لە لایەن هێزەکانی هیتلەرەوە و، ئاگربەربوونەوەکەی جبەخانە و، دزی لە باڵیۆزخانەی میسر و سەرقاڵییەکانی خۆی دوا و، هەروەها وتی کە وێڕای ئەمانە حەزدەکات جارجار من ببینێت و، باسی هەندێ شتی تریشی بۆ کردم کە تۆزقاڵێك سەرنجیان ڕانەکێشام. هەستی کرد کە وەڵامەکانم ساردن و زۆر لە خۆم دەکەم قسە دەکەم؛ بۆیە زووتر لە جاران هەڵسا و ڕۆیشت.

"کاتێك تەوقەی خواحافیزیی لەگەڵدا کردم، دەستمی گوشی و وتی: "لە دڵی مەگرن هیچ نییە. سڵاوم بە خانمی دایکتان بگەیەنن".

"من هەر ئەو شەوە بڕیاری خۆم لە ژیاندا دا. ئاغای چاودێر، ئێوە بیر لەچی دەکەنەوە؟ ئیدی قسە ناکەن. پرسیار ناکەن؟ تێڕوانینی ئێوە دەربارەی من هێندەی سەرە سوژنێك کار لە ڕەوتی ژیانم ناکات. هەرچییەك بڵێن! یا نەیڵێن! من بە نیگا سەیرەکانتان هەست دەکەم کە دڵتان بە حاڵی من دەسووتێ. من داوای بەزەییم لە کەس نەکردووە. ئێوە لە دڵی خۆتاندا دەڵێن کە من چۆکم دا، ترسام، پەلەم کرد، نەزانانە بڕیاری خۆم دا. ئاخ، ئەمە بە وتن ئاسانە. بەڵام گەر ئەو شەوە ئێوە لە منەوە نزیك بوونایە و من ڕۆحی خۆمم بە ڕووتی پیشان بدانایە، ئێوەش دوودڵ دەبوون و نەتاندەتوانی بەم ئاسانییەی ئێستا دەربارەی ڕووداوەکانی

ڕابوردووم حوکمێکی ڕەها بدەن. حوکمدان بەسەر ڕابوردوودا کارێکی ئاسانە. بەڵام وەختێك خۆتان بەر لێشاوی لافاوەکە دەکەون و سێڵاوی دڵڕەقی ژیان لەم بەردەوە بەو بەردەتاندا دەکێشێت، ئەودەمە گەر توانیتان بەرگە بگرن، گەر توانیتان خۆتان ڕابگرن و نەهێڵن ترس ناختان بکێڵێ؛ بەڵێ ئەودەمە کاتێ ئارامی وەچنگ دەهێنن، لەزەتی بوون دەچێژن. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە چەند خۆشە، چەند ئاسانە. بەڵام ئێوە خۆتان لێکی بدەنەوە. منێك.. بە هەموو ئەو ڕابوردووەمەوە لە ژیاندا، بە هەموو ئەو دوودڵی و پەرەوازەییەوە کە لە بوونما لانەی خۆیان کردبوو، بە هەموو ئەو بێحاڵی و سەرگەردانییەمەوە؛ چاوەڕێی ئەو توانا گەورەیەم بۆ خۆڕاگرتن لێدەکرا؟ من کچی باوکی خۆم بووم. هەر ئەوەندە یەك جار لە ژیانیدا دووچاری چەرمەسەرییەك بوو، سەری دانەواند، چۆکی دا، خاکی ئەدەبی ماچ کرد و گۆشەگیریی هەڵبژارد. چاوەڕێی چی لە من دەکەن؟ مامۆستاش وەك ئێوە ئاوا بە چاوی سووکەوە سەیری منی دەکرد. حەتمەن ئەویش چاوەڕێی شتێکی دیکە بوو لە من. ئەم چاوانە هی ئافرەتێکی هەوەسبازی هەرزەن. دیارە ئەویش لە دڵی خۆیدا وەکو ئێوە بیری لە من کردۆتەوە و وتوویەتی: "هەر ئەوەندە گیانم کەوتە مەترسییەوە، وەکو مراویی ناو زەلکاوەکان خۆی لەنیو گژوگیاکاندا شاردەوە و لە هاژوهووژی دەریاکە هەڵات". بەڵام مامۆستاش بیگوناه نەبوو، دەیتوانی کارم لێ بکات. بۆچی خۆی لە قەفەسی بیدەنگیدا بەند کرد؟ بۆچی هەولی نەدا ڕییەك بۆ دلم بکاتەوە؟ مەرج نەبوو ببوومایە بە هاوسەری یان بە یاری. بەڵام ئایا نەیدەتوانی من بەرەو ژیانیکی سوودمەند ڕابکیشیت کە کەم تا زۆر کەوتبوومە ناویەوە؟ بە پیچەوانەوە، منی لە خۆی و لەو دونیا پڕ تیکۆشانە دوورخستەوە و فریی دامە دونیای ئەو مرۆڤە هیچ و پووچانەوە.

"تازە سوودی چییە؟ بۆچی دەمەوی بەرگری لە خۆم بکەم؟ نا ئەمە بەرگری نییە. هەروەکو لە سەرەتادا وتم مەبەستم خالیکردنەوەی خۆمە لە گرییەك کە خەریکە دەمخنکینیت.

"ڕۆژی دوایی، سەعات شەش و نیوی بەیانی، بەرلەوەی بۆ دائیرە بچێت؛ تەلەفۆنم بۆ سەرتیپ کرد تا بەر لە ڕۆیشتنی بۆ سەر کارەکەی سەرێکم لێ بدات. پرسیی: "چییە.. هەواڵی تازەتان پێیە؟" وتم: "لەوانەیە بەلای ئێوەوە تازە بێت". وتی: "باشە، دێم" وتم: "تکا دەکەم بفەرموون هەر لێرەش نانی بەیانیتان بخۆن". وتی: "خەریکی نانخواردنم. ئێستا دێم".

"هیچ نەبێت دەبێ ئێوە بزانن، بڕیارێکی وا گرنگ لە ژیانمدا کارێکی هێند ئاسان نەبوو. چ ئافرەتێك حەز دەکات لەشی خۆی بفرۆشێت؟ هیچ شتێك لەوە سەختتر و ناخۆشتر نییە ئافرەتێك خۆی تەسلیمی پیاوێك بکات کە خۆشی ناوێت. ئێوەی‌پیاو هەرگیز ئەو ئازارەتان نەچەشتووە. ئەو تەسلیمبوونەش نەك بۆ شەوێك؛ یان جارێك و دوو جار، بەڵکو بۆ ساڵانێکی زۆر. بۆ تەمەنێك! ئافرەتەکەش یەکێکی وەکو من بێت، کە ساڵانێك هەڵوەدای میهرەبانی و نەوازشی پیاوێك بووم کە خۆشم ئەویست و دونیام بە دوویدا تەی کرد، ئافرەتێك کە پاش بڕینی بەردەڵانی ژیان، توانیبووی بەو دواییە تاقە پەناگەی عیشقی خۆی بدۆزێتەوە.

"کاتێ سەرتیپ خۆی بە ژوورەکەمدا کرد و چاوی بە چاوە ئەشکبارەکانم کەوت؛ واقی وڕما. پرسیی: "چی ڕوویداوە؟" وتم: "سەرتیپ، من داوام لە ئێوە کرد بەر لە چوونتان بۆ دائیرە بۆ ئێرە بفەرموون، چونکە کارێکی زۆر پەلەم لەگەڵ ئێوەدا هەیە.." ویستی قسەکەم پێ ببڕێت، وتم: "سەبرکەن! ئیجازە بفەرموون با قسەکانم تەواو بکەم، ئەودەمە ئێوە وەڵامی خۆتان بدەنەوە. من داوایەکم لە ئێوە هەیە و دەشزانم هێنانەدیی ئەم داوایە بەلای ئێوەوە زۆر گرانە. بەڵام دڵنیام کە مەحاڵ نییە. بەرامبەر ئەمەش من ئامادەم هەر داوایەکتان هەبێت جێبەجێی بکەم."

"هەڵساو تەپڵەکێکی لە سووچێکی ژوورەکە هێنا و هاتە نزیك منەوە و دانیشت. دەستی گرتم و ویستی شتێك بڵێت. بەڵام من نەمهێشت و وتم: "سەرتیپ، قسەکانم تەواو نەبوون". وتی: "بهێڵن با منیش قسەیەك بکەم. دەزانم

ئێوە داوای چیم لێ دەکەن". هەر نەمهێشت قسەکانی تەواو بکات، "نا.. بهێڵە با جارێ من قسەکانم تەواو بکەم، من نامەوێ وەڵامەکەتان بە ڕەتکردنەوە بێت. کاتێك کە پێتان دەڵێم هەر داوایەکتان هەبێت جێبەجێی دەکەم، ئەم قسەیەم داواکانی پێشووشتان دەگرێتەوە. من بە تەواوی مەیل و ئارەزووەوە قایلم ببمە هاوسەری ئێوە و ئەمەش بە وەڵامی قەتعی و بێمەرجی من بزانن". دەستی کە لە دەستمدا بوو گوشیم.

"دەتانەوێ باوەڕ بکەن، دەشتانەوێ مەیکەن. من لەم کابرایە؛ وەك پیاو و مێرد قێزم دەهاتەوە و، ئەو هەرگیز جگە لە دووپاتکردنەوەی داواکەی جورئەتی نەکردووە مەیلی خۆی بەرامبەرم دەبڕێت. بەڵام ئەو ساتە کە پێم وت بە تەواوی مەیل و ئارەزوومەوە قایلم ببمە هاوسەری؛ دەست گوشینەکەیم پێ خۆش بوو. وتم: "من ئامادەم و دەتوانم ببمە هاوسەرێکی باش و چۆنتان مەیل لێبێت ئاوەها بەختەوەریتان لە ژیاندا بۆ دابین دەکەم. بەڵام ئێوە دەبێ ماموستا ماکان ڕزگار بکەن. دەشزانم کە ڕزگارکردنی تەنها لە دەستی ئێوەدا نییە. دەزانم کە ناحەزەکانتان هەوڵ دەدەن ئەم ئازایەتییەتان پێ بفرۆشنەوە. دەزانم کە شا ناتانبوورێت، هەزار شتی تریش دەزانم کە ئێوە بیری لێ دەکەنەوە. لەبەرئەوە ئەو شتانەم پی مەلین. لیشم مەپرسن پەیوەندیم بە ماموستاوە چییە. ئیوە کەم تا زۆر دەزانن کە من پەیوەندیی سیاسیم لەگەلیدا هەبووە. لەم داوا گرنگەش زیاتر هیچی ترم لەو پیاوە ناویت کە دەمەوێ ژیانی داهاتوومی لەگەلدا بەسەر بەرم. ماموستا لەم سەد سالەی دواییدا گەورەترین نیگارکیشی ئیرانە. ئەمرۆتان لەبەرچاو نەبیت کە چونکە شا رقی لی دەبیتەوە کەس بایەخی پی نادات، کارەکانیئەو نەمرن. سبەینێ هەر تابلۆیەك لە تابلۆکانی دەبیتە گرانبەهاترین ئاسەواری ئەم وڵاتە. ئەگەر ئەو بە فەرمانی دیکتاتۆر لە بە ریی ئیوەوە بکوژرێ؛ بۆ هەتا هەتایە ئەمە دەبیت پەلەیەك بە ناوچەوانی ئیوەوە. ئەوسا هەرچی ئاواتو خەونەکانیشتان هەن هەمووی با دەیانبات. ئەوسا ناوتان دەنین "جەلادەکەی ماموستا ماکان".. ئەم پیاوە پایەیەکی تایبەتیی لەناو لاوان و پیاوانی

تیگەیشتووی ئەم وڵاتەدا هەیە. ئاخر من خۆم رۆژێ لە رۆژان نیگارکیش بووم و یان ویستوومە ببمە هونەرمەند و دەزانم کارەکانی ئەو چ نرخیکیان هەیە. ئیوە یەکیکی دژ بە دەولەتتان گرتووە. بەڵام بە مەرگی ئەم زیندانییە مامۆستا لە یاد ناچیتەوە و ئیوەش بۆ هەتا هەتایە هەست بە پەشیمانی دەکەن. بۆچی وا بە واقورماوییەوە تەماشام دەکەیت؟ ئیوەیەك کە ترس و واقورمانتان لا نییە. بەلی ئەمە کاریکی گرنگە، کاریکی گەورەیە. ئیوە هەمیشە بە منتان نەدەوت کە دەتانەوێ گورزی خۆتان لەو دوژمنەتان بوەشینن کە ریی سەرکەوتنی لی گرتوون؟ ئەمە باشترین دەرفەتە. مامۆستا لە هەمووجیهاندا ناسراوە.کاروبارتان ریکبخەن. خۆتان نەخۆش بخەن. سەروەتەکەتان، ئەوەی پارەیە بۆ دەرەوەی بگویزنەوە. ئەوەی دەتوانن بیفرۆشن.. بیفرۆشن. مامۆستاش ئازاد بکەن. رییەك بۆ هەڵاتنی لە ئیران بدۆزنەوە. خۆشمان دەچین بۆ ئەوروپا. هەر ئەوەندە لە ئیران چووینە دەرێ ئیدی بۆ ئیوە کار ئاسان دەبیت. لە پاریس، لە لەندەن، لە هەر کوییەك پیتان خۆش بوو کۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسی سازبکەن، چی هەوالدەرەکانی جیهانە ئاگادار بکەنەوە وپییان بلین کە سەرۆکی گشتیی ئاسایش بوون. دیکتاتۆر کاری وای پی سپاردوون کە لەگەل سروشتی مرۆڤانەی ئیوەدا نەگونجاوە. ئەوەی دەیزانن بیلین. ئەو نهینییانەی کە ئاگاداری هەن میری دەهینیتە لەرزە، پەردە لە روویان هەلمالن. دەربارەی ئینگلیز و دەست خستنە ناو کاری ئیرانەوە بدوین، ئینگلیزیش تا سەر ئاغاو کویخا نابیت. لە لایەکی ترەوە، بە تایبەتیش ئیستا کە رێ بۆ دەسەڵاتدارانی هیتلەری لە ئاست ئیراندا والایە و ئەمەش دلی ئینگلیزەکان خۆش ناکا، بیگومان بە کە ئەوان حیساب بۆ ئەم ئازایەتییەی تۆ دەکەن. دەربارەی زولم و ستەمی کاربەدەستانی دەسەڵات بدوێ لە پاریزگاکانی باکووردا، دەربارەی دزی و تالانیی پیاوەکانی دەولەت، دەربارەی گوشاری رژیمی دیکتاتۆری و ئەو چەوسانەوە شوومەی کە لە سەرانسەری وڵاتدا هەیە. بەو بەلگەنامانەوە کە لە بەردەستاندایە؛ پیشانی بدەن کە دەزگای دادپەروەریی ئیران هۆیەکە لە هۆیەکانی چەوساندنەوە و دزی و

تالآنی و هیچی تر. ئیوه باشتر لە من دەزانن. پیویست ناکات من فیرتان بکەم. پیمەکەنن! من بەرژەوەندیی ئیوەم دەویت. باسی ئەوەیان بۆ بکەن کە ئیوه بە فەرمانی دیکتاتۆر مامۆستای نیگارکیشـتان گرتـووه و ویسـتووتانە بە پیـی یاساکان مامەلەی لەگەلدا بکەن. بەلأم ئەو داوای لیتان کردووه کە بیکوژن. بلین: سەرۆك ئاسایشەکانی پیش ئیوه چەندەها وەزیـر و پیـاوی گـەورەی تریـان لـە زینداندا ژەهرخواردوو کردووه و ، خنکاندوویانن و، چونکە ئیوه نەچوونەتە ژیر ئەو بارەوه، هەر لە ئیران هەلهاتوون و لیرە لە ئەوروپا ئەرکی خۆتـان ئـەنجام دەدەن کـە تیکۆشـانە دژ بـە رژیمـی جـەور و سـتەم. ئەمـە ئـەو گورزەیـە کـە دەتانویست لیی بوەشینن. ئیوه ناتانەوێ ببنـە خـاوەن پلەوپایەیـەکی بلند لـە ولآتدا؟ ئەی ئیوه بیرتان لەوە نەکردووەتەوه کە ویرای ئەو سانسۆرە بەهیزەی لە ئارادایە، ئەم قسانەتان؛ دەگاتەوه بە گویی خەلکی ئیران و، ئەمەش لە ئایندەدا چەند لە بەرژەوەندیتاندا دەبیت؟ بـۆ تەنـها سـاتیك بیهینـنـە پیشـچاوی خۆتـان. دەزانـن کـە خـەلکانی ئـازادیخوازی ئـیران چ نرخیـك بـۆ ئـەم ئازایەتییـەی ئیـوه دادەنین؟ پیمەکەنن! دەزانم ئومیدتان بە خەلکی نییە! دەزانم گالتەتان بە وشەی خەلکی و ئازادیخوازی و بزووتنەوه و ئیرادەی میللەت و بەرەنگاری دیت و لییان بیزارن. دەشێ ئەمرۆ وا بیت کە ئیوه تەسەوری دەکەن، بەلأم تەنانەت لەمرۆشدا کەسانیکی وەکو مامۆستا ماکان و موحسین کەمال لەناو ئەو خەلکەدا هەن کە چەند ئازارتـان دا بـەلأم هیچـی نـەدرکاند. ئیـوه خۆتـان بـە ریـزەوه باسـی ئـەو لاوانەتان بۆ دەکردم کە لە بەرلین لەگەلیاندا ئاشنا بوون. لەوانە لە ئیرانیشدا هەن و لـە ئـەوروپاش چاودیریتـان دەکـەن. ئایـا ئیـوه دەزانـن کـە ئـەوه گـەورەترین سـەرمایەیە بـۆ ئـایندەی خۆتـان پیکـەوەی بنیـن؟ وا مـەزانن کـە خـەلکی ئـیران هەتاهەتایە ئاوەها سارد و بیدەربەست و هیچ لەباردا نـەبوو دەبـن. ئیـوه نـالین چـەند سـالیکی دی جـەنگی جیـهانی بـەرپا دەبیـت و بچووکـترین جـەنگ ئـیرە دەشلەقینیت؟ بهیلن با ئەو پەردەیە هەلمالرێ. ئەو دەمـە دەبینـن، لـە سـووچی هـەمان ئـەم مزگـەوت و قوتابخانانـەدا، لـەناو هـەمان ئـەو کەسـە بەکریگیراوانـەدا،

لەناو هەمان ئەو داوەرانەدا کە لە ئاست ئێوەدا سەردادەنەوێنن، بە چاوی خۆتان دەبینن کە لە ناو هەمان ئەو نادان و کرێکار و لادێییانەدا کەسانێك پەیدا دەبن و بە هاوارەوە دەڕژێنە ناو کۆلان و شەقامەکان. ئەوسا لەژێر ئالای ئێوەدا نەعرەتە دەکێشن و بە ڕاستگۆییەوە بۆ ڕاتەکاندنی بارودۆخی ئەو ولاتە گیانبازی دەکەن. ئەمانە هەر لە ئێستاوە چاودێریتان دەکەن. ئەودەمە ناوبانگی باشتان دەبێتە سەرمایەیەك بۆتان کە تا ئێستا هیچ یەکێك لەو پیاوانە خاوەنی نەبووە، تەنانەت ئەو پیاوانەش کە جاران بەناوبانگ بوون و ئێستاکێ خزاونەتە کونجی ژوورەوە و هەڵتروشکاون و چاوەڕێی فرسەتن. هەرواش دەبێت، چون ئەو دەمە هیچ یەکێك لەوانە وەکو ئێوە ئازایەتییان نەنواندووە و لەگەڵ دیکتاتۆردا تێنەکەوتوون.."

"سەعاتێکی ڕێك قسەم بۆ کرد، خۆپەرستییەکەیم جوولاند. هەرکاتێك دەیویست بەدوای قسەکانمدا بێت، دەرفەتی قسەکردنیم نەدەدا. بە جۆرێکی دیکە بەڵگەم بۆ دەهێنایەوە. جاری وابوو پێدەکەنی، جاری واش بوو ئەو بیرکردنەوەیە ئازایانەی منی بەدڵ بوو. ئینجا تاوێك تێدەفکری و ڕووداوەکانی پێشبینی دەکرد. نەیدەتوانی ڕێ بۆهەڵاتنی مامۆستا خۆش بکا. بەڵام دەیتوانی لە بەندیخانە ڕزگاری بکات و بۆ دوورخراوگەی ڕەوانە بکات. ئەوەم قبووڵ کرد، چونکە ئەوە دوا پەناگە بوو. ئەوە دوا چارەبوو لە بەردەممدا بۆ ڕزگارکردنی تاقە خۆشەویستەکەم لە ژیاندا. هیچ چارێکی ترم نەبوو، یان دەبووایە قەناعەتم پێ بکردایە.. یان گەر لەوەدا سەرنەکەوتمایە؛ نەمدەزانی چیم بکردایە. ئەو لە ئەنجامدا بەڵێنی پێدام کە یەکسەر بچێت بۆ دەربار و لەوێ لەگەڵ شادا قسە بکات و هەوڵ بدات قەناعەتی پێ بکات کە ئازادکردنی مامۆستا؛ کە ئیتر ناتوانێت هیچ بکات؛ لە سوودی شادایە، پێی دەڵێت کە ماکان لەناو خەڵکانی ڕۆشنبیردا ناسراوە. پیاوانی سەردەم دەیناسن. گرتنی ئەو نارەزایی لە ناو خەڵکدا بڵاوکردۆتەوە، کوشتنی ئەو لە چاپکراوەکانی ولاتانی دەرەوەدا دەنگ دەداتەوە و چاکترە لە ڕوانگەیەکی سیاسییەوە بڕوانرێتە ئەم مەسەلەیە! ڕەخنەی دەگرت و منیش هەوڵم دەدا قەناعەتی پێ بکەم. سەیر لەوەدایە کە من خۆشم باوەڕم بەو

قسانە نەبوو کە دەمکردن و ئەو شتانەم دەوتەوە کە لە خودادادەوە فێر بووبووم. پرسیی: "باشە، بەڵام ئەگەر نەخشەکەمان هاتە دی و ئەو هەواڵەمان بە ڕۆژنامەکانی جیهان دا، ئەوسا شا زیاتر ڕق لە مامۆستا هەڵدەگرێت و گومانی تێدا نییە کە لە ناوی دەبات". سەرەتا وەڵامێکم نەبوو بیدەمەوە، چونکە ئەمە شتێك ڕاستیی تیابوو، بەڵام بەلای منەوە هەر چۆنێك بووایە ئەو ڕێیە باشتر بوو. ئێستا دەبێ ئەو لەژێر ئازاردانا ڕزگار بکەم. کێ دەزانێت سبەینێ چی دەبێت؟ وتم: "نەء، وا نییە. گەر ئێوە بڵاوی بکەنەوە کە فەرمانیان پێتان داوە لە زینداندا ئەو ژەهرخواردوو بکەن و ئێوەش شانتان نەداوەتە بەر ئەم کارە، ئەوسا ناتوانن ئەو بکوژن. چونکە ڕاستیی قسەکەی ئێوە دەسەلمێ. هەر لەبەرئەمە دەست بۆ مامۆستا درێژ ناکەن، بەڵام بریا دەتانتوانی ڕێی هەڵهاتنی لە ئێران بۆ خۆش بکەن". هەرچیم کرد نەچووە ژێر ئەم بارەوە. تەنانەت بەردانیشی بە باش نەزانی. دڵنیا بوو لەوەی کە بە تەواوەتی دەبێتە جێی گومانی شا. بە تایبەتیش دوای ئەو ڕاپۆرتەی کە کاتی خۆی دایان بە شا گوایە سەروکاری لەگەڵ بەرهەڵستکارانی ڕژێمدا هەیە لە بەرلین. تەنها قەناعەتی کرد بەوەی مامۆستا بۆ یەکێك لە شارەکانی خوراسان دووربخەنەوە و بۆ ئەو مەبەستەش یەکسەر لای منەوە بەرەو دەربار ڕۆیشت.

"قەرار وابوو لەماڵەوە چاوەڕێی بکەم و هەر کاتێك بۆ دائیرەی ئاسایش گەڕایەوە لەوێوە تەلەفۆنم بۆ بکات و منیش بچم بۆ نووسینگەکەی و لە ئەنجامەکە ئاگادارم بکاتەوە".

"کاتی خواحافیزی دەستمی ماچ کرد، دەیویست لێوەکانم ماچ بکات. بەڵام من ڕووم وەرگێڕا و ئەو توانیی بە تەنها ڕوومەتی ڕاستم ماچ بکات. ئیدی ئەنجام ئەوە بوو کە ئەویان لەگەڵ ئەفسەرێك و دوو کاربەدەستی دائیرەی کاروباری سیاسیدا بۆ کەلات دوورخستەوە. ئیتر نەمزانی چیی بەسەرهات".

ئافرەتـە نەناسـەکە بێدەنـگ بـوو. ئانیشـکی چـەپی خسـتە سـەر مێزەکـە و ناوچەوانیشـی خسـتبووە سـەر دەسـتی. چاوەکـانی نووقـاندبوو و سـەری ڕادەوەشـاند. وا پێدەچـوو دیمـەنی دوا چاوپێکەوتنەکـەی مامۆسـتای هێنابێتـە پێشچاوی خۆی. زۆر حەزم دەکرد بزانم کە بۆچی پرکێشیی نەکردووە بۆ دواجار قسە لەگەڵ مامۆستادا بکات. ئەم ئافرەتە ببووە جێی ڕێز و بەزەییم. سەیر ئەوەیە هیچ گوێی بەو قوربانیدانەی خۆی نەدەدا. دەتوت شەرم لەو قوربانییە گەورەیـەی خۆی دەکات کە لە پێناوی مامۆستادا داویـەتی. تەماشای چاوەکانی تابلۆکـەم کرد. هیچ نهێنییەك لە چاوەکانی ئەو ئافرەتـەدا نـەبوو کە بەرامبـەرم دانیشـتبوو. مامۆستا ئەوی نەناسیبوو.

بۆ ئەوەی بیهێنمەوە قسە وتم: "نەخشەکەتان سەری گرت، چونکە بیرم دێ کە لـە ساڵانی دوای دیکتاتۆریدا، یـەکێك لـە سـەرۆکەکانی ئاسـایش، ناوەکـەیم لـە یـاد نییە، بێگومان هەر ئەم سەرتیپ ئارامە بووە، لـە ئێران هـەڵات و ئیتر نەگەڕایـەوە. ئەو دەمە لەنێو خەڵکیدا چیرۆکی سـەیریان دەربارەی ئەو دەگێڕایـەوە و تەنانـەت بیستم کە چاپکراوەکانی ئەوروپاش زۆر شتیان لە زمانی ئەوەوە بڵاوکردەوە".

وەڵامی نەدایەوە. گوێی لە قسەکانی من بوو، بەڵام هیچ کاریگەرییەکی قسەکانم لە دەموچاویدا نەدەبینی. ناچار بووم پرسیاری لێ بکەم: "بەڵێ، دیارە کە بوویتە هاوسەری سەرتیپ ئارام و کاتێکیش هەواڵی مەرگی مامۆستاتان بیست، بە پێی ئەو بەڵێنەی کە دابووتان؛ پاشگەز بوونەوە و بۆ ئێران گەڕانەوە. ئیجازە بفەرموون یەك پرسیاری دیکەتان لێ بکەم. ئێستا وتتان کە جارێکی تریش ئەوتان بینییەوە؛ بەڵام پڕکێشیتان نەکرد قسەی لەگەڵدا بکەن، حەزم دەکرد ئەمەشتان بۆ ڕوون بکردمایەتەوە".

ئافرەتە نەناسەکە ئەشکی دەڕشت. "ئاغای چاودێر، ئەمە گەورەترین نهێنیی ژیانی من بوو. کەس بەمەی نەدەزانی. دەربارەی کارەکانی ترم کەسانێك هەبوون کەم تا زۆر ئاگاداربوون. تەنانەت سەبارەت بە پەیوەندیی سیاسیی من لەگەڵ ئەودا، هەر وەکو زانیتان، پۆلیسیش زانیی. بەڵام جگە لە ئارام کەسی تر نەیدەزانی کە من ئەوم لە بەندیخانە ڕزگار کردووە، لە کاتێکدا ئەگەر...

" گریان بواری نەدەدا، ئەشك لە چاوانی دەباری و بە دەم قوڵپی گریانەوە دەدوا.

"لە کاتێکدا ئەگەر کەمێك ئازاتر بوومایە، تۆزێك زیاتر قوربانیم بدایە، ئاخ، گەرئەو کەمێك زیاتر بواری منی دەدا و ئەو ڕۆژانەی کە پێویستی بە من هەبوو لە خۆی نزیك دەکردمەوە و هانی دەدام، ئەوم لە دەست نەدەچوو، دەستم لەو هەڵنەدەگرت، لەگەڵیدا بۆ تاراوگە دەچووم، بە پارە، بە بەرتیل، بەو دەسەڵاتەی کە هەمبوو، بە حوکمی ئەو پەیوەندییانەی کە خانەوادەکەمان لەگەڵ خاوەن دەسەڵاتانی ئەوسادا هەیانبوو، لەوانە بوو پاش ساڵێك و دووان ئەوم لە دورخراوگە بگەڕانایەتەوە و هەموو پێداویستییەکانی کار و ژیانم بۆ دەهێنایە دی و ژیانێکی خۆشم بۆ دابین دەکرد.

"ئێستا دەزانن کە بۆچی نەمدەویست خۆمتان پێ بناسێنم. نەمدەویست تەنانەت خۆم بە ئێوەش بناسێنم کە تازە لە تاریکترین گۆشەکانی ڕۆحم ئاگاداربوون و، نەمدەویست بزانن کە من هاوسەری جارانی سەرۆکی پێشووی

ئاسایش بووم، هەمان ئەو سەرۆکی ئاسایشەی کە مامۆستا ماکانی نیگارکێشی گرت و بۆ دوورخراوگەی نارد. من هاوڕێکەی خۆم بە تەنیا جێهێشت، خۆشەویستەکەی خۆم، ئەو کەسەی تاقە مرۆڤێك بوو کە دەمتوانی لەگەڵیدا بژیم، لە سەختترین ساتەکانی ژیانیدا بە تەنیا جێمهێشت و، شووم کرد بە دوژمنەکەی، بە خوێنخۆرترین دوژمنی ئاوات و خەونەکانی. بەڵی ئەو خۆشی ئەمەی دەزانی، چونکە دوای دوو هەفتە، میهربانوو؛ دەزگیرانەکەی خوداداد، کە بوو بە پزیشکی منداڵان، گەڕایەوە بۆ ئێران، تا لە مەسەلەی گرتنی مامۆستا و ئەنجامەکانی بکۆڵێتەوە و زەمینە بۆ گەڕانەوەی خوداداد بۆ ئێران خۆش بکات. لە هەمان ئەو دوو سێ هەفتەیەدا کە من لەگەڵ سەرتیپدا تێکەوتبووم بۆ مەسەلەکەی مامۆستا، میهربانوو ڕۆژێکیان هات بۆ دیدەنیم. بەڵام من دەرفەتم بەو نەدا دەربارەی ئەو شتانە بدوێت کە دەمزانین. بە هەمان زەردەخەنە درۆکانی جاران و ڕووخۆشییەکی ساختەوە پێم وت کە مارەکراوم و چەند ڕۆژێکی تر نابات بۆ پاریس دەگەڕێمەوە. بێگومان دیارە کە مامۆستاش ئەوەی بیستووەتەوە و هەر بۆیەش ئەم تابلۆیەی ئاوا کێشاوە. بەڵام کێ گوناهبارە؟ من یان ئەو کە منی بەم ڕۆژە ڕەشە گەیاند.."

"وەختێ بۆ ژوورەکەی سەرۆکی ئاسایش ڕۆیشتم؛ گەلێ خۆشحاڵ بوو. هەر کە چوومە ژوورەوە؛ یاریدەرەکەی خۆی بانگ کرد و وتی: "نامەوێ کەس بۆ ئێرە بێت، بنێرن بۆ بەندیخانەش؛ ماکانی نیگارکێش بهێنن بۆ ئێرە. با لێرە بێت تا خۆم بانگی دەکەم". کاتێك یاریدەدەرەکەی ڕۆیشت، لە پشتی مێزەکەیەوە هەڵسا و هاتە لامەوە. دەستمی گرت و وتی: "داواکەتم جێبەجێ کرد. هەر ئەمڕۆ دەینێرم بۆ کەلات". پرسیم: "کارێکی گران بوو؟" وتی: "کاری گرانی ئێمە لەمڕۆ بەدواوە دەست پێدەکات. تا دوو مانگی تر کە ئامادەی سەفەر دەبم. ئێوە چی دەکەن؟" وتم: "بلیت بۆ من بڕن. من هەر لەم ڕۆژانەدا دەچم بۆ پاریس". وتی: "ئەی مارە بڕینەکە لە کوێ بێت؟" وتم: "هەر لێرە.. بەڵام پێویست ناکات کەسیش بزانێت. با دایکیشم ئامادە بێت". وتی: "زۆر چاکە". پرسیم: "ئێستا

ماموٚستا دێت بوٚ ئێرە؟" وتی: "حەز دەکەن ببینن؟" وتم: "نەء.. کارم پێی نییە" وتی: "گەر حەز دەکەن؛ دەتوانن بە تەنیا قسەی لەگەڵ بکەن. ڕایاندەسپێرم ژووری چاوەڕوانییەکەتان بوٚ چوٚڵ بکەن. بوٚ خوٚتان لەوێ دابنیشن و خەریکی نەخشەدانان بن". خوٚم هێمن پیشان دا. پێکەنینە دروٚکەم وچاوە درەوشاوەکانم ئەویان فریودابوو و هەر بە ڕاستی لەو بڕوایەدا بوو کە من حەز بە بینینی ناکەم. بەرز پێکەنیم و وتم: "نا.. سەرتیپ، من ئیتر هاوسەری ئێوەم و پێم خوٚش نییە بە تەنیا لەگەڵ پیاوێکی نامەحرەمدا قسە بکەم". وتی: "بەڵکو پێویست بکات چەند قسەیەکی لەگەڵدا بکەن و پێی بڵێن کە ئێوە ڕزگارتان کردووە". وتم: "هەرگیز، ئەگەر بزانێت من بە یاریدەی ئێوە دەستم لە ئازادکردنی ئەودا هەیە؛ سەرلەنوێ خوٚی فڕێدەداتەوە بەندیخانە" پرسیی: "دەتانەوێ من ئەوەی پێ بڵێم؟" وتم: "هەرگیز کاری وا نەکەن! تکاتان لێ دەکەم ئازاری مەدەن. دڵی بدەنەوە. پێی بڵێن لەبەرئەوەی کە هونەرمەندێکی گەورەیە بەر لێبوردنی شا کەوتووە، بەڵام جێی داخە کە لە تاراندا بمێنێتەوە و خوٚی بەو کارانەوە خەریك بکات کە شایانی ئەو نین و، هەر لەبەر ئەوەش ماوەیەك لە تاران دووردەخرێتەوە و هەر ئەوەندە بارودوٚخ هێمن بووەوە دەتوانێت بگەڕێتەوە بوٚ تاران. خزمەتکارەکەشی لەگەڵدا دەنێرن؟"

–نەخێر خزمەتکارەکەشی هەر لە بەندیخانەیە.

–ئەی ئەو بەرنادەن؟

–هەردووکیان بەردەدەم، بەڵام خزمەتکارەکەی لەگەڵدا نانێرم.

"یاریدەدەرەکەی هاتە ژوورەوەو وتی: "قوربان زیندانییەکە ئامادەیە".

–ژووری چاوەڕوانییەکە چوٚڵ بکەن، دەمەوێ لەوێ قسەی لەگەڵدا بکەم.

"سەرتیپ لە ژوورەکە چووە دەرێ. گوێم لە دەنگی بوو. ئایا دەمتوانی بڕوٚم و پێی بڵێم کە بوٚ ڕزگارکردنی ئەو ئاسانترین کار لە بەردەممدا هەر ئەوە بوو خوٚم فڕێ بدەمە باوەشی کابرایەکی خوٚپەرستەوە کە جگە لە لەش و پێداویستییەکانی

لەشی هیچ شتیکی تر لە ژیانیدا نەبوو؟ من ئەو پرکیشییەم تیدا نەبوو و نەمدەویست پیی بلیم کە چۆن ئەو بریارەم دا.

"چارەکە سەعاتیك سەرۆکی ئاسایش لە ژوورەکەی تەنیشتدا لەگەل ئەودا قسەی کرد. دەتوت منیان گرتووە و دەیانەوێ من لەبری ئەو بخەنە بەندیخانەوە. بە جۆریك دلم لیی دەدا؛ کە شەرمم لە جوولەی سنگم دەکرد. دەمتوانی گویم لە قسەکانیان بیت؛ بەلام نەمدەویست. سەرۆکی ئاسایش بە نەرمی و بە ریزەوە دەدوا. مامۆستا تەنها گویی دەگرت و زۆر بە کورتی وەلامی دەدایەوە. جاریك خۆم پی نەگیرا و هەلسام تا لە درزی دەرگاکەوە بیبینم. زەنگی تەلەفۆنەکەی سەرۆکی ئاسایش رایچلەکاندم. خیرا گەرامەوەو لە شوینەکەی خۆم دانیشتمەوە.

"سەرتیپ بە سیمایەکی هیمن و بە دەم زەردەخەنەوە هاتەوە بۆ ژوورەکەی. تەلەفۆنەکەی هەلگرت و وەلامیکی کورتی دایەوە. ئینجا هاتە لامەوە. دەستی گرتم و بردمییە لای پەنجەرەکەوە و وتی: "وەرن تەماشا کەن!".

"بە گەردنیکی بەرزەوە، لە جلیکی شیك و ئوتووکراودا و، لەگەل ئەفسەریك و دوو کاربەدەستی دائیرەی کاروباری سیاسیدا بە پیپلیکانەی دائیرەی ئاسایشدا دەچوونە خوارێ. پاسەوانەکان سلاویان لی دەکرد و رییان بۆ دەکردەوە. مامۆستاش بە هێمنی بەسەری وەلامی دەدانەوە. کاتێك بە پلەکاندا چووە خوارەوە، هەلوەستەیەکی کرد. تەماشایەکی ئاسمانی کرد و، لەوە دەچوو هەناسەیەکی قوول هەلکێشێت.

"ئەمە دواجار بوو بیبینم و هەمان دیمەن لە یادمدا تۆمار بووە.

"ئاغای چاودێر، تکاتان لێ دەکەم ئیتر با بەس بێت. ئیتر پرسیار مەکەن. من هیچی ترم نییە پێتانی بلێم. گەرچی من هێشتا هیچم بۆ باس نەکردوون. ئەوەی دەروونم دەکرۆژێت و دەیخوات؛ هێشتا نەوتراوە. من ئەگەر دەمتوانی ئەوە دەربیرم کە گری لە ناخم بەرداوە؛ ئەو دەمە دەبوومە شاعیرێك، نووسەرێك، نیگارکێشێك و هونەرمەندێك. بەلام من هیچیان نیم. ئێوە داوای بەسەرهاتی ژیانی مامۆستاتان لێ کردم، وا منیش بۆم گێرانەوە. نموونەی ئافرەتی وەکو

منیش زۆرن کە ژیانیان بووەتە قوربانیی هەوا و هەوەسی پیاوانی ئەم زەلکاوە.
زۆر سوپاستان دەکەم کە ئەوەندە تاقەتتان هەبوو گوێ لە سەرگوزەشتەیەکی شووم بگرن کە پەیوەندیی بە کاری ئێوە و پەیوەندیی ئێوە بە ژیانی مامۆستاوە نەبوو.

تابلۆکەشتان بەرنەوە! ئیدی من هیچ پەیوەندییەکم بەم تابلۆیەوە نەماوە. مامۆستاکەی ئێوە بەهەڵەدا چووە..

ئەم چاوانە هی من نین!

ئازەری 1330 ئوردیبە هەشتی 1331

## پەراویزەکان:

–کارە هونەرییەکان.

–ریباز.

–خۆ بەکەمزان.

–قوتابخانەی هونەرە جوانەکان، لیرە بە دواوە کورتکراوەکەی دەنووسین، واتە "E.D.B.A"

–بە ئیتالیایی واتە: من تۆم خۆش دەوێ.

–ترسناك.

–روحییەت، هەست و نەست.

تیبینی: ئەم رۆمانە سالی 1990 کراوە بە کوردی.

دەقی دەستنووسی نامەکەی بوزورگی عەلەوی بۆ وەرگیری کوردی

